٦٢
سالّی دوانزەهەم
بەهاری
٢٠١٠

# سەردەم

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کلتوری بیانی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکات

خاوەنی ئیمتیاز:
شێرکۆ بێکەس

سەرنووسەر:
ڕەووف بێگەرد

دەستەی نوسین
ڕێبین هەردی
شوان ئەحمەد

دەرهێنان و کاری کۆمپیوتەری
تاڤگە فائق

هەڵەچنی چاپ:
ساکار ڕەووف

بەرگ :
نەرمین مستەفا

-سەردەم گۆڤارێکی وەرزییە، تایبەتە بە نوسین و وەرگێرانی کولتوری بیانی لەبواری فەلسەفە و ڕەخنە و زانستە مرۆییەکان و داهێنانی ئەدەبی و ئیستاتیکیدا.

-داوا لەو بەڕێزانە دەکەین کە بابەت بۆ سەردەم ئامادەدەکەن، هاوپێچ ناوی تەواوی نووسەر، وەرگێر، سەرچاوەو زانیارییەکانی تایبەت بەچاپ و بلاوکردنەوە، لەگەڵ کۆپییەك لەدەقی ئەسڵیی بابەتی وەرگێردراو بنێرن.

-ئەو بەڕێزانەی بە نوسین و ئامادەکردن بەشداری دەکەن پێویستە هەموو مەرجە ئەکادیمیەکان، لە بابەتی میتۆد و سەرچاوەو ئەمانەتی نوسینەوە، پێرەوبکەن.

-باشتروایە بابەتەکان بە کۆمپیوتەر تایپ کرابن، هاوپێچ لەگەڵ سی-دی و دەقی چاپکراوی بابەتەکەو ئەدرێس و ناونیشانی ئەلیکترۆنی نوسەر یان وەرگێردا.

-ئەو بەڕێزانەی لە ئینتەرنێتەوە بابەت وەردەگێرن پێویستە هاوپێچ ناونیشانی تەواوی سایت و لینك و ڕۆژی بلاوکردنەوەی سەرچاوە ئەلیکترۆنیەکە بنێرن.

-بەرهەمەکان گەر بلاوبکرێنەوە، یان نا، نادرێنەوە بە خاوەنەکانیان.

-پەیوەندییەکان لە ڕێگای سەرنووسەرەوە ئەنجام دەدرێن.

# ناوەڕۆکی:
## سەردەم - ژمارە ٦٢

### فیکر و فەلسەفە


- «گەورە» چەند گەورەیە؟ — لە ئەڵمانییەوە: بەکر عەلی — ٤
- ئایاری ٦٨، لاوانی ئەڵەمانیا لە باوکانیان یاخی دەبن — پیتەر ساندمێر — لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد — ١٨
- پێکهاتەخوازی چییە؟ — رابێرت ئیسکۆڵز — لە فارسییەوە: یونس رەزایی — ٢٢
- ئایین و نوێگەری — مستەفا مەلەکیان — لە عەرەبییەوە: یاسین عومەر — ٣٣
- نەبوونی ئاگۆراو مۆدێرنیتەی ناتەواو — عبداللە کەیخۆسرەوی — لە فارسییەوە: کاوە گوڵکار — ٤٧
- رۆشنبیرانی ڕوس و پەیوەندییان بە ڕۆژئاواوە — هاشم ساڵح — لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع — ٤٩
- شۆڕشی خوێندکارانی ٦٨ — ئەنوەر بەدر — لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد — ٥٥


### ئەدەب


- ئەو شاعیرەی بە خراپەی خۆیدا هەڵدەگوت — لە فارسییەوە: لەیلا ساڵحی — ٦٢
- بەلاش ئەژین بەلاش! — لە فارسییەوە: سەروەر عومەر — ٧١


### گفتوگۆ


- من ئەوەم کە هەم — سازدانی: نینار ئەسبەر — لە سویدییەوە: هیوا قادر — ٨١
- گفتوگۆیەك لەگەڵ «محەمەد شوکری» — سازدانی: یاسین عەدنان — لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد — ١٠٢


### فایلی ژمارە:

### فرانز کافکا


- پانۆرامای ژیانی فرانز کافکا — لە عەرەبییەوە: لاس — ١١٢
- کافکا و پۆست مۆدێرنە — جۆن لیشتە — لە عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد — ١١٦
- کافکا لە بەستێندا — محمد قاسم زادە — لە فارسییەوە: کاوە گوڵکار — ١٢١
- میلان کۆندێرا لە بارەی کافکاوە دەنووسێت — لە عەرەبییەوە: رەووف بێگەرد — ١٢٦
- ك. وەکو کافکا — لە فارسییەوە: ئیسماعیل ئیسماعیل زادە — ١٣٨
- بلۆم فیلدی ڕەبەن — فرانز کافکا — لە فارسییەوە: رەووف بێگەرد و مەنسوور تەیفوری — ١٤٣
- کافکا.. ئەو یەهودییەی دونیا بە ڕەش ڕەنگ ئەکا!! — وسام الدویك — لە عەرەبییەوە: سەروەر عومەر — ١٦٢
- نامە بۆ میلنا — فرانز کافکا — لە فارسییەوە: رەووف بێگەرد — ١٦٧
- کافکا و هاوڕێکانی — ڕەبیع جابر — لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد — ١٧٥

## وێستگەکانی سەردەم


* هەنوکە لە سەفەردام ١٨٢
* عەسەبییەت و تیۆری دەوڵەت لە بیری ئیبن خەلدوندا ١٨٤
* فەیلەسوفەکانی مۆدێرنە لە دیکارتەوە تا هایدگەر ١٨٦
* سادقی هیدایەت ١٨٨
* رامبرانت... ئەو هونەرمەندەی شەیدای روخساری خۆی بووە ١٩٠
* ئایا ئەگەری روودانی ٦٨ ێکی تر هەیە؟ ١٩٥
* خوێنەران خوێنەخۆرەی منن ١٩٧

بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ١٩٨


---


**ناونیشان:**

سلێمانی - شەقامی سالم
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
تەلەفۆن: سەرنووسەر ٠٧٤٨٠١٣٦٦٥٩

دەزگای سەردەم ٣١٢٩٦٠٩

**نرخی (١٢٥٠) دینار**

**بۆ پەیوەندیکردن لە دەرەوەی وڵاتەوە**

Tel _ Fax: 00447543129839

ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لە رێی سندوقی پۆستی
ژمارە (615/ 14665 و 616/ 14665) تاران

**لە رێگەی (ئیمەیل)ەوە:**
govarysardam@yahoo.com

www.serdam.org

# "گەورە" چەند گەورەیە؟

## وتاری پیتەر سلۆتەردایك لە لووتكەی كۆپنهاگن لەسەر كێشەی كەش

لە ئەڵمانییەوە: بەكر عەلی

لێكۆڵیارانی كەش دوای ٥٠٠ ساڵ توێژینەوە چاكسازییەكی نوێیان داهێنا، بەڵام هێشتا كەس ئەوەی دیاری نەكردووە ئاخۆ جەستەی زەوی توانای چی هەیە.

### 1-مرۆڤ وەک خۆفێرکەرێکی گەورە:

«ئێمە چەندێک مەزن دەتوانین بیربکەینەوە؟» بوكمینستەر فیولەر[1].

هەڵبەت میتافەرەكانیش چارەنووسی خۆیان هەیە. كاتێك بوكمینستەر فولەر Buckminster Fuller لە ١٩٦٩ دا ڕێنماییە ناودارەكەی بۆ ئیش پێكردنی زەوی وەك كەشتییەكی بۆشایی بڵاوكردەوە، ئەو بۆچوونە بوێرانە و بگرە یۆتۆپییانەی ڕاگەیاند، كەوا لەناو سیستەمە كۆمەڵایەتییەكاندا كاتی ئەوە هاتووە شارەزایی بەڕێوەبردن لە سیاسیەتكاران و لە داراییكاران بسەندرێتەوەو ڕادەستی دیزاینسازەكان، ئەندازیارەكان و هونەرمەندەكان بكرێت. بۆچوونەكە دەگەڕێتەوە سەر ئەو دەستنیشانكردنەی كە پێی وایە لایەندارانی دەستەی یەكەم، (واتە سیاسەتكاران. وەرگێڕ) وەك هەموو شارەزا تایبەتكارەكانی تر، تەنیا و تەنیا لەڕێی كونێكی بچكۆلانەوە تەماشای ڕاستییەكان دەكەن، كونێك كە جگە لە بینینی بڕگەیەكی دیمەنەكە شتێكی زیاتریان پێ نادات. لەكاتێكدا دەستەی دووەم (دیزاینسازەكان، ئەندازیارەكان و هونەرمەندەكان) بەهۆی دیدی هۆلیستییانەوە و سەروكاریان لەگەڵ گشتێتیدا، پانۆرامای ڕاستییەكانیان لە وێنەیەكی گشتیدا داهێناوە. ئەمەش ئەوە بوو كاتێك دروشمە ڕۆمانتیكییەكەی: فانتازی لە دەسەڵاتدا „ئەتڵەنتیكی تێپەڕاند و لە

ڕۆخی کەنارەکاندا وەکو بانگەوازێک کرایە «دیزاین لە دەسەڵاتدا». بوێری بڵاوکراوەکەی بوکمینستەر فیولەر، کە دواتر کرایە بیبل(کتێبی پیرۆز)ی (دژەکولتور) لەوەدا دەرنەکەوت کە سووکایەتی بە گەورە و زل و مەزنە دیارەکانی دنیای دەکرد، کە ئەو پێیوابوو „ ئەوانە ئەمڕۆ تەنیا دەرکەوتەی زەبەلاحن و هیچیتر”. بەڵکو لەو پێناسکردنە نوێ زەبەلاح و دروستەدا بوو کە بۆ هەسارەی زەوی کردوومانە: هەر لەم چرکە ڕەخنەییەشەوەیە کە نەدەشیا ئەم سەرزەمینە باشە دێرینە درێژتر لە قەبارەیەکی سروشت پیشان بدرێت، بەڵکو بە شتێکی دەستکردی Artifizium قەبەی ناسروشتی بخرێتە ڕوو. واتە چیتر زەوی بناغە نەبوو، بەڵکو بونیادنەرێکە، وە چیتر بنەمایەکی جێگیر نییە، بەڵکو تەنێکی بزێوە.

ئەو میتافەرەی بوکمینستەر فیولەر کە لەبارەی زەبەلاحی و قەبەییەوە دەدوێت لەماوەی کەمتر لە نیو سەدەدا خۆی خزاندە ناو هۆشیاری هەمووانەوە. لە هەمانکاتیشدا ئەو هەڕەشە توندەی دۆخەکە دیاری دەکات کە لەسەر ڕووی کەشتی بۆشایی زەوی دەکرێت، هەڕەشەیەک کە وایکرد، ئەمە لەدوای ئەو پێشەکییە کەم قەناعەت پێهێنەرانەی لە ((کیۆتۆ)) و دەیان لووتکەی تری کەشوهەوادا هاتنە ئاراوە، لەم ڕۆژانەشدا بۆ یەکەمین جار کۆبوونەوەیەکی تەواوی کاریگەرانەی سیاسەتکاران و نوێنەرەکانی دانوستاندن ساز بدرێت، لەپێناوی ئەوەی تاڕادەیەک بەهەندەوە لەسەر کاری ڕێکخستنی کەشوهەوا لەسەر ڕووی زەوی وەک کەشتییەکی ناو بۆشایی ڕاوێژ بکەن. لەم کەین و بەینەشدا ئەوە تێدەگەین کەوا قسەکردن لەبارەی زەوی وەک کەشتییەکی بۆشایی مانای ئەوە نییە لادانە بۆ ناو بێ قەید و مەرجێکی شیعری کە کەماسی چەمکێکی ورد بگەیەنێت. چونکە ئەم میتافەرە لێرەدا بەرجەستەی باڵاترین فۆرمی چەمکەکە دەکات. هەقیقەتەکەشی لەناو خۆگونجاندنی پەنهانییەکەیدا بۆناو دۆخە ڕاستەقینەکە خۆی ئاشکرا دەکات. بەڵام ئەگەر زەوی کەشتییەکی ناوبۆشایی بێت، ئەوا دەبێت سەرنشینەکانی بەڕاستی بەر لەهەر شتێک پەرۆشی بۆ پاراستنی پەیوەندگیرییە زیندووەکانی نێو ناوەوەی ئەم تەنە بزۆکە پیشان بدەن. لەم ڕووەوە تەکنەلۆژیسازەکانی کەشتی بۆشایی باس لە سیستەمی پشتیوانیکردنی ژیان Life Support System دەکەن، کەوا لەسەر ڕووی وێستگەی بۆشاییەکەدا دەبێت کایەی ژیان Biosphaer ی نەگۆڕە لاساییکراوەکان کۆنترۆڵ بکرێت.

لەبەرئەمەیە کاری ڕێکخستنی ئەتمۆسفێر لە ئێستا بەدواوە دەبێتە یەکەمین پێوەری هونەری بەڕێوەبردنی ئەرکە داواکراوەکە لەپێناوی کەشتییە تەواوەکەی بۆشاییدا کە زەوییە. لێرەدا ئەمە مایەی ڕامانکردنە: ئەگەر لەناو ئەم گالیسکەیەدا (واتە زەوی/ وەرگێڕ) ماسکەکانی ئۆکسجین ئۆتۆماتیکییانە لە ڕووپۆشی کابینەکان هەڵنەماڵرێت، ئەوا دەبێت „حاڵەتێکی چاوەڕواننەکراو” ی کەمبوونەوەی هەوا بێتە ئاراوە. دیارە بێهوودەشە بگووترێت کەوا هێڵە ڕۆشنەکانی سەرزەوی لەباری ناکاودا بەرەو دەروازەی چوونە دەرەوە ڕێ دەکەن. چونکە لەڕاستیدا کەشتی بۆشایی زەوی، نە بۆ باری ناکاو و نە بۆ باری ئاساییش چ دەروازەیەکی چوونە دەرەوە شک نابات. ئەوەشی هێڵە ڕۆشنەکانی سەرزەوی سەروکاری لەگەڵدا هەیە، ئەوە شتێکی جیاوازە لەو خەواندنە موگناتیسییە هێمنەی لەناو فڕۆکەدا بۆ گەشتیارێک دەکرێت کە ترسی لە فڕین هەیە؟ لەڕاستیدا دەبێت ترسی

میوانەکانی سەر ڕووی کەشتی بۆشایی زەوی بە هۆکاری بەرچاوتر و کۆنکرێتیتر هێور بکرێتەوە. هەڵبەت لێرەدا چارەسەری داواکراو بریتییە لە ڕێکارە تەکنیکییەکان و زانینە وەرچەرخێنەرەکان.

بوکمینستەر فیولەر تا ئێستا گرنگترین هەلومەرجی بۆ نیشتەجێبوونی مرۆڤ لەسەر ڕووی کەشتی بۆشایی زەوی زۆر بەوردی دیاریکردووە، ئەویش ئەوەیە گەشتیارەکان ڕێنمایی بەکارهێنانەکانیان پێ نەگەیەنراوە، ڕەنگە لەبەرئەوە بێت چونکە ئەوان دەبوو خۆیان بە نهێنی بارودۆخی خۆیان زانی بێت. لەڕاستیشدا هێندەی ئێمە زانیاریمان لایە ئەوەیە نزیکەی دوو ملیۆن ساڵێک دەبێت کە مرۆڤ نیشتەجێی سەر زەوییە. بەڵام (بۆ تەنیا جارێکیش بەوەیان نەزانیوە کەوا ئەوان لەسەر ڕووی کەشتییەکن)[٢]. یا بە دەربڕینێکی تر بڵێین: بە ڕاشکاوی جەغد لەوە دەکەینەوە کەوا مرۆڤ لە ڕابوردوودا بە ڕادەیەکی زۆر لە خۆئاراستەکردندا بێئاگا بووە، ئەمەش لەبەرئەوەی سیستەمەکە لەسەر بەخشندەیی ئاستێکی بەرزی نەزانین و بێئاگایی مرۆڤ دامەزرا بوو. بەڵام بەو ڕادەیەی کە چۆن گەشتیارەکان دەست دەکەن بە درکاندنی نهێنی بارودۆخەکە و بە ئامرازی تەکنیکی دەسەڵات دەست دەگرن بەسەر دەوروبەر و ژینگەدا، بە هەمان ڕادە بەخشندەیی نەزانین لەڕێی سیستەمەکەوە بەرەو کەمبوونەوە ڕۆدەچێت، تا دەگاتە پنتێک کە تیایدا فۆرمە دیاریکراوەکانی نەزانین لەگەڵ نیشتەجێبوونی گەشتیارەکان لەسەر ڕووەی کەشتییەکەدا چیتر لە ئەستۆ ناگیرێت.

لەناو — جیهاندا- بوون In-der-Welt-Sein ی مرۆڤ کە فەلسەفەی سەدەی ٢٠ لەبارەیەوە دوواوە خۆی وەک لەسەر — ڕوونشین — بوون An- Bord-Sein. ی گالیسکەیەکی گەردوونی ئاشکرا دەکات کە ئەو گالیسکەیە شیاوی ئەوەیە دووچاری پەککەوتن بێتەوە. لە تێڕوانینی هەنووکەشەوە ئەوە دەبینرێت کەوا مێژووی بیرکردنەوە لەسەر ئەم هەسارەیە خۆی وەک ئەزموونێکی زانینخوازی ئامانجدار سەلماندووە، کە لە ڕەوتی خۆیدا دەبوو هەقیقەتی بارودۆخی جیهان بهێنێتە بەر ڕووناکی و بهێنێتە ئاراوە.

ئەوەی لەسەر ڕوونشینی کەشتی بۆشایی زەوی بوێرێت خزمەتی تێگەیشتنە تایبەتەکەی خۆی بکات، ئەوە زوو یان درەنگ لێپرسینەوەی خۆی لەسەر ئەو ڕاستییە هەڵدەچنێت کەوا ئێمەی مرۆڤ خۆفێرکەر و خۆپەروەردەکەر Autodidakten ی ئەم گەشتی بۆشاییەین. لێرەوەیە چەمکی دروست بۆ پێناسکردنی هەبوونی مرۆیی conditio humana بریتییە لە: خۆفێرکەری ژیان و مردن. خۆفێرکەر ئەوکەسەیە کە دەبێت بەبێ هیچ فێرکەرێک وانەی سەلمێنراو فێر بێت. جگە لەمەش من پێمواییە، لەبەرئەمەیە گەڕانەوە بۆ میراتی ئاینی لەم مەسەلانەدا هیچ کۆمەکێکمان ناکات، چونکە بەبێ هیچ هەڵاواردکردنێک هەموو ئاینە جیهانییەکان دیلی تێگەیشتنێکی سەرووگەردوونین، (کە پێیان وایە فریادرەس لەسەروو زەمینەوە دێتە سەر زەوی و مرۆڤایەتی ڕزگار دەکات/وەرگێڕ)، تەنانەت خودی یەسوع نەیتوانی لەڕێی هەڵکشانەکەیەوە بۆ ئاسمان بەشدارییەکی ئەوتۆی نووسینەوەی ڕێنماییەکانی بەکاربردنی کەشتی بۆشایی زەوی بکات کە شیاوی باسکردن بێت.

ئەم تێڕامانانە گرێمان دەدەنەوە بە مەسەلەی پەیوەندی نێوان بوون و زانینەوە، ئەویش ئەوەیە: زانست لە جەوهەردا دوواکەوتووە بەسەر واقیعدا، واتە دەشێت بڵێین زانست لە بنەڕەتدا درەنگ

دەگات. لەڕووی ئەمەشدا ئەم پرسیارە خۆی قووت دەكاتەوە، ئایا دەبێت بەهۆی دواكەوتنی زانستەوە ئەوەش بێت بەدووایدا كەوا سەبارەت بە گرفتە ئایندەییەكانی خۆشمان بەشێوەیەكی پێویست ئەو هەر درەنگ هات بێت؟ خۆشبەختانە ئێمە لە دۆخێكداین كە بتوانین نەرێی ئەم پرسیارە بكەینەوە. چونكە ژیرییەكی پێشبینیزان prognostische Intelligenz هەیە كە خۆی بەتەواوەتی لەنێو كەلێنی نێوان (( درەنگ)) و ((زۆردرەنگ)) دا كارا دەكات. ئەم ژیرییەش ئەوەیە كە پێویستە هەر لێرەدا و هەر لە ئەمڕۆدا بهێنرێتە گۆ. لەكاتێكدا ئەم یاسایە بۆ بەشێكی گەورەی فێربوونی مرۆڤایەتی لەكاردا بووە كەوا مرۆ تەنیا ((لەڕێی زیانەكانیەوە زیرەک دەبێت)) ((وەک پەندە كوردییەكە: هەر عەقلەی لە خەسارێک. وەرگێڕ))، ئەوا عەقلی پێشهاتزان و نوقلانەلێدەر دەبێت بیەوێت زیرەک بێت، بەرلەوەی كە زیانەكان دەربكەون. واتە ببێتە نوێگەرێک لەناو مێژووی فێربووندا. بۆئەوەشی بچینە ناو لۆگیكی پرۆسێسی فیربوونی لەو جۆرەوە، ئەوا هەبوونی ڕەخنەیەک لە عەقلی داهاتووبینی prophetische Vernunft پێویستە. ئەمەش نابێت لەو پارادۆكسە بنەماییەی داهاتووبینە بێسوود و بێچارەیە بتۆقێت: كەوا ئەو، ئەگەر سەركەوتوو بوو، دوواتر ex post وەكو ئاژێرێكی زیادە دەبینرێت، چونكە هەروەها بەهۆی ئەوەی ((لە نێواندا دەردەكەوێت))، ((ئاماژەیە لەسەر ئەوەی لەسەرەوەدا بە عەقلی نێوان درەنگ و زۆردرەنگ باسكرا.وەرگێڕ))، ئەوا ئەوەی كە ئەو نوقلانە و ئاگاداری لەبارەوەدابوو شیاوی ڕوودانی نییە. ڕواڵەتەكانی ڕەخنەیەكی لەو جۆرەش ژان پییەر دوپیَ Jean Pierre Dupuy لە لێكۆڵینەوەیەكدا بەناوی Pour un catastrophismuse eclaire پیشانیداوە. بەم پێیە تەنیا دواڕۆژبینەكان Apokalyptiker دەتوانن سیاسەتێكی عەقلانی بۆ ئایندە پیادە بكەن، لەبەرئەوەی تەنیا ئەوان شتە ((خراپەكە)) وەک دەرفەتێكی ڕاستی دەبینن.

بەر لە هەر شت ئەمڕۆ زیرەک بوون واتا: تێگەیشتن لەوەی كە، دەربڕینخوازی جووڵەیی kinetische Expressionismus سەدەی ڕابوردوو، ئەگەر نەتوانرا كۆتایی پێ بهێنرێت، ئەوا دەبێت بە شێوەیەكی ڕادیكال ڕاست بكرێتەوە. مەبەستیشم لە دەستەواژەی دەربڕینی جووڵەیی لەوەیە كەوا شێوازی هەبوون Daseiensstil ی مۆدێرنە بەهۆی ئاسان بەدەستكەوتنی مادە سووتەمەنییە وزە بەخشەكانەوە ئاسان بۆتەوە. لەوكاتەوەی ئەم مادەیە بەكردەوە چۆتە بەردەستی هەمووانەوە، ئێمە وەها ژیان بەڕێ دەكەین وەک ئەوەی پرۆمیتیۆس بۆ جاری دووەم ئاگری دزیبێتەوە. مانای ئەمەش ئەوەیە، ئەگەر ئێمە جەخت لەوە بكەینەوە كەوا ئاگرەكەی جاری دووەم تەنیا مۆتۆرەكانمان ناخاتە كار، بەڵكو لەناو مۆتیڤەكانی هەبوونماندا و لەناو چەمكە بنەڕەتییەكانماندا بۆ ئازادی دەسووتێت. پێناچێت چیتر ئێمە بتوانین ئازادییەک بۆخۆمان وێنا بكەین، ئەگەر ئەو ئازادییە هەمیشە مەترسی پەلەكردن و ڕیسیكۆی خێراكردن نەگرێتەخۆ. واتە ئازادی لە بەردەوامی جووڵەدا بۆ ئامانج و بۆ شوێنە دوورەكان، ئازادی لەزێدەڕەویكردن و لە بەفیرۆداندا، تا دواجار دەگاتە ئازادی لە تەقینەوەدا و لە خۆلەناوبردندا. ئێمە گوێمان لێیە ((دەربڕینی جووڵەیی)) دەدوێت، كاتێک گوێتەی لاو لە نامەكەیدا((زریان و شڵەژان)) ساڵی ١٧٧٦ بۆ Lavatar دەنووسێت: „ ئێستا من بە تەواوەتی باركراومەتە ناو بەلەمێک كە بەسەر شەپۆلی جیهاندا دەهاژوورێت و سوورم لەسەرئەوەی:

یاخود بدۆزمەوە و دەستکەوتم هەبێت و شەڕ بکەم و شکست بهێنم، وە یان لەگەڵ تەواوی بارەکەدا لەهەوادا بتەقێمەوە. „گوێمان لێیە کاتێک نیچە لە (ئەمەیە مرۆڤ)دا ڕایگەیاندووە: «من مرۆڤ نیم، من دینامیتم». وە بەکردەوەش لەوێدا دەیبینین چەندێک کارایە کاتێک Phileas Fogg پاڵەوانی گەشتەکەی Jules Vernes (گەشتێک لە هەشتا ڕۆژدا بە دەوری جیهاندا)، لە دووا بەشی سووڕانەوەکەیدا بەدەوری زەویدا بەناو ڕاڕەوەکانی ئەتڵەنتیکدا، لە گەڕانەوەیدا لە نیۆرکەوە بۆ ئینگلستان لە کەمبوونەوەی خەڵوزەکەیدا بەوە دەستی پێکرد کە خەڵوزی ناو کەشتییەکەی خۆی بەکاربەرێت تاوەکو کورەی سووتاندنی ئەم ماشێنە هەڵمییەی پێ گەرم بکات. دیارە ژولیس ڤێرنەس بەم کەشتیە خۆسووتێنەرەی فیلیاس فۆگ میتافەرێکی جیهانی بۆ سەردەمی پیشەسازی دۆزییەوە کە بریتییە لە: هێندانی خۆبەسەرچاوەکردنێکی سامناکی Die fatale Selbstreferentalitaet ئامرازێکی هاتووچۆ کە بناغەکەی خۆی جۆش دەدات. لێرەدا پێویستە تا شاعیری ڕۆمانتیکی زوو وەخت نۆڤالیس Novalis و دیدە ڕەخنەییەکەی سەبارەت ئەو (ئاشەی خۆی دەهاڕێت) بگەڕێینەوە، تاوەکو وێنەیەکی چڕی هاوشێوە بۆ وەسفکردنی هەنووکەی شێوازی ژیان modus vivendi بدۆزینەوە.

بەڵام دەرچوونخوازی یاخود دەربڕینخوازی جووڵەیی kinetischer Expressionismus ئاماژەیەکی هەمیشە ئامادەبووە، کاتێکیش شاژنی ئینگلستان ئەلیزابێتی یەکەم لەسەدەی شانزەدا دەستە باڵادەستەکەی نایە سەر گۆی زەوی، بۆ ئەوەبوو کە پیشانی بدات ئیدی ئێستا سەردەمێک دەستی پێکردووە کە ئاغاکانی جیهان چیتر وڵاتەکانی خۆیان بەشیان ناکات، بەڵکو دەبێت هەژموون و دەسەڵاتیان تا دوورترین کونجی دنیا پەل بهاوێژێت. ئەو کاتەش دەربڕینخوازی دەبێتە دیاردەیەکی سیاسی ئەگەر ئەو خودەی Subjekt دەخوازێت خۆی بهێنێتە دی هەموو کاڵاکانی گشت جیهان بۆ خولیایی خۆی و بۆ بەکارخستنی خۆی داوا بکات. ئەمەش بەلای فۆرمە نوێکانی ژیانی بنەما پێکهێنەرەکانی گەشەکردنەوە هیچ ناگەیەنێت جگە لە: دەرچوونخوازی و دەربڕینخوازی جووڵەیی لە چالاکیدا.

## 2-زەوی وەک ئەستێرەیەکی سادە:

«ئێمە ئەرکێکمان لەسەرە: بانگکراوین بۆ گەشەپێدانی زەوی.» نۆڤالیس[٣].

دەربڕینخوازی مۆدێرن لەسەر ئەو بۆچوونە هەڵچنراوە کە بەلای مرۆگەلی سەردەمی زووەوە هێندە ڕوون و ئاشکرا بوو بەشێوەیەک کە نەدەبوو ڕاستەوخۆو بەزەقی لەڕووی پراکتیکیەوە هەرگیز جارێکیتر دابڕێژرێتەوە. بەلای ئەوانەوە سروشت بریتی بووە لە تێڕامانێکی ناکۆتا و بەمەش بووبووە ئەو دەرکەوتە دەرەکییەی کە بێڕادە و بێسنوور باری خراوەتە سەر، بەڕادەیەک هەموو خاڵیکردنەوەیەکی مرۆیی هەڵلوشی بوو، وە هەموو لێدەرهێنانێکیشی فەرامۆش کردبوو. هەتا دوێنێش ئەم بیرۆکە هەرەمەکییەی بۆ سروشت هەبوو مێژووی مرۆڤایەتی پێناس دەکرد، بگرە تاوەکو ئەمرۆش هێشتا هاوچەرخانێکی بێشومار هەن ناتوانن و ناشیانەوێت وێنای ئەوە بکەن کە لەم پنتەدا دەشێت بیرگۆڕینمان شتێکی زەرور بێت. ئەم شەمەنەفەرە بەرەڵابووە خێرایەی

شێوازی ژیانی ناو شارستانییە دەوڵەمەندەکانی ئەمڕۆ ئەوەی بۆ سەلماندین کەوا: فەرامۆشکردن و گوێپێنەدانی سروشت لەبەر بەرژەوەندییەکانی جووڵەی مرۆڤ تەنیا وەهمێک بوو کە هەر بۆ سەردەمی نەزانین و جەهل Ignoranz دەگونجا.

سنوورێک هەیە بۆ دەربڕین، سنوورێک هەیە بۆ دەرچوون و بڵاوبوونەوە، سنوورێک هەیە بۆ بەخشندەیی لە نەزانینێدا وە لەبەرئەوەشی ئەم جۆرە سنوورانە هەن، تەنانەت گەر ئێمە نەشزانین لە کوێدا بەتەواوەتی دەبێت ئەو سنوورانە بکێشرێن، ئەوا ئەو بیرۆکە دێرینە دیارەی بۆ سروشت هەیە وەک هەڵلووشترین دیاردەی(دەرەکی) لەجێی خۆی دەلەقێت.

دەبینین ئێمە بە جارێک ناچار دەبین ئەو بۆچوونە دیارە ناسروشتییە قبوڵ بکەین، کە پێیوایە تەواوی کایەی گۆی زەوی لەڕێی کردەوەکانی مرۆڤەوە گۆڕاوە بۆ دیاردەیەکی تاقانەی گەورەی (هەناوگەیی Interieur). بوکمینستەر فیولەر ویستوویەتی بەرپرسیارێتی ئەم وەرچەرخانە لەقێنەرە بخاتە نێو دەستی ئەو دیزاینسازانەوە، کە داوای شێوازێکی بیرکردنەوەی „هەمەلایەنی komprehnsive" و „ پێشبینیکاری antizipatorische" یان لێ دەکات. بیرکردنەوەیەکی لەو جۆرەش دەبێت „پلاندانانی جیهان" لەناو „سیستەمی هەمەکییانەی کۆمیونیکاسیۆنی مرۆییدا" لەسەرزەوی وەک کەشتییەکی ناو بۆشایی ئاسمان ئاسان بکات.

چل ساڵ پاش بڵاوکردنەوەی مانیفێستەکەی بوکمینستەر فیولەر ئەوە دەرەنجام دەکەین کەوا دیزاینسازەکان کەمتر لە کەشناسەکان Meteorologen خەمی پیادەکردنی ئەم بیرۆکە نوێیەی جیهانی (گەورە هەناوگە)یەیان Makro-Interieurs هەبووە. ئێستا بەلامانەوە ڕوونە کەوا: دیزاین نا، بەڵکو کەشناسی گەیشتۆتە سەر دەسەڵات. ئەو لەڕووی سیاسی و ئابوورییەوە خۆی سەپاندووە، چونکە کەشناسی لەم چرکەساتەدا مۆدێلێکی پێشنیارکراومان بۆ ئەو (هەناوگە) گلۆباڵە پێشکەش دەکات، کە بریتییە لە: بەردەوامبوونی دینامیکییانەی ئەو ڕووپۆشە گازییەی زەوی، کە هەر لەڕۆژگاری سروشتناسە گریکەکانەوە پێی دەگووترێت ئەتمۆسفێر Atmosphaer وەرگێڕانە وشەییەکەشی بریتییە لە: گۆی تەماوی Dunstkugel.

لەو کاتەوەی زاناکانی کەشناسی سەلماندوویانە کەوا ئەتمۆسفێرەکان یادەوەری خۆیان هەیە، ئەوا چیتر گفتوگۆکردنەکان لەبارەی کەشەوە وتووێژی بێ زیان نین. واتە ئەو هێشتا ئەو دوکەڵەی لەیاد نەکردووە کە لە دوکەڵکێشی شۆڕشی پیشەسازی زووەوە دێتەدەرێ، بگرە هیچ شتێکی ئەوەش لەیاد ناکات کە لە وێستگە خەڵوزینەکانی وڵاتە پێشکەوتووەکانەوە و لە دەزگای گەرمکەرەوەی شارە زلەکانەوە و لە فڕۆکەکانەوە و لە پاپۆڕەکانەوە و لە ئۆتۆمبیلی خۆشگوزەرانەکانەوە و لە تەقەکردنێکی زۆری چەکی ئەو هەموو لەشکرانەی کیشوەرەکانەوە دەردەچێت، ئەگەرچی عادەتەن نیوەی ئەوانە بە ئۆکیانوس و بە بیۆسفێرەکانەوە گرێدراون.

بێگومان، ئەوە هەر زەوییە کە شوێنەوار و پاشماوەی مەسەلە مرۆییە شایستەکانیش دەپارێزێت. هەر لەم ڕۆژانەدا لە باکوری ئەڵمانیادا ئەو ناڵە قوڕینە دۆزرایەوە کە گوزەرکردنی ئەسپسوارە ڕۆمییەکان بەوێدا دەسەلمێنن. بە ئامادەبوونی ئەو ناڵی ئەسپە ڕۆمییانە، خاکی ئەڵمانیا نە سارد

دەبێتەوە و نە گەرمیش. بەڵکو بە پێچەوانەوە ،ئەتمۆسفێری زەوی جێگایەکی هەستیاری پاراستنی پاشماوەکان و گلدانەوەی پاشەرۆکانە Deponieraum: ئەو مەیلی ئەوەشمان پیشان دەدات کە بە گەرمییەوە وەڵامی دەرچوونە هاوچەرخ و ڕابوردووەکان بداتەوە. ئەگەر کەشناسەکانیش ڕاستی بدرکێنن ئەوا ئەو گۆڕانە چاوەڕوانکراوەی بەسەر کەش دا دێت لەزۆر کونجی ئەم دنیایەدا ئەو پەیوەندییە بەرپا دەکات کە لەگەڵ هەبوونی مرۆڤدا، بەوجۆرەی ئێمە دەیناسین. هەڵ ناکات.

بەو جۆرە دەبینین کەشناسەکان ڕۆلی ڕیفۆرمسازەکان دەبینن.

ئەوان بانگەواز دەدەنە مرۆگەلی ناو نەتەوە پیشەسازییەکان و وڵاتە پێگەییوەکان لەپێناوی وەرچەرخاندنی شێوازی ژیانیان. ئەوان پتر داوا دەکەن تاڕادەیەک شارستانیەت لەکاربۆناویکردن بخەن و چیتر دەستبەرداری خۆشییە گەورەکانی ئەو شێوازەی ژیان modus vivendi بین کە لەسەر وزەی بەردینی هەڵچنراوە. ئەو دەستپێکەی ئەم داوا گریمانکراوە مەبەستێتی دەگاتە قووڵاییەکی ئەوتۆ کە مافی ئەوەمان دەداتێ دەست بەرین بۆ هاوشێوە گەورەکانیشی. واتە ئەو بیرگۆڕینەی Umdenken لە مرۆڤی سەدەی ٢١ داوادەکرێت ئەوەیە هەروەکو ڕیفۆرمسازییەکەی سەدەی ١٦ بەردەوامی دەبێت کە تیایدا ڕێساکانی هاتوچۆکردن لە نێوان زەوی و ئاسماندا سەرلەنوێ چاویان پێدا دەخشێنرێتەوە. هەر لێرەدا ئەمەش هاوارەکەی یۆحەنای مەعمەدان دێنێتەوە بیرمان کە بانگەوازی وەرچەخانی سەرانسەرییانەی دەکرد. ئەوسا ئەو هاوارەی لە بیابانەوە بەرزدەبۆوە پتر داوای وەرچەرخان یاخود وەرگێڕانەوە (مێتانۆیا) Metanoia یەکی دەکرد کە ئاکار و ئیتۆسی ئیگۆیستە پووچە باوەکانی ئەو ڕۆژگارە بگۆڕێتەوە بە بارێکی نائاسایی ڕەوشتییانەی دڵ و گیان. ئەم بانگەوازەش ئەو شۆڕشە بەردەوامەی بەرپاکرد کە ئێمە ئەمڕۆ پێی دەڵێین مەسیحایەتی. دواجاریش داخوازی ئەمرۆژگارەش بۆ بیرگۆڕین سەرنجمان بۆ ڕامانە وردەکەی پلاتۆن لە دیالۆگی سۆفیستەکاندا کێش دەکات، کە تیایدا شەڕی نێوان بیردۆستەکان Ideenfreunden ( Vulgo den Idealisten) و نێوان ماتەریالیستەکان (vulgo den Materialisten) لەسەر مانای (بوون) وەکو شەڕی دێوەکان دەکەوێتەوە. شەڕێک بەهۆی سەختی و دژواریی کێشەکەوە، لەپێناوی ئەوەی تا دەنگ بۆ یەکێک لەو دوو لایەنە بدرێت و کێشەکە بەلایەکدا ساغ بکرێتەوە. تاوەکو مرۆڤ لەئارادا بێت هەر درێژەی دەبێت.

دیارە شەڕی هەنووکە لەسەر کەش چیتر (هەژموونکردنی زەوی) نەکردۆتە ئەو شتەی کە گووتەبێژە سیاسییەکانی سەردەمی ئیمپەریالیستی بە تاسەوە لەبارەیەوە دەدووان. بەڵکو ئەم شەڕە پتر لەپێناوی ئەو دەرفەتانەدایە کە پرۆسێسی شارستانی بە کراوەیی ڕادەگرن و بگرە بەردەوامبوونیشی مسۆگەر دەکەن. لەپاش ئاشکراکردن و دۆزینەوەی کولتورەکانی تر لەڕێی هاتووچۆکردنەوە بۆ شوێنە دوورەکان لەماوەی سەدەکانی ١٦ و ٢٠ دا، ئەم چالاکییە بووە مایەی بەرپابوونی ئاوێتەکردنێکی کاتییانەی بکەرە جیهانییەکان بە یەکتری لەڕێی ڕایەڵەکانی بازرگانی و دیپلۆماتییەوە. وەهاش پێویستی دەکات کە ئەم چالاکییە پتر بەرەو پێشەوە ببرێت تاوەکو کارلێکردنی پۆزەتیڤی پێکەوەیی کولتورەکان لەناو دەزگایەکی هاوبەشدا کاراتر بکات. لێرەشدا ئێمە

ئەو پرسیارەمان وەلاناوە، كە دەپرسێت: ئایا مرۆڤایەتی بە گشتی لەو دۆخەدایە كە (ئێمەیەكی یەكانگیر ein kohaerentes Wir) یاخود وەک ئەوەی ڕۆسۆ پێی دەڵێت (خواستێكی سەرانسەری كارا volonte generale) پێک بهێنێت؟

هەڵبەت لەم ساتەدا تەنیا دوو شت هەن كە ئێمە لێیان دڵنیاین: یەكەمیان، ئەوەیە ڕیفۆرمسازی كەشناسی، كە ئێمە وا سەرەتاكانی دەژین، توانیویەتی ڕوانینێک لەسەر چاخی مەسەلەیەكی گەورە بكاتەوە، دووەمیشیان، ئەوەیە كە سەدەی ٢١ هەر وەک بازاڕێكی سالآنەی پووچەڵی فریادرەس خۆی دەكات بەناو مێژوودا، كە لە كۆتاییەكەیدا مرۆڤ تامەزرۆی بەفریاوەچوونی فریادرەسەكە و تامەزرۆی ڕزگاركردنی ڕزگاركەرەكەی دەبێت. لەهەمانكاتیشدا وەک چاخی ڕیاكاری و دوو مۆرالی دەردەكەوێت. لەخۆڕانییە لەم كاتەدا، واتە لەئەودیوی پووچەڵی و ترس و ڕەوانبێژی ڕیاكارانەوە، هەمیشە مەسەلەكان لەبارەی ئەم پرسیارە هەندئامێزەوەن: ئایا لەسەر زەوی كەشتی بۆشایی دەشێت ڕژێمێكی جێگیری گلۆبال دابمەزرێنرێت؟ لێرەدا دەبێت سەرنجی ئەوە بدرێت كەوا لە چەمكێكی وەكو (جێگیركردن)دا داواكان هەر لەسەرەتاوە دەبێت میانڕەوانە بمێننەوە. لەبەرئەوەی گەشەی كولتوری چ هاوسەنگییەكی جێگیر ناناسێت، بەڵكو لەوپەڕی ئەگەردا دەكرێت بگوێزرێتەوە سەر دۆخێكی ناهاوسەنگی زیندووی دوواتر.

هەر لەئەمڕۆشەوە ئێمە سیماكانی ئەم شەڕی ئایندەیەی زەبەلاحەكان دەناسینەوە، كە تیایدا لایەنە ئیدیالیستیەكە لەڕێی نوێنەری ناچیزەیەكی نوێی ترەوە نوێنەرایەتی دەكرێت، كە بەو داخوازییە ڕووبەڕووی لایەنە ماتەریالیستییە دژەكەی خۆی دەبێتەوە، كەوا هەموو شێوەكانی دەربڕینخوازی یاخود دەرچوونخوازی جووڵەیی kinetischer Expressionismus دەبێت كەم بكرێنەوە بۆ سەر پلەیەكی گونجاو و قەبوڵكراوی گچكەترین Minimum سیاسەتی زەوی. ئەگەر ئێمەش لەوە تێگەیشتین كەوا ئەم دەرچوونخوازییە لەگەڵ شێوازی ژیانی كولتورە خۆشنوودەكانی سەر ئەم هەسارەیەدا هاوشێوە بێت، ئەوا بەنێو تەواوی (كاردانەوە وزەهێنەكانمان لەگەڵ سروشتدا)و بەرهەمهێنانەكانمان و بەكاربردنەكانمان و نیشتەجێبوونەكانمان و هاتوچۆكانمان و هونەرەكانمان و پەیوەندییە كۆمینیكاسیۆنەكانماندا گوزەر دەكات و خۆی دەگەیەنێتە هەر هەموویان و لە هەریەكێک لەم بوارانەدا ئاماژەی ئەم ساتە هێشتا لاسارانە خراوەتە سەر خاڵەكانی گەشەكردن و زێدە پێشكەوتن، ئەوسا ڕاستەوخۆ لە شتێک تێدەگەین، ئەویش ئەوەیە: ئیتیكی دژە دەرچوونخوازی و دژە دەركردن لە داهاتوو دا دوواجار دەگاتە سەر ڕێی (وەرگێڕانەوە)ی ئەو ئاراستەیە و (وەرچەرخان)ی ئەو ئاقارەی كە تا ئێستا شارستانیەت گرتوێتیەبەر. ئەم ئیتیكە داوای كەمكردنەوە دەكات، لە جێیەكدا كە تاوەكو ئێستا تەنیا زۆركردن و فرەكردن لەسەر نەخشەكەیدا نووسراوە، ئەو هانی بچووككردنەوە دەدات، لەو شوێنەی كەتاوەكو ئێستا زلكردن داواكراو بوو. ئەو دەیەوێت خۆی دوور بخاتەوە لەو شوێنەی كە تاوەكو ئێستا تەنیا تەقینەوە ڕێ پێدراو بوو. ئەو ئاكاری دەستگرتنەوە لە مەسرەفكردنی زیادە دادەهێنێت، لەجێیەكدا كە بەفیرۆدان و مەسرەفی زیادەكردن بە باڵاترین هەستی گومڕایی دادەنرا، ئەو ئاگادارمان دەكاتەوە لەوەی دەستكورتی بكەین، لە جێیەكدا كە تا ئێستا دەست نەگرتنەوە

و خۆسەربەستکردن جەژنی پێوە دەگێڕدرا. خۆ ئەگەر تا کۆتایی بیر لەم بیرگۆڕینانە بکەینەوە، ئەوا لەناو ئەم ڕەوتەی چاکسازیکردنی کەشناسیدا دەگەینە جۆرێک لە کالڤینیزمی ئابوورییانە. ئەمەش خۆی لەسەر ئەو بەڵگەنەویستەیە هەڵدەچنێت کەوا: مرۆڤایەتی تەنیا یەک زەوی شک دەبات. لەبەرئەوە لەئەنجامدا ئەو ناتوانێت،لەسزای خۆڵەناوبردندا، شتێکی زیاتر لەوە لەبناغەی ئەم زەوییە داوا بکات کە لەبەردەستدا هەیە. بەم شێوەیە گلۆبالگیری پارادۆکسانە لە دژی ڕەوتە بنچینەییەکانی خۆی کارا دەبێت: بەوەدا کە بەسەر تەواوی هێڵی پەلهاویشتنەکەدا زاڵ دەبێت، ئەوا دەستکورتکردنەوە بەسەر تەواوی هێڵەکەدا دەسەپێنێت. بەوەشدا کە دەیەوێت خۆشنوودی گشتگیر بکات، ئەوا ئەو دۆزینەوەیە ئاشکرا دەکات،کەوا دواجار ئەم گلۆبالە تەنیا دژەکەی بەکارە، واتە: سادەیی و ساکاری بۆ هەمووان.

زەبەلاحەکان بەم ئاماژانە هاتنە ئاراوە، ئەوان لە سەدەی داهاتوودا بەیەکدادەدەن. دیارە ئێمە لەداهاتوودا بازنەی نێوان پەلهاویشتنخوازی Expansionismus و خۆبچووککردنەوەخوازی Minimalismus دەژین و دەبینین. ئێمە دەبێت لەنێوان ئیتیکی تەقەمەنی و ئیتیکی خۆڕاهێناندا (زوهدگەرایی Askese) هەڵبژێرین. ئێمە ئەوسا هەست بەوە دەکەین کە چۆن ئەو ئەلتەرناتیڤە ناکۆکانە خۆیان لەناو هەستەکانی ژیانماندا کۆپی دەکەنەوە و هەروەها چۆنیش ئێمە لە نێوان دۆخی مەسرەفکردنی شێتانە و دۆخی دەستگرتنەوەی خەمۆکییانەماندا دیلانێ دەکەین. نیتچە لەم ڕووەوە تێڕامانی لەسەر زەوی ئەوەیە کە ئەو دەبێت وەک، عەقلێکی دەرەکی، (ئەستێرەیەکی ڕاهێنان) دەربکەوێت، کە لەسەریدا هەڵبژاردەیەک لە ڕۆحانییە خەمۆکێدارە پڕ غەریزە کینەئامێزەکان ڕابگەیەنرێت. لەم نێوەندەشدا بەشێکی خۆشنوودانەی ئەم زەوییە لەسەدەی ٢٠ەوە نمایشێکی چێژخوازی و هێدۆنیستی دەژین و دەبینن، کە ڕەنگە بەرلەوەی سەدەی ٢١ کۆتایی بێت، ئەو تەواو بێت.

ئەگەریش ئەم چاکسازییە بانگەشە بۆکراوە ببێتە مایەی سۆسیالیزمێکی کەشناسی، ئەوا زەمین لە داهاتوویەکی نزیکدا لە دیوی دەرەوەیدا وەکو ئەستێرەیەکی سادە دەردەکەوێت، کە: هەر تاکێک دەتوانێت لەسەری بڕێکی باشەی بۆ چوونە دەرەوە پێ هەڵسووڕێت و، بەمەش مرۆڤ وەکو بەشدار و هاوبەشێکی ئەتمۆسفێرەکان و توخمەکانی تریش دەناسرێت. بەوەشدا نیتچە لە هەمانکاتدا شارەزایەکی لێهاتووی پرسی شەڕی خوداکان و زەبەلاحەکانیش بوو، ئەوا دەیزانی کەوا، لە کێشمەکێشی ڕێکخستنەوەی ئەم زەبەلاحانەدا شتێک نییە ناوی بێلایەنی بێت: (ئای. ئەوە جادووی شەڕەکەیە، ئەوەی تەماشاشی بکات، هەر دەبێت بەشداری بکات[٤]).

هەموو هاونیشتمانییەکی نەتەوە دەوڵەمەندەکان ئەم شەڕەی زەبەلاحەکان نەک هەر لەسەر سینەی خۆیدا ساغ دەکاتەوە، بگرە لەڕێی بڕیاری تایبەت بەخۆیەوە سەبارەت بە شێوازی بەکاربردن و کۆنسومکاری ئەوە ڕادەگەیەنێت کە ئەو خۆی بەسەر چ لایەکدا زاڵ کردووە.

## 3-زۆربارکردنی زەوی:

«کەچی تاوەکو ئێستا هیچ کەس بەوەی نەزانیوە ئاخۆ جەستە بەتەواوەتی چی دەتوانێت».
سپینۆزا °.

لەم بارەدا تێڕامانەکان وەها دەردەکەون وەک ئەوەی بزووتنەوەی پاکسازی Puritanismus (بزووتنەوەیەکی چاکسازیخوازی بوو لە سەدەکانی ١٦ و ١٨ دا لە ئینگلستان و سکۆتلاند بۆ پاکتاوکردنی کڵێسە لە پاپاگەرایی، ئەمڕۆ پوریتانیزم هاوناوێکە بۆ مۆرالیزم. وەرگێڕ) بتوانێت تاکە مۆرالێکی ژیرانە بێت لەسەر ڕووی ئەم کەشتی بۆشاییەی زەویدا. مرۆ چۆن بۆی بلوێت دەشێت وەهای هەڵبسەنگێنێت: شتێک کە نکوڵی لێ ناکرێت ئەمەیە: لەمیانەی سەدەی ٢٠ دا شێوەیەکی نوێی فەرماندانی ڕەهای ئیمپەراتیڤی هاتۆتە ئاراوە کە بریتییە لە فەرمانی: (( تۆ دەبێت ژیانت بگۆڕیت))، ئەم ڕستەیە هەر لەو کاتەوە بە دەسەڵاتێکی خۆسەپێنەوە مەبەستگەری ئاکارییانەی زۆر لە هاوچەرخەکانی خستۆتە ڕوو ئەم ڕستە ئیمپەراتیڤە هۆشیاریمان بە داخوازییەک ئاوس دەکات کە هەر دەبێت بیهێنین دنیاوە، ئەویش داهێنانی شێوازێکی نوێی ژیانە کەگونجاو بێت بە تێگەیشتنی سیاسەتی گەردوونیانە و ژینگەناسییانەی کولتورەکەمان. ئەم ڕستەیە لە پلەیەکی بەڵگەنەویستانەی ئەوتۆدایە کە هاوتایە بە هێزی هەموو ئەو حوکمانەی لە سەردەمەکانی زوودا هەر لای بودییەکان و لای فەلسەفەی خۆئارامگرتن Stoizismus و لای مەسیحییەکان و لای ئیسلامییەکان و لای ئیتیکی هیومانیستیدا بەسەر تاکەکان و کۆمەڵگاکاندا سەپێنرابوون، وە تاوەکو ئێستاش هەر دەسەپێنرێن. لەبەرئەوەی ئەم فەرمانە ئیمپەراتیڤە نوێیە ((واتە تۆ دەبێت ژیانت بگۆڕیت. وەرگێڕ)) وەک هەموو ئەو سەلمێنە ئیتیکییە گەورانەی کە هەن بانگهێشتی هەمووان دەکات کەوا شتێکی ڕیالیستییە ئەگەر پێشبینی شەپۆلێکی بەربڵاوی جۆشی ئیتیکی بکەن. لەناو ئەم ڕستەیەدا، هەم لەناو ئاینە باوەکانداو هەم لە دەرەوەیاندا، ((ویستیی هەنووکەی ژیان)) لەگەڵ ((هەستی هەنووکە))دا لەپێناوی ((شتە باشەکە)) و ((شتە ڕاستەکە))دا بە پاڵهێزێکی توند و بگرە جیهانبزوێنەوە خۆیان پێکەوەگرێدەدەنەوە. بەهەمانشێوەش ئەوەش شتێکی ڕیالیستییانەیە کە بە شەپۆلێکی ستایشئامێزی ملدان و نوچدان و دۆڕان و بەزین و گاڵتەجاڕییەوە ((لەدوای خۆمانەوە لافاوەکە)) لەبەرچاو بگرین.

دیارە بەپێی خوێندنەوەیەکی بەرایی، شتەکە وەها دەردەکەوێت، وەک ئەوەی لەم فەرمانە هەنووکەییەوە جگە لە ئیتیکێک بۆ میانڕەوییەکی جیهانی نەشێت چ ئەنجامێکی تری لێ بکەوێتەوە. بەڵام دیارە ئەو پرسیارەی بەکراوەیی دەمێنێتەوە ئەوەیە، ئاخۆ وەرچەرخان و وەرگەڕان بەرەو ناچیزەیی و سادەیی دەبێتە مایەی خاوبوونەوە و نەرمی نواندنی ئازادانەی خەڵکی لەناو ئەو کولتورانەی بەشێوەیەکی چڕ بەربڵاوبوونەتەوە، وەئاخۆ حکومەتەکانی نەتەوە دەوڵەمەند و داراکان، لەحاڵەتی نوقسانی هەرێمێکی گلۆبالی فەرمانڕەوایی دا تاوەکو ئەو ماکرۆسیستەمە توانای مامەڵەکردنی دەبێت، زوو یان درەنگ خۆیان ناچار دەبیننەوە لەسەر هەرێمەکەی خۆیاندا بانگەشەی جۆرێک لە

مافی جەنگی ژینگەئارایی (ئیکۆلۆگی) ڕابگەیەنن، جەنگێک لێوەی ئەوانە ناچار بکرێن کە بەپێی بنەما ئازاد و خۆبەخشەکە پێی ناگەن و بەدەستی ناهێنن.

لە سەرنجی دووەمیشدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، کە داخوازیکردنی ئیتیکێکی جیهانی بۆ میانڕەویکردن، هەروەها هیواخواستن بە سۆسیالیزمکردنی کەشوهەوا دوو شتی خەیاڵپلاوین. ئەوان تەنیا لەدژی ئەو هەموو پاڵهێزانەی شارستانیەتە دەرپەڕیوەکان نین، بەڵکو ئەو تێگەیشتنەش بەرپەرچ دەدەنەوە کە لە غەریزە بزوێنەرەکانی کولتورە باڵاکانیشدان. واتە ئەمانە بەبێ هەبوونی پەیوەستی و ئەڤیندارییەک Liasion لەنێوان هەوڵ بۆ خۆڕاگرتن و ئیرادە بۆهەڵکشان دا ناکرێن بێنە بیرمان. لەنێوئەم پەیوەندارییەی خۆڕاگرتن و خۆهەڵکشاندا لەبەر بەرژەوەندی کولتورێک بڕیارێکی پێشتر هەیە کە تیایدا زۆرهەبوونی و، بەفێڕۆدان و مەسرەفگەرایی و لوکسوس بە مافێکی هاونیشتمانیان دانراوە. پلاتۆنیش دەبوو لە تێڕامانەکانیدا لەسەر دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی ئیدیال ئەو شیمانەیەی بۆ شاری سادە frugale polis دەربڕێت: ئەم حەکیمە گریکییە نەیدەزانی وەڵامێکی گونجاوتر لەوە بداتەوە کاتێک گلاوکۆن Glaukon لە دوای وەسفکردنی ژەمەخوانێک لە شارێکی بەقەناعەت و سادە دا بەو پرسیارە زبرە بەرپەرچی دەداتەوە: „سوکرات ئەگەر تۆ شارێکت بۆ بەراز دابمەزراندایە، جگە لەمەی بەردەست تۆ چیترت دەدانێ بیخۆن؟" [٦] ئەم وەڵامە بەس بوو بۆ ئەوەی نووچ بە سوکرات بدات و ڕازی بێت لەسەر دامەزراندنی شارێکی لوکسوس و خۆشنوودئامێز üppige Stadt . بەهەمان ئەم شێوەیە ئەمڕۆ ئێمە ناچارین لە هەموو ئەو پێشهات و پرۆژانەی سەبارەت بە جیهانی سبەینێن دەبێت مرۆڤی نەتەوە دەوڵەمەندەکان خۆشنوودییەکەیان و پێشمەرجە تەکنیکییەکانیان، کەدیارە ئەمڕۆ چیتر دەستبەرداری ئەوانە نابن، بۆ داگیرکردن و زەوتکردنی دنیا ڕابگرن. ئەوان هەر بەو باوەڕەوە دەمێننەوە کەوا ئەوە ئەرکی گەشەکردنە لەڕێی فراژووبوونێکی بەردەوامەوە ئەو خۆشنوودییە ماتەریالیەو ئەو سوودە دەرکەوتووانەی ئەمان دەیچێژن دوواتریش بە جیهانی بکرێن. ئەوان بەرپەرچی ئەوە دەدەنەوە لەگەڵ داهاتوویەکدا ببنە دۆست کە خۆی لەسەر بنەمای خۆبچووککردنەوە و خۆڕاگرتن هەڵچنی بێت.

لەبەرابەری ئەمەدا بانگەشەکەرە نوێکانی ناچیزەیی و سادەییخوازی Bescheidenheit بەرپەرچی ئەوە دەدەنەوە و پێیانوایە لە ماوەیەکی کورت یان درێژدا خۆشگوزەرانەکانی ئەمڕۆ هیچ پاشماوەیەکیان بۆ نامێنێتەوە، ئەوە نەبێت خۆیان بۆ ئەو ڕاستییە ئیکۆلۆگییە بچەمێننەوە. بەم پێیە بەرهەمهێنەرە نوێکان و بەکاربەرەکانیان تا ژمارەی ئەندامەکانیان لە یانەی بەکاربەری و مەسرەفگەریدا گەورەتر بێت، ئەوا سنوورەکانی دەرچوون و دەربڕین دراماتیکیانەتر دەبن و زووتریش دەبینرێن. لێرەدا ئەو سەلمێنەیە Axiom دەکەوێتە بەر مەترسییەوە کە دەست لە هەموو سنوورەکانی بیانووی گەشەسەندن دەدات. ئەویش ئەوەیە: زەوی تەنیا یەک دانەیە و بەس، کەچی نەتەوە دەوڵەمەند و داراکانی ئەمڕۆ وەها دەژین، وەک ئەوەی بۆیان هەبێت پەل بهاوێژن بۆ دەرەوەی زەویش. ئەگەریش شێوەژیانی Lebensstil ئەوان بەسەر هەموو دانیشتوانی تری ئەم سەرزەمینەدا بڵاو پێ بکرێتەوە، ئەوا مرۆڤایەتی نابێت بەلایەنی کەمەوە لە چوار زەوی کەمتری هەبێت. بەڵام بەوەدا کە زەوی یەکێکی

تاقانەیە و نابێتە مۆنادێک((گەردێک/یەکەیەک)) کەشیانی زۆربارکردنی هەبێت multiplizierbare Monade، ئەوا ئێمە دەبێت ڕێزی پێشینەیی سنووراگرتن بدەین بەسەر پێشینەیی هاندەری سنووربەزاندن دا.

ئەم بیانووە (ئەرگومێنتە) بۆ ئەوەی یەکەمیان شتێکە شیاوی نکوڵی لێکردن نییە. تا ئەوکاتەشی مرۆڤ زەوی و زیندەکایەکەی خۆی Biosphäre هەر بەو شتە تاکە دابنێت کە شیاوی زۆرکردن نییە، ئەوا دەبێت ئەو هەڵوێستە بڵاوە پێکراوە و بەرفراوان بووەی شارستانیەتی دەربڕین و خۆشگوزەرانی مۆدێرن وەک ناعەقلانیەتێک دەربکەوێت کە شیاوی لێبوردن نییە.

بەرخوردی مرۆڤ لەگەڵ هەسارەکەی خۆیدا لەو فیلمە کارەساتاوییە دەچێت کە تیایدا چەند گروپێکی مافیایی دژبەیەک لە سەرنشینی فڕۆکەیەکدان لە بەرزایی ١٢٠٠٠ مەترەوە بە چەکی پڕ فیشەکی عەیارە گەورەوە دەکەونە تەقەکردن لەیەکتری. لەگەڵ ئەوەشدا شتێکی ڕەوایە ئەم پرسیارە هەڵبدەین، ئاخۆ ئێمە بەهۆی شیکاری مۆنادۆلۆگیمانەوە بۆ زەوی ئەنجامە گونجاوەکانمان بچڕاندووە. ئایا ئێمە دروست لە دۆخی خۆمان تێدەگەین، کاتێک ئەم هەسارەیە و زیندەکایەکانی وەکو یەکێکی لەزۆرکردننەهاتوو unmultiplizierbare Eins شیبکەینەوە و ئەمەش بە نەگۆڕێک Fixum دابنێین کە شیاوی تێپەڕاندن نییە؟ ئێمە دەبێت ئاگامان لەوە بێت: ئێمە چیتر کارمان تەنیا بە مێژووی دێرینی گەردووناسیانەی زەمین و بە دیاردە گەشەسەندووە دێرینەکەی ژیان نییە. چونکە لەڕەوتی گەشەسەندنی کۆمەڵایەتیدا ئەو کایەتەکنیکییە Technoisphaere خراوەتە سەر ئەم بنەما گەورەیە کە ئەمیش خۆی بە عەقڵێک Noosphaere دەبزوێنرێت و دەبرێت بەڕێوە. (نووسفێر دەستەواژەیەکی گریکی کۆنە لە بنەڕەتدا لە بواری تیۆلۆگی و فەلسەفەدا بەکار دەهێنرێت، لێرەدا سلۆتەردایک وەک ئاماژەیەک بۆسەر قۆناغی گەشەسەندنی ڕۆحی و عەقلی بەکاری دەهێنێت. وەرگێڕ). بە تەماشاکردنی هەردوو ئەو ڕەهەندانەی گەشەکردن ئێمە ڕاست دەکەین گەر ڕستەکەی سپینۆزا بهێنینەوە، کە دەڵێت: تاوەکو ئێستا هیچ کەس ئەوەی دیاری نەکردووە ئاخۆ جەستە توانای چی هەیە. ئەوە لێرەدا پەیوەستە بە جەستەی مرۆییەوە، بەڵام ئێمە وەریدەگێڕینە سەر زەوی و دەپرسین: تاوەکو ئێستا هیچ کەس ئەوەی دیاری نەکردووە، ئاخۆ جەستەی زەوی توانای چی هەبێت. ئێمە جارێکا ئەوەش نازانین، چ گەشەسەندنێک شیاو دەبێت، ئەگەر کایەی گیۆگرافی Geosphaere و کایەیژیان Biosphaere لەڕێی کایەیەکی ژێری تەکنیکی Technosphaere و کایەی عەقلەوە Noosphaere درێژەبەگەشەپێدانیان بدرێت. ئەوەش شتێک نییە پێشتر مەحاڵ بێت، کەوا لەم ڕێیەوە ئەو ئەنجامانە دەردەکەون کەهاوتای زۆرکردنی زەوین.

تەکنیکیش هێشتا دواهەمین وتەی خۆی نەگوتووە. ئەگەر ئێمەش تاوەکو ئەمڕۆ تەکنیک بە وێرانکەری ژینگە و بە ژیانبەرهەمهێن دابنێین، ئەوا ئەمە تەنیا ئەوەمان بۆ دەدرکێنێت کەوا، تەکنیک هێشتا لەهەندێک ڕووەوە خۆی لە سەرەتاکانیدا دەبینێتەوە. بەر لە ماوەیەکیش ئەو پێشنیارە خرایە ڕوو، کە جیاوازی بکرێت لە نێوان تەکنیکی جیاواز Heterotechnik و هاوتەکنیک دا Homoeotechnik [7]، کە یەکەمیان پەیوەستە بە ڕێکارەکانی Prozeduren توندوتیژی نواندن بەرابەر

بە سروشت و فێڵ لێکردنی سروشتەوە، وە دووەمیان پەیوەستە بە ڕێکارەکانی لاساییکردنەوەی سروشت و درێژەپێدانی بنەماکانی بەرهەمهێنان لە ئاستێکی سروشتییەوە بۆ سەر ئاستێکی دەستکردانە. دیارە لەڕێی خۆچەککردنەوەی کایەی تەکنیک/تەکنۆسفێر بە پێوەرێکی هاوتەکنیکی homoötechnik و لاساییکەرەوەی ژیانەوە biomimetisch لەگەڵ تێپەڕینی کاتدا وێنەیەکی تەواو جیاوازی پێکەوەیاریکردنی نێوان ژینگە و تەکنیک هاتۆتە ئاراوە. ئەوکاتە ئێمە دەزانین جەستەی زەوی تواناى چی هەیە ئەگەر مرۆڤ مامەڵەکردنی لەگەڵ زەویدا لە لێدەرهێنان و سوودلێوەرگرتنەوە بگۆڕێ بۆ بەرهەمهێنانی هاوبەش. دیارە لەسەر ڕێی لێدەرهێنان دا زەوی بۆ هەموو کاتێک بە مۆنادێکی سنوردار دەمێنێتەوە، بەڵام لەسەر ڕێی هاوبەرهەمهێناندا Koproduktion لەنێوان سروشت و تەکنیکدا دەشێت زەوی ببێتە ئەو هەسارە موتوربەکراوەی Hybridplanet لەسەریدا شتی زیاتر لەوەی گیۆلۆگە کۆنسەرڤاتیڤەکان باوەڕیان پێیەتی شیاو دەبێت .

دیارە هاوشێوەی ئەم بیرۆکانە لەلایەن گەلێک عەقلی داهێنەرانەی بزووتنەوە ژینگەییەکانەوە لە تەواوی جیهانەوە هێنراوەتە ئاراوە. ئەوان ئەوەیان بۆ ئەژمارکردووین، کە مرۆڤ چۆن لە تەواوی جیهاندا لەڕێی بەنیوەکردنی بەکارهێنانی سەرچاوەکانەوە دۆخی خۆشگوزەرانی دەبێتە دووقات. لەهەمان ئاقاردا سەرنجێکی نیشانەپێکی بوکمینستەر فولەر دەگاتە هەمان ئەو جێیە: کە پردێک لەنێوان ئەو زۆربوونە سەرسامهێنەی نان لە کتێبی پەیمانی نوێدا (ئینجیل) و مێژووی بەمیتافیزیک ڕاڤەکراوی تەکنیکدا لێدەدات: „بەهۆی بەکارهێنانی یاساکانی دەسکی مەکینەکانەوە، بەتەواوەتی ئەوە شیاو بووە لەڕێی کەمترین شتەوە بگەیت بە زۆرترین شت. لەوانەیە هەر ئەم بەرفراوانبوونە ژیرانەیە بوو بێت کە مەسیح ویست بێتی لە ئامۆژگارییەکانیدا لەسەر چیاوە وەکو وانەیەک بیداتەوە بەو مێژووە تاریکەی نان و ماسی”[٨]. کۆتایی (ڕێنمایی بەکارهێنان)ەکەی بوکمینستەر بەشێوەیەکی لۆگیکیانە پەیوەست دەکاتەوە بە بانگەوازێکەوە بۆ ئیتۆسی داهێنەرانە: „بەم شێوەیە، پلاندانەرەکان، تەلارسازەکان و ئەندازیارەکان دەستپێشخەرییەکەیان دەقۆزنەوە. بچنە سەر کار و پێکەوەش ئیش بکەن و لەودیوی چیاکەوە لەبەردەمی یەکتریدا ڕامەوەستن، لەهەمووشیان زیاتر شتەکان، وە هەوڵیش مەدەن لەسەر تێچووی ئەوانیتر قازانج بکەن. چونکە هەموو دەستکەوتێکی لەم جۆرە کورت دەخایەنێت. ئەوانە ئەو یاسای پێکەوەکارکردنەن کە لێیانەوە گەشەسەندن بەفیرۆدەچێت و هەوڵی ئەوەش دەدەن ئەوەمان بۆ ڕوون بکەنەوە. ئەو یاسایانە هیچ مرۆڤ داینەناون، بەڵکو ئەو یاسابەخشندە ناکۆتادارانەی عەقلە دڵسۆز و پیاوچاکەکانن کە فەرمانڕەوایی گەردوون دەکەن .”[٩]

مرۆ دەبێت خۆی لەوە بپارێزێت کە ئەم گووتەیە کورت بکاتەوە بۆ ئەو سافیلکەییەی کە هەیەتی. ئەگەر خۆفێرکەرە Autodidaktik گەورەکان وەها دوور بڕۆن، کە دەرچوونی جەهالەت لە سنوورێکدا ڕاگرن: ئەوا، ئەمە تەنیا لەو حاڵەتەدا دەشێت ڕوو بداتکە بە هۆی دڵسۆزی و پیاوچاکی هەموو ئەو عەقلانەی کە ئەمرۆ ئەو بەرپرسیارێتییە بۆ زانستە پۆزەتیڤەکەیان و هەروەها بۆ نوقڵانەلێدانە تاریکەکەیان دەگرنە ئەستۆ.

## پەراوێزەكان:

1. Buckminster Fuller, Betriebsanleitung für das Raumschiff Erde und andere Schriften,Dresden 1998,S.54.

2. Buckminster Fuller,a.a.O.,S.46.

3.Blütenstaub,Fragmente.

4. Friedrich Nietzsche,Die Geburt der Tragödie aus dem Geist der Musik,S.15.

5.Etenim,quod corpus,nemo hucusque determinavit. Ethik,II.Teil,Lehrsatz 2,Scholie.

6.Politeia II,372d.

7. Peter Sloterdijk,Nicht gerettet,Versuchen nach Heidegger,Frankfurt am Main,2001,S.212

8. Buckminster Fuller,a.a.O.,S51.

9. Buckminster Fuller,a.a.O.,S.119-120.

*پیتەر سلۆتەردایک،١٩٤٧ ،فەیلەسوف و كولتورناسی، دیارترین كەسایەتی فەلسەفی ئەڵمانی و ئەوروپییە، خاوەنی چەندین بەرهەمی فەلسەفی گەورەیە و پتر لەو كایەدا بیر دەكاتەوە و دەنووسێت كە ڕەخنە لە كارەكانی مرۆڤ و پرۆژەی بە خێرایی كردنی شارستانی لەسەر تێچووی مرۆڤ و ژینگە شارستانیەتەكەی دەگرێت. لە دوواهەمین كتێبیدا ((تۆ دەبێت ژیانت بگۆڕیت)) وردەكارییەكانی ئەو مێژووەی خستۆتەڕوو كە مرۆڤایەتی خستۆتە سەر ئەو ڕێگا هەڵەیە، بۆیە بەفەرمانی ((تۆ دەبێت ژیانت بگۆڕیت)) داوای جۆرێكی تری بیركردنەوە و شێوازێكی تری ژیان و شارستانیەت دروستكردنمان لێ دەكات. ئەم وتارە، كە سەرنج ڕاكێشترین وتاری ناو ئەو لووتكەیەی كۆپنهاگن بوو، دەشێت زۆر لە پەیامە جەوهەرییەكەی ئەو كتێبە بەرجەستە بكات.لەم ڕووەوە كوردانندنیم بە پێویستییەكی فیكری و ڕەوشتی زانی.

## سەرچاوە:

ڕۆژنامەی Die Weltی ئەڵمانی ڕۆژی ١٧/ ٢٠٠٩/١٢ هەروەها دەتوانرێت لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت بخوێنرێتەوە .www.welt.de

# ئایاری ٦٨،
# لاوانی ئەڵمانیا لە باوکانیان یاخی دەبن

پیتەر ساندمێر
لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

لە ناوەڕاستی شەستەکانی سەدەی رابردوودا، ئەڵمانیا توانی تۆز و غوباری دووەم جەنگی جیهانی لە خۆی بتەکێنێت و شار و دام و دەزگا و دامەزراوەکانی ئاوەدان بکاتەوە. لەوکاتەدا نەوەی باوکەکان شانازیان بە بون و ناسنامەی خۆیانەوە دەکرد و راوێژکاری ئەڵمانیاش «لۆدڤیگ ئیرهارد» دروشمی (خۆشگوزەرانی بۆهەموان)ی بەرزکردبووەوە. بەڵام لەناکاو نەوەی نوێ (گەنجان) دەنگی هەڵبڕی و کەوتە رەخنەگرتن لەنەوەی باوکان و دەسکەوتەکانی و گاڵتەی بە هەردوکیان دەهات. گەنجان کەوتنە بێزکردنەوەی لە نۆرم و بەهاکانی باوکان و خۆیان لێ بەدوورگرتن.

باوکان کە گەیشتبوونە تەمەنی شەست ساڵی و راهاتبوون بە کورتکردنەوەی قژیان و تاشینی ردێنیان و پڕکێشی کردن لە بایەخدان بە پاک و تەمیزی خۆیان و رێزگرتن لە یاساکانی وڵات، نەیاندەتوانی لە رەخنەو گازندەکانی منداڵەکانیان حاڵی بن. باوکان هەستیان بە شانازیەکی زۆر دەکرد کاتێک لە رۆژانی پشوودا، خێزانەکانیان لەگەڵ خۆیاندا دەبردە ئەو جێگایانەی بەسەر دەریای ئەدریاتیکدا دەیڕوانی.

هەموویان کۆک بوون لەسەر ئەوەی بێدەنگ بن و رابردوو جێبهێڵن. لافی ئەوەشیان لێدەدا کە ئەوان نە هاوکاری نازیەکانیان کردووە و نە لە کارە دزێوەکانیشیاندا بەشداربوون. وەک ئەوەی لە سەردەمی رایخی سێهەمدا واتە بە درێژایی دوانزە ساڵ، ئەڵەمانیا ئارام بووبێت و هیچ روی نەدابێت. دەرهەق بەم مەسەلەیە «تۆمالۆ»ی نوسەر دەگێڕێتەوە و دەڵێت: (سەروەختێک دەساڵان بووم،

پرسیم لە باوکم لەماوەی جەنگدا چیت کردووە؟ وتی هەرگیز گوللەم ئاڕاستەی ئامانجە راستەقینەکە نەکردووەو روی تفەنگم لە شوێنێکی تر کردووە و کەسم نەکوشتووە). باوکانی هاوڕێیان «لو»، هەمان شتیان بە منداڵەکانیان وتبوو. واتە تەواوی نەوەیەک بە هەڵە تەقەیان کردووە و گوللەی چەکەکانیان ئامانجی راستی نەپێکاوە. وای لێهات وەک ئەوەی کۆمەڵگەی ئەڵەمانیای خۆرئاوا خاڵی بێت لە باوکان، چونکە نیوەیان مردن و نیوەی دیکەشیان حاشا لە رابردووی خۆیان دەکەن و دووچاری دەردی لەبیرچونەوە هاتووە. هەرچیش پەیوەندی بە نازیزمەوە هەیە ئەوان بێئاگان لێی و هیچی لەبارەوە نازانن. باوکان راهاتن لەسەر ئەوەی یادی کارەساتەکانی نازیزم بکەنەوە و سەرکۆنەی بکەن، وەک ئەوەی هیچ یەک لەوان تێیدا بەشدار نەبووبێت. «تیودۆر ئەدۆرنۆ»ی فەیلەسوف لە پاش گەڕانەوەی لە تاراوگە ( لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا) دەڵێت: (مرۆڤ کە سوار شەمەندەفەرێک دەبێت و لەتەک کەسێکی نەناسراودا دادەنیشێت، رەنگە ئەو کەسە تاوانبار بێت و لەوانەبێت کە بەشداری قەتڵ و عامەکانی کردووە). بۆنمونە «هانز گلۆبکی» بەرپرس لە رایخی سێهەم و یەکێک لە بەشداربوانی فۆرمەلاکردنی (یاساکانی نۆرەمبرگی) نازیزم، لە شەستەکاندا پۆستی بەڕێوەبەری راوێژکاری ئەڵەمانیای وەرگرت. هەروەها «تیودۆر ئۆبەرلاندەر» یەکێک لە گەورە بەرپرسەکانی نازیزم و لەوانەی دەستیان لە قەتڵ و عامەکانی خۆرهەڵاتی ئەوروپادا هەبوو، لە سەردەمی «کۆنداد ئەدیناور»دا کە لەنێوان سالآنی (١٩٤٩-١٩٦٣) راوێژکاری ئەڵەمانیابوو، پۆستی وەزیری دورخراوەو کۆچپێکراوەکانی بەدەستەوەبوو.

لە زانکۆکانو دادگاکان و خوێندنگەکان، بەرپرسانی نازیزم چونەوە سەر کارەکانی خۆیان. لە نەوەی باوکان ئەوانەشی نازی نەبوون، لە ناخیاندا نۆرم و بەهای سستەمی دەوڵەتی ستەمکاریان هەڵگرتبوو، بەو هۆیەشەوە لەگەڵ منداڵەکانیاندا توند و سەخت گیربوون. گەنجانی ئەڵەمانیا پێیان وابوو خۆیان و کەسوکاریان لە کۆمەڵگەیەکدا دەژین، تارمایی خراپەکاری تەوقی داوە و بێبەشە لە مۆراڵ. لە ئەڵەمانیایەکی وەهادا ناوی «ئەدۆرنۆ» و «واڵتەربنیامین» و «ماکس هۆرکهایمەر» هیچ دەنگدانەوەیەکی نەبوو، چونکە ئەڵەمانەکان نەیاندەویست لە دنیا تێبگەن و بزانن چی رویداوە. لێرەوە گەنجەکان بە خۆیان دەستیانکرد بە پشکنینی روداوەکانی رابردوو. لەکاتی سەفەر و سەردانکردنیاندا بۆ ئەوروپا، گەنجانی ئەڵەمان روویان لە ناوچەی بیلۆ بۆنیزی یۆنانی کرد و لەوێدا زانیان نازیزستەکان تەواوی خەڵکانی ئەو گوندانەیان گوللە باران کردووە. هەروەها لە لەندەنیش کەسانێکیان بینی کە لە هۆلۆکۆستدا کەس و کاریان لەدەست چووە و خوازیاری ئەوەبوون لە لەندەن یان ئیسرائیل بژین و لەبری ئەڵەمانی (کە زمانی بکوژانی کەس و کاریانە)، بە زمانی ئینگلیزی قسان بکەن.

لە سەروەختی دادگایکردنی «ئەدۆڵف ئایخامن»، یەکێک لە بەرپرسە دەست رۆیشتووەکانی نازیزم لە سالآنی ١٩٦١-١٩٦٢و کەیسی ئۆشڤێتز لە فرانکفۆرت لە نێوان سالآنی ١٩٦٣-١٩٦٥، گەنجانی ئەڵەمان تێگەیشتن کە یاسا رەگەز پەرستانەکان و ناچارکردنی جولەکەکان بەوەی دەبێت ئەستێرەکەی داود لەسەر جلەکانی بەریان بێت، لەگەڵ رەوانەکردنیان بۆ کەمپەکان و بەتاڵانبردنی

موڵک وماڵاتەکانیان، سیاسەتگەلێکی ئاشکراو دیاربووە، واتە کەس و کاریان لێیان بەئاگابوون و شاراوە نەبووە لێیان. هاوکات لە فیلمی (پرد)ی دەرهێنەری نەمساوی «بێرنارد ویکی»دا کە باس لە دواساتەکانی رۆژانی شەڕەکات، بینیان چۆن چۆنی خەڵکی گوندێکی ئەڵەمانی ناڕازی نین لەوەی ئەو منداڵە تەمەن شانزە ساڵانانە بنێردرێن بۆ پاراستنی پردێک لە هاتنی هێزەکانی ئەمریکا و دواجاریش هەموویان تیادەچن. گەنجانی ئەڵەمانیا هەرکاتێک لە سینەماکان دەهاتنە دەرێ یان لە گەشتوگوزاری شوێنانی وەک یۆنان و لەندەن دەگەڕانەوە، لە کەس و کاریان دەپرسی: (لە رۆژانی شەڕدا چیتان دەکرد و ئەو رۆژانە ئێوە لەکوێ بوون؟)

نەوەی باوکان هەموویان خاڵێکی هاوبەش کۆی دەکردنەوە، ئەویش ملکەچکردن و گوێڕایەڵیکردن بوو بۆ رژێمی نازیزم و چاوپۆشیکردن لە تاوان و ناهەقیەکانی، لەگەڵ هێشتنەوەی دەسەڵاتەکان لەدەستی خۆیاندا و سەپاندنی دیسپلین و کۆنترۆڵێکی توند بەسەر منداڵەکانیاندا. ئەوان پەروەردگار و مامۆستا و خاوەنی دەسەڵات بوون. لەناو زانکۆکاندا مامۆستاکان نەیاندەزانی دنیا گۆڕاوە و ئەو شێوازی مامەڵەکردنە لەگەڵ خوێندکاران و ناچارکردنیان بە گوێڕایەڵیکردنی ئەوانەی لە خۆیان بەتەمەنترن، بۆتە شتێکی کۆن و وادەی بەسەرچووە. مەرجی سەرکەوتویی لە کارو پیشەدا (کە مەرجێکی تازەی ئەو قۆناغە بوو)، ئەوەی دەخواست هەرکەسەو خاوەن راو پێشنیاری خۆی بێت، تا بتوانێت لەکاتی پێویستیدا بڕیاربدات و هەماهەنگی لەگەڵ هاوکارەکانیدا بکات. لێرەوە خوێندکارانی زانکۆی بەرلین دەستیان بە دروستکردنی بزوتنەوەیەکی ئازادکرد، بۆ یاخیبوون لە باوان و کەس و کاریان. بەمجۆرە خوێندکاران پشتیان کردە نۆرم و بەهاکانی نەوەی پێش خۆیان و کەوتنە درێژکردنەوەی ردێن و بەردانەوەی پرچیان و گوێگرتن لە مۆزیکی جاز و لەپاڵ ئەوانەشدا داوای ئازادی سێکسیان دەکرد. لە گۆڤاری زانکۆشدا دەستیان بە نوسینی وتارگەلێکی رەخنەگرانە کرد. لە ناوچەی (برم) خوێندکاران لە دژی بەرزبونەوەی کرێی هاتوچۆ، خۆپیشاندانیان سازکرد و لە (هامبۆرگ)یش داوایان لە دەسەڵات کرد مافی بەشداریکردنیان بە رادەربڕین لە ئەنجومەنی زانکۆدا بۆ بسەلمێنێ.

رەنگە ئەم داواکاریانە سادە و منداڵانە بێنە بەرچاو، بەڵام لە سەرو توانا و تاقەتی کەس و کاریانەوە بوو کە بچنە ژێرباری و رازی بن پێیان. کەسوکاری ئەو خوێندکارانە لەئاست ئەو داواکاریانە تێیدا مابوون و هەوڵیاندا لەو رەفتارە ناچێزانەیان پەشیمانیان بکەنەوە، بۆ نمونە دایکی خوێندکارێکی وەک «بێرند لۆنکڤیتز» کەوتە شاردنەوەی ئەو کتێبە چەپڕەوانەی کوڕەکەی حەزی پێدەکردن و گرنگی پێدەدان. هەروەها باوکی هاوڕێیەکی «لۆنکڤیتز « دەستیکرد بە فڕێدانی و تورهەڵدانی کتێبە چەپڕەوەکانی کوڕەکەی لە پەنجەرەی ماڵەکەیەوە. لەم سەرو بەندەدا رۆژنامەکانی ئەڵەمانیا و بەتایبەت ئەوانەی سەر بە گروپی (شبرینگە) بوون، گوتارێکی توندیان دژی پەلاماردانی گەنجانی تورە و یاخی بڵاوکردەوە. ئەم گوتارەش بووە مایەی تەشەنەسەندنی بزاوتی یاخیبوون لە زانکۆکانی ئەڵەمانیادا و پەلهاویشتنی بۆ ناوەندەکانی دیکەی خوێندن، بەتایبەت قۆناغی ئامادەیی. لەگەڵ ئەمانەشدا گەنجان سەریانکردە سەر خوێندنەوەی کتێبەکانی بواری دەروونناسی و فەلسەفە و

سۆسیۆلۆگیا، بەو ئومێدەی رێنوێنیان کەن بەرەو گۆڕینی کۆمەڵگە و گەیشتن بە ژیانی راستەقینە. کتێبەکانی هەریەک لە «تیودرۆ ئەدۆرنۆ»و «هربرت مارکۆزە»یش لەناو گەنجاندا رەواجێکی زۆریان پەیداکرد و خواستێکی زۆریان لەسەر بوو. «مارکۆزە» پێیوابوو سستمی سەرمایەداری زەمینە بۆ ستەمکاری دەوڵەتی چاودێریکردن خۆش دەکات و مرۆڤی تاک رەهەند بەرهەم دێنێت.

شایەنی باسە دوو روداو بوونە مایەی ئەوەی بزاوتی خوێندکاران بەرەو توندڕەوی بڕوات، یەکەمیان کوشتنی «بینۆ ئۆهنسرۆگ» بوو بە دەستی پۆلیسێک لە خۆپیشاندانێکدا کە لە دژی سەردانێکی شای ئێران بوو بۆ ئەڵەمانیا لە ١٩٦٧/٦/٢دا، دووەمیان پەلاماردانی خوێندکارێک بە ناوی «رودی دۆچکە»و بریندارکردن بە گوللەیەک لە١٩٦٨/٤/١١ و دواتر گیان لەدەستدانی. رای گشتی و رۆژنامەکانی گروپی (شبرینگەر)، بەرپرسیارێتی هەردوو روداوەکەیان خستە ئەستۆی خوێندکاران. گروپی رۆژنامەکانی (شبرینگەر) لە ساڵی ١٩٦٧ شاڵاوێکیان لە دژی «دۆچکە» دەستپێکرد و وێنەیەکیان بۆ بڵاوکردەوە کە وەک «ئەدۆلف هتلەر» نیشانی دەدات. ئەم شاڵاوە وەک بانگەشەیەک وابوو بۆ تیرۆرکردن و تۆڵەکردنەوە لێی. رەوشەکە وەهای لێهات، وەک ئەوەی زەمانی نازیزم و تێرم و رەگەزپەرستیەکانی سەرلەنوێ زیندوو بوبنەوە، لەپای ئەو دەستدرێژیەی کرایەسەر «دوچکە»، نزیکەی پێنج هەزار خوێندکارێک لەبەردەم گروپی رۆژنامەکانی «شبرینگەر»دا دەستیان بە خۆپیشاندان کرد و هەوڵیاندا نەهێڵن گۆڤاری (بێڵد) دابەش بکرێت و بگاتە دەست خوێنەرانی.

«بومی بومان» دەڵێت: (وەکی تێکڕای خوێندکارانی دی، ژیانم بەم خۆپیشاندانەوە پەیوەست بوو کە تیایدا لێدانێکی مزرم خواردوو فەلاقە کرام). کارێک کە وایکرد پەیوەندی بکات بە ریزەکانی چەکدارە مەدەنیەکان و بزوتنەوەی دووی حوزەیران و خەباتی چەکداری.

## سەرچاوە:

ئەم وتارە بۆ یەکەمجارە لە بەرواری٢٠٠٨/١/٧ بەزمانی ئەڵەمانی لە رۆژنامەی (شتێرن)دا بڵاوکراوەتەوە و دەقی وەرگێڕانی عەرەبیەکەشی لە ٢٠٠٨/١/٢٣ لە رۆژنامەی (الحیاة) داگیراوە.

# پێکهاتەخوازی چییە؟

رابێرت ئیسکۆڵز
لە فارسییەوە: یونس ڕەزایی

## ئەلف/ پێکهاتەخوازی وەک بزوتنەوەیەکی زەینی:

گرنگترین تایبەتمەندی نیوەی دووهەمی سەدەی نۆزدەهەم و نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم دابەش کردنی زانستە بە لق گەلی جیاواز. ئەو لقانە تا ڕادەیەک پسپۆڕانە بوون کە وێدەچێ تێکەڵ کردنیان کارێکی ئەستەم بێ. تەنانەت فەلسەفە سوڵتانی زانستە ئینسانییەکان لە تەختی دەستەڵاتەوە کێشرایە خوارێ تا بە یارییە زمانیکانەوە دەگەڵ خۆی خەریک بێ. فەلسەفەی زمانی ویتگنشتاین و ئیگزستانسیالیزمی بیرمەندانی قاڕەی ئەوروپا هەمووان فەلسەفەی پاشەکشەن.[1]

فیلسووفەکانی زمان لەسەر ئەو بڕوایە جەختیان دەکرد کە زمانی ئێمە و دونیای دەوروبەری یەک ناخوێننەوە. ئیگزیستانسیالیستەکان باسی مرۆڤی گۆشەگیریان کرد، (مرۆڤێک) کە پێوەندی لەگەڵ شتەکان و تەنانەت مرۆڤەکانی تر پساندووە و لە بارودۆخێکی وجوودی پووچ دا ژیان دەباتەسەر. لەنیوەی سەرەتای ئەو سەدەیەوە لەت لەت بوونی مەعریفە و زانیاری لە ــ «وردەخوازی» لۆژیکی ڕاسێلەوەبگرەتا «هێلنجی» سارتر- بەسەر جیهانی بیر کردنەوەدا زاڵ بوو. تەنیا دژایەتی هاوئاهەنگ لە گەڵ ئەو بیرۆکە گشتییە لە لایەن فیلسووفە مارکسیستەکانەوە سەری هەڵدا: بۆ وێنە هێرشە مارکسیستییەکانی «جۆرج لۆکاچ» مرۆڤخوازی نەریتی بۆ سەر فەلسەفەی «مودێرنیستی» بەشێکی بنەڕەتی تێکۆشانی جۆراوجۆری ئیگزیستانسیالیستەکان بۆ تەباکردنی فەلسەفەکەیان دەگەڵ مارکسیسم پێدەبڕێ. (لە تێکوشانەکانی دواتر دەتوانین ئاماژە بە تەقەللاکانی سارتر مامۆستای تەبایی بکەین) یەکێ لە بەبڕشتترین ئەو هێرشانە لە لایەن مارکسیستێکی زانست خواز واتە کریستۆفێرکادۆلەوە گەڵاڵەکرا کە نیزامی پتەوی ماتریالیسمی دیالیکتیکی لە بەرابەر شتێک دا قوت دەکردەوە کە بۆ خۆی ئاوای وەسف دەکا:

«ئاڵۆزی پڕ لە پشێوی دۆزینەوەکان، فیزیکی ڕێژەیی، فیزیکی کوانتۆم، قوتابخانەی فرۆیدی، خەڵک ناسی، ژنێتیک، فیزیۆلۆژی دەروونی، کە لەسەر گریمانە گەلی لێک دژ دامەزراون و یەکتر رەت دەکەنەوە یا یەکتر وەبەر چاوناگرن.

بەبڕوای من پێکهاتەخوازی وڵامێکە بۆ نیازێک کە کادۆل لێرەدا باسی کردووە، نیاز بەسیستمێکی پتەو کە زانستە مۆدێرنەکانی یەکگرتوو بکا و بۆجارێکی تر جیهانی بۆ ژیانی مرۆڤ خۆش کرد. هەڵبەت ئەو نیازە، نیازێکی مەزهەبییە، دەتوانین مرۆڤ بە پێی پێداگری لەسەر بڕوایەکی باوەڕ پێکراو، باوەڕ پێکراو بە هەر پێوانەیەکەوە کە هەیەتی پێناسەبکەین. بە بڕوای کادۆل مارکسیسم وەها نیازێک بەراوردە دەکا. زۆربەی ئێمە لەو سەروبەندەدا، لە دیالیکتێک دا زۆر شت دەدۆزینەوە کە زۆر زیاتر لەوەی کە چاوەڕوان دەکرێ دڵخوازن: وەک ئیمانی زۆر بە مێژوو، نەبوونی زانستی تەواو لەمەڕ مرۆڤ و سروشتەوە.

مارکس وەک زانایەکی کۆمەڵایەتی و بە چەشنی فرۆید، گەنجێکی زۆری وەسەر زانستی ئێمە لەمەڕ رەفتاری مرۆڤەوە نا، بەڵام وەک بیرمەندێکی مەزهەبی ئیمانەکەی ئەوەندە پەرەدارو گشتی و زانستی‌نیە کە ئەمرۆکە ئۆخژنمان پێ بێنێ و رازیمان بکا.

مارکسیسم ئایدیۆلۆژیایە. پێکهاتە خوازی ئێستاکە رەوشتێکە کە دەروەستی ئایدیۆلۆژێکی نییە. بەڵام رەوشتێکە دە یهەوێ تێکڕای زانستەکان لە سیستمێکی بڕواییدا یەک گرتوو بکا. هەر بەو هۆیەشە کە دەروەستی‌یە ئیدئۆلۆژیکی‌یەکانی ئەگەرچی یەستا پێنەگەیشتوون بەڵام بە زەقی وەبەر چاودەکەون. لێرەدا دەمەوێ بچمەسەر سەرەتا و سەرچاوەکانی ئەندێشەی پێکهاتە خوازی: مارکسیسزم و پێکهاتەخوازی لە بابەخەکان دا هاوبەشن: دەتوانین ئەو بایخانە لە وڵامی ئەو فەلسەفانە بە بابەتەکانی زانیاری ناسی دابدۆزینەوە. بە تایبەت لە وڵامیاندا بۆ بابەتی پێوەندی زەینی مرۆڤ لەگەڵ سیستمی تێگەشتن و سیستمی زمانی خۆی و پێوەندی (مرۆڤ) دەگەڵ جیهانی بەرچاو. (ئەو هابەشی و نزیکایەتییە دەبیندرێ.)

کادۆل کە بەر لە تەمەنی سی ساڵی لە ئیسپانیا مرد و یەستا کەش وەک بیرمەندێک قەدری نەگیراوە، وڵامێکی پڕ بە پێستی دیالکتیکی بۆ بابەتەکانی پێوەندی داربە دوالیزمی زەین و مادەوە هەبوو. بە بڕوای ئەو بیرو مادە هەر دوو کیان قەدرو قیمتی راستی‌یان هەیە:

«بیر پێوەندی بە مادە وە هەیە؛ بەڵام ئەو پێوەندییە راستی‌یە، نەتەنیا راستی بەڵکوو شوێن دانەرو چارە نووس‌سازیشە، راستی‌یە چونکوو چارەنووس ساز و شوێن دانەرە، زەین کۆی پێوەندی‌یە چارەنووس سازەکانی مابەین مادە لە لەش و مادە لە تێکڕای جیهان دایە.[2]

سەیر ئەوەیە کە ژان پیاژەش بە شێوەیەکی زۆر نزیک لە شێوەی کادۆل ئەو بابەتەی لەروانگەی فیزیک و ماتماتیکی نوێوە توێژێوە. ئەو ئاماژە بە «تەبایی بەردەوام» و سەر سوڕهێنەری مابەین واقعی مادی و تیۆرییە ماتماتیکیەکان کە بۆوەسفی ئەو واقعە بە کار دەبرێن، دەکاو بەو ئاکامە دەگا کە:

ئەو هاوئاهەنگی و تەباییەی لە مابەین ماتماتیک و واقعیماددی لە ئارادایە، بەو چەشنەی کە پۆزیتویسم بڕوای پێیەتی، یەک گرتنەوەی زمانێک لەگەڵ شتە مەدلوولەکانی نییە. زمانەکان بە شێوەیەکی ئاسایی ئەو رووداوانەی وەسفیان دەکەن پێش بینی ناکەن؛ پرسی یەک گرتنەوەی هۆکارەکانی ئینسانی دەگەڵ شتی‌هۆکار و هاو ئاهەنگی ئەو هۆکارە تایبەتە –واتە مرۆڤ وەک لەش وزەین – دەگەڵ هۆکارە لە حیساب نە هاتووەکانی سروشت –واتە- شتە مادییەکان لە زۆرلایەنەوە-لە گۆڕێ دایە.[1]

«کلود لیڤی شتراوس»یش لە روانگەی خەڵک ناسانەی خۆیەوە هەر ئەو بۆچوونەی بە زمانی خۆی ئاوا دەربڕیوە:

یاساکانی بیر، جاچ سەرەتایی بن و چ ژیارمەندانە، هەر ئەو یاسایانەن کە لە واقعی مادی و واقعی

کۆمەڵایەتیدا باس دەکرێن.[٢]

کەواتە لە روانگەیەکی تایبەتەوە دەتوانین بڵێین کە مارکسیسم و پێکهاتەخوازی هەر دووکیان دژکردەوەیەکن لە ئاست نامۆیی و ناهومێدی مودێرنیستی. ئەو دوانە لە زۆر رووەوە دژوەستاون، بەڵام لە هەردووکیان دا روانینێکی زانستی بۆ جیهان لە ئارا دایە کە هەم لە خۆی دا واقعی‌یە و هەم بۆ تێگەیشتنی مرۆڤ لە بارە. مارکسیسم و پێکهاتەخوازی هەردووکیان شێوە روانینێکی «ئاوێتەگەرانە»[٣] و «گشتی[٤] بینن» لە هەمبەر جیهان و مرۆڤ دا. گەڕان بە دووی ئەو روانگانە دا یەکێ لە سەرەکی‌ترین بزاڤە فیکرییەکانی ئەو سەدەیەی پێکهێناوە. تەنانەت لەبەرهەماکانی ویتگنشتاین دا کە تا رادەیەکی زۆر نیسبەت بە بواروتواناکانی زانست رەش بین بوو، دەتوانین روانینێکی زاتە ن پێکهاتەیی، ئەگەر نەشڵێین پێکهاتە خوازانە، بۆ جیهان بدۆزینەوە. چونکوو پێکهاتە خوازی لە بەربڵاوترین واتای دا، رەوشتی گەڕان بەدووی واقعییەتە، ئەویش نەک لە شتە تاکەکان دا بەڵکوو لەپێوەندی نیوان ئەوان دا. بەوتەی ویتگنشتاین:

«جیهان کۆی ئەمرە واقیعەکانە[٥] نەک کۆی شتەکان و شتە راستی‌یەکانیش یانی بارەباوەکان:.

٢/٠٣١١١٢٢ لە بارێکی باودا شتەکان وەک ئاڵقەی زنجیر پێکەوە گرێدراون

٢/٠٣١١ لە بارێکی باو دا شتەکان پێوەندێکی بێ ئەملاو ئەولایان هەیە.

٢/٠٣٢ حاشاهەڵنەگربوونی پێوەندی شتەکان دەگەڵ یەک لە بارێکی باو دا – پێکهاتەی ئەو بارەباوەپێک دێنێ.

٢/٠٣٣ فۆرم رەخسانی پێکهاتەیە

٢/٠٣ پێکهاتەی شتێکی واقیع، لە پێکهاتەی بارەباوەکان ساز بووە.

٢/٠کۆی هەموو بارەباوەکان دەبێتە جیهان.[٧]

هەڵبەت دەبێ هەرکام لە بارەباوەکان نەک بەیەک وشە بەڵکوو بەرستەیەک دەربڕین. پشکنینی رستەکان کە بەردی بناخەی زمان ناسی مودێرنە، زمان ناسانێکی وەک «نۆوام چامسکی» بەو ئاکامە گەیاندووە کەتێکڕای مرۆڤەکان بە دڵ کەڵکەڵەی رێکخستنی تواناییەکانی زمانی خۆیانیان بە شێوەیەکی تایبەت هەیە. کەواتە هەموو مرۆڤەکان جۆرە «رێزمانێکی جیهانی» دەزانن کە دەستەڵاتیان دەدەاتێ هەتا هەرکام بە شێوەکی داهێنەرانە زمانی خۆی فێربێ و رستە گەڵی رێزمانی نوێ سازکا __ (تابەوشێویە) مەبەستەکانی پێوەندی خۆی بەرەو پێش ببا. «ئای ... ئەی ریچاردز» لە موتاڵا مانا ناسییەکانی دا لە وردەخوازای کتێبێ «مانای مانا» تێدەپەڕێ و شێوە بۆچوونێک لە مەڕ زمانەوە پەروەردە دەکا کە پێوەندی لەگەڵ روانگەی باسکراودا هەیە:

«بە کورتی (دەبێ بڵێم) شتەکان هەموویان بابەتگەلێکی سەربەیاسان. بە وتەی «بێردلی» «بیرهێنانەوە» تەنیا جیهانی‌یەکان پێکەوە گرێ دەدا و لە قووڵی ئەو یاسا یانەدا وێکچوونی پەیتا پەیتای ئاکار لەزەینی ئێمە و لە جیهان دا یە کە تان و پۆی مانا کانی ئێمە کە هەمان جیهانە دەتەنێ،[٨] نەک زیندوو کردنەوەی وێنەی ناڕاستی هەستە تاکە کەسی‌یەکان. «سوزان لەنگر» لە پانتای زانیاری ناسی دا دەسکەوتی نەریتی کانت کاسیرێر بە ناسینەوەی سەر لە نوێی. رۆڵێک دەزانێ کە نومادپەردازی یا دەربڕینی نومادین لە فۆرمۆڵ بەندی شتەکان، رووداوەکان و تەکوزی بەخشینی ئاسایی بە ئاقاری دەورو پشتی ئێمە وەک جیهان دەیگێڕێ.[٩] لە پانتای دەرون ناسی دا، دەرون ناسانی گێشتاڵتی، رێبەرایەتی شۆڕشێکیان لە تێگەیشتنی ئێمە دا سەبارەت بە تێگەیشتن و بیر کردنەوە وە ئەستۆگرت. (شۆڕشێک کە لە) سەربناخەی سەرەتی‌دانی «کۆ» بەسەر «ورد» لە پرۆسە زەینی‌یەکانی ئێمەدا دامەزراوە. «وڵفگانگ کۆهلێر» لە کتێبی «ئەرکی دەرون ناسی گێشتاڵت» دا بۆ سەلماندنی ئەو داوایە کە زانستە سروشتی‌یەکانیش لەسەدەی بیستەم دا

ئاوڕیان وە پێویستی بیرکردنەوە بە شێوەیەکی گشتیبین داوەتەوە قسەی فیزیک زانانێکی وەک «ماکسۆڵ» و «پلانگ» و «ئەدینگتۆن» دەکاتە پاڵپشتی گوتەکانی:

«دواتر کتێبێکم خوێندەوە کە داگری کۆی وتەکانی ماکس پلانک لە ساڵی ١٩٠٩ و لە شاری نیۆیۆرک بوو. پلانک لەیەکێ لە وتاردانەکانی دا لە مەر واتای «پڕۆسە نا گەڕانەوەیەکان» دەدوێ. واتایەک کە ڕۆڵی سەرەکی لە سەر ئەسڵی دووهەمی تێرمۆدینامیک هەیە . نووسەر هەر لەو بارەیەوە دەڵێ:

لە فیزیک دا بۆ باس و روون کردنەوەی پڕۆسەیەکی فیزیکی، ئەو پڕۆسەیە بە ماکە پێکهێنەرەکانی دابەش دەکەین. بۆچوونی ئێمە ئەوەیە کە هەموو پڕۆسە پێچەڵپێچەکان ئاوێتە یەک لە پڕۆسە ساکارە سەرەتاییەکانن، واتە ئەو کۆیانەی لە ئاستمان قوت بوونەوە، ئێمە وەک کۆی هەموو بەشەکانیان دەیان ناسین. بەڵام ئەو شێوە کارە لەسەر ئەو گریمانەیە دامەزراوە کە دابەش کردنی «کۆ» شوێنێک لەسەر چییەتی ئەو دانانێ. جا ئەگەر بمانەوێ هەربەو ڕەوشتە بپەرژێینە سەر« پڕۆسە- ناگەڕانەوەییەکان» ئەو «نەگەڕانەوەیە» لەکیس دەچێ. ناتوانین بە پێی ئەو گریمانە کە تاوتوێ کردنی تێکڕای تایبەتمەندییەکانی کۆیەک لە ڕێی مۆتاڵا و پشکنینی «وردە» کانییەوە مەیسەردەبێ، لەو بەشە لە گەڕیانەکان بگەین.

پلانک ئەو رستە سەرسوڕهێنەرە لە درێژەی قسەکانی دا دەڵێ: «بە بڕوای من، لە تاووتوێ کردنی ئەغڵەبی بابەتەکانی ژیانی زەینی دا لەگەڵ ئەوگرفتە دەستە و ئێخەدەبین»[10]

کۆهلێر دەڵێ: تەنانەت پڕۆسەکانی فیزیۆلۆژیکی مێشکی ئێمە بێ ئەملاو ئەولا «کۆگەلی کارکردی و خاوەن پێکهاتەن هەر بەو واتایەشەوە کە ماکسۆل، پلانک و بۆخۆم بڕوامان پێیەتی.»[11]

لە پانتای خەڵک ناسی دا، «کلۆدلیوی ئیشتراوس» بە جەختەوە دەڵێ «ئەو یەکانەی بەراستی ئووستورەیەک پێک دێنن — پێوەندی جیاجیا نین، بەڵکوو کۆمەڵێک لەو پێوەندییانەن و ئەو پێوەندییانەش تەنیا بەشێوەی دەستەیی دەتوانین دەکاربێنین و ئاوێتەیان کەین تا واتایەک بە دەستەوە بدەن.»[12] ئەو خەڵک ناسیش بە «تێۆری گشتی پێوەندی» دەزانێ.[13] بەپێی باسەکەی ئیشتراوس یاساگەلێکی گشتی بەسەرتێکڕای پڕۆسە زەینییەکانی مرۆڤ دا حاکمن، کە بەروونترین شێوە لە کارکردی نومادینی مرۆڤ دا دەدرەوشێنە وە و خۆدەردەخەن. بە بڕوای لێوی ئیشتراوس تەنانەت زەمیری ناخۆئاگاش بە پێی ئەو پێناسەیەی لە دەرونشیکاری دا بۆی کراوە ئەمڕۆ کە ئیتر دوایین داڵدەی و ئامانجی تایبەتمەندییەکانی تاکە کەس نییە — واتە گەنجینەی مێژووچەیەکی تاقانە کە دەبێتە هۆی ئەوەی هەرکام لە ئێمە ببینە کەسێکی بێوێنە . دەتوانین زەمیری ناخۆئاگا تا رادەی کارکردێک بەرتەسک کەینەوە — کارکردێکی نومادین کە بێ شک تایبەتی مرۆڤە و تەبا دەگەڵ یاساگەلێکی هاوشێوە لە مابەین تێکڕای مرۆڤەکان دا بەڕێوە دەچی و لەگەڵ هەموو ئەو یاسایانە یەک دەگرێتەوە .[14]

لە پانتای ڕەخنەی ئەدەبی دا، فۆڕمالیستەکانی رووس و میرات گرە پێکهاتەخوازەکانیان حەولیان داوە هەتاکوو ئەسڵە گشتییەکانی حاکم بەسەر کاربردی ئەدەبی زمان، لە سینتاکسی ساختومانی داستانەوە بگرە تا قاڵبەکانی شێعر بدۆزنەوە . بەو شێوەیە بیرکردنەوەی پێکهاتەیی هەلی بۆ خۆیا بوونی واتە گەلێکی وەک «تەکووزی وشەکان»ی نۆرترۆپ فرای و «ڕێسای ئەدەبیات»ی کلۆدیۆگلین ڕەخساند. بەڵام پێکهاتە خوازی ناوەندی کردەوەکانی خۆی لە موتالای زمانناسی دا دۆزیوەتەوەو بەشی گەورەی هێزی بزوێنەری خۆی لە دەسکەوتەکانی «سۆسۆر»، «یاکوبسن» و توێژەرانیکی وەک «ترۆبتسکۆی» واج ناس گرتووەکە ساڵی ١٩٣٣ دەسکەوتی لقی توێژینەوەیی خۆی ئاوا گردوکۆ دەکاتەوە:

«گرینگترین تایبەتمەندی واج ناسی ئەمڕۆکە پێکهاتەخوازی و کۆی ڕێسامەندێتی. تایبەتمەندی سەرەکی چاخێک کە ئێمە تێی دا دەژین داگەڕانی تێکڕای لقەکانی زانستە بەرەو ئەو شوێنەی کە پێکهاتەخوازی

بکاتە جێنشینی وردە خوازی و گشتێتی بکاتە جێنشینی تاک خوازی. (هەڵبەت بە واتا فەلسەفی‌یەکەی ەوەە. ئەو شێوە داگەڕانە دەتوانین لە فیزیک، شیمی، ژیوناسی، دەرون ناسی و ئابووریش دا ببینینەوە. کەواتە ئەمڕۆکە واج تاسی تەنیا نیە و لە بزوتنەوەیەکی زانستی بەر بڵاو دا جێی خۆش کردووە.[15]

ئەو جوڵانەوەیەی ترۆبتسکۆی ئاماژەی پێدەکا تایبەت بەزانستەکان نییە، بەڵکوو کاریگەری لە هونەرەکانیش دا هەبووە، چونکوو بزوتنەوەیەکی زەینی گشتگیرە، یەکێکە لەو بزاڤە فیکریانەی جاربە جار تێکڕای کولتوورێک دادەگرێ و دەگەڕێ و پرش وبڵاوترین ماکەکانی ئەو بزاڤە بەرەو شوێنێکی تاک پەلکێش دەکا. شوێن دانانی ئەو بزوتنەوەیە لە ئەدەبیات دا و هەروەها تاوتوێ کردنی ئەدەبی، مەبەستی سەرەکی باسی ئێمە لەو کتێبەدا پێک دێنێ.

## ب/ پێکهاتە خوازی وەک رەوشتێک:

واباشە لێرەدا دوو گوتە لەمەڕ رەخنەوە بێنینە بەرباس:

منیش وەک هەمووان لە سەر ئەو بڕوایەم کە مەبەستی رەخنە گەیشتن بە ناسینی ورد و نزیکی راستینەی رەخنەگرانەیە. بەڵام بە بڕوای من ئەو نزیکایەتی‌یە تا ئەو رادەیە مەیسەرە کە بیری رەخنەگرانە ببێتە بیرێک کە (خۆی) رەخنەی لێگیرابێ. ئەوەش ساتێ دەلوێ کە ئەوبیرە سەرلەنوێی لە دەروونەوە هەست پێ بکرێ، دووبارە بیری لێ بکرێتەوەو لە خەیاڵدا بزرینگێتەوە. هیچ شتێ ناتوانێ کەمتر لە و بزوتنەوەیەی زەین بەرچاوبێ.

رەخنە بە پێچەوانەی ئەوەی چاوەڕوان دەکرێ، دەبێ خۆی لە دیتنی جۆری شت کان ببوێرێ. (جا ئەو شتە چ خودی نووسەربێ کە وەک «ئەویتر» دێتە بەرچاو، چ بەرهەمەکەی بێ کەئەویش هەر وەک «شت» لەبەرچاو دەگیرێ.) چونکوو ئەوەی کە دەبێ پێی‌بگەین زەینە، واتە چالاکی‌یەکی واتاییکە ناتوانین تێی بگەین مەگر ئەوەی خۆمان لە جێی ئەو دابنێین و کارێک بکەین تا جارێکی تریش لە دەروونی ئێمەدا رۆڵی خۆی وەک زەین ببینێ.[16]

ئەو رەخنە نێوان زەینی‌یە[17] کە لە بەرهەمەکانی «ژۆرژپوولە» دا بە شێوەیەکی زۆر لەبار دەخرێتە روو، سەر بەو جۆرە لێکدانەوەو تەفسیرەیە کە «پۆل ریکۆر» بەشوێن وەرگرتن لە «دیلتای» و چەندکەسێکی‌تر، بۆ وێنە «ئیسپیتزێر» بە هێرمێنۆتێکی[18] ناودێر دەکا. واتای بەرهەمێک لە رێی رنجیرە کردارێکی فیکرییەوە وەرناگیرێ، ئەو واتایە وەک پەیامێک وەردەگیرێ و «دەدۆزرێتەوە» کە هەم زۆر کۆنەو هەم یەکجار نوێی کراوەتەوە. لە لایەکی‌ترەوە قسەی تێدانییەکە رەخنەی پێکهاتەیی دەستەو داوێنی هەمان «عەینی خوازی» دەبێ کە پوولە مەحکوومی دەکا، چونکوو نە زاتی وشیاری داهێنەرو نەزاتی وشیاری رەخنەگرانە، پێکهاتەکان ناژین.[19]

«ژێرارژنێت» لە گێڕانەوەی گوتەی دووهەم دا درگای باسێک لە مەڕ ئەو ئیدانەوە کە لە بەشی وەرگیراو لە پوولە خراونەتە روو دەخاتە سەر پشت. ئەو لە درێژەی وتەکەی دا وەبیرمان دێنێتەوە کە ئەگەر پوولە بوایە رنگە پێکهاتە خوازی بەوە تاوانبار کردبا کە دەگەڵ دەقە ئەدەبی‌یەکانی رەفتارێکی «بەرتەسک کارانەی» هەیە و بۆ دۆزینەوەی چواچێوەکەیان جومگەو ئێسقانەکەیان عەکسبەداری دەکاو لە گۆشت و خوێنیان خافڵ دەبێ. لە روانگەی پوولەو ریکۆر و بە گشتی رەخنەی هێرمێنۆتیکی‌یەوە (لە هەر جێیەک کە دۆزینەوەی هێرمنۆتیکی واتا بە مەبارەکی یەک گرتنەوەی شهوودی دوو زاتی وشیار مومکین و لوابێ، لێک دانەوەی پێکهاتەیی (لانی‌کەم تا رادەیەک) نا مەشرووعەیا هیچ هەمێتێکی نییە و بە هێندناگیرێ.»[20]

ئەگەر وەشوێن ئەو هێڵە فیکری‌یە بکەوین، دەتوانین خوێندنەوەی ئەدەبی بەسەر دو بەستێن و بە دوو

دەستە، دابەش بکەین کە لە کارکردنی‌یە کێک لەو دوو جۆرە رەخنەیە لە سەر هەر کام لەوانە مەشروع و رەوادەبێ. رەخنەگری هێرمێنۆتیکی دەگەڵ ئەدەبیاتی «زیندوو» سات و سەودای دەبێ و رەخنەگری پێکهاتە خواز دەگەڵ ئەدەبیاتێک بە رەهەندی شوێن و کاتی (جیاوازەوە) پێوەندی هەیە. (پێوەندی لەگەڵ ئەدەبی منالان، ئەدەبی رەشۆکی و خەڵک پەسند هەیە کە داگری قاڵب گەلێکی نوێی وەک میلودرام و رۆمان گەلێکی درێژە دارە کە رەخنەی ئەدەبی سەرجەم ئەوانە نە تەنیا لە بەر دەمارگرژی ئاکادیمیک بەڵکوو بەو هۆیە کە هاوبەشی نێوان زەینی نە دەتوانێ ئەو جۆرە تاو توێ کردنە وەگەڕبخا ونە توانای رێبەرایەتیشی هەیە پشت گوێ دەخا، کەچی رەخنەی پێکهاتەیی دەتوانێ لە روانگەی خەڵک ناسی‌یەوە ئەو شتانە تاوتوێ بکا، بارستای گەورەی ئەو شتانەو کارکردەکانیان موتالا بکا و بەسەر رێیەک دا هەنگاو هەڵگرێ کە پێشتر کارناسانی فەرهەنگی خەڵکی رەشۆکی وەک «پراپ» و «ئیسکا فتیمۆف»، بەسەری دا رۆیشتوون.[21]

ژنێت ئەو حەولە مەسڵەحەتی‌یە بە شەرت و بەڵێنەوە قەبووڵ دەکا، بەڵام دواتر وەبیر دێنێتەوە کە مەودای ئێمە لەگەڵ زۆربەی دەقە مەزنە ئەدەبی‌یەکان زۆر زیاتر لەوەیە کە رەخنەگران دانی پیادەنێن و دەکار کردنی شێوازای پێکهاتەیی لەسەر ئەو بەرهەمانە بۆی هەیە زۆر سەرکەوتووتر بێ لەو شێوازەی کە بە بەدیهێنانی پێوەندێکی نزیک لەگەڵ بەرهەم، بەهەڵە (بەرهەمەکە بە خوێنەر) دەنوێنێ. دواتر بە سرکە بە گویمان دا دەچرپێنێ کە ـ ئەوەی لە بەردەممانداییە، هەلی هەڵبژاردن لە نێوان شێوە جۆراوجۆرەکان دانییە کە سروشتی دەق گەلێکی تایبەت بۆمان دەرەخسێنێ، بەڵکوو داگری هەڵبژاردنێکە لە نێو ئەو رەوشتانەی کە دەبێ بە پێی پێوەندیمان لەگەڵ ئەو دەقە تایبەتە و ئەو شتانەی دەبێ لەمەڕ دەقەوەبیزانین رەچاوی بکەین. ئەو بۆ گەیشتن بەو مەبەستە گوتەی مێژلۆپۆنتی لە مەڕ بابەتی گەل ناسی‌یەوە، وەک لقێکی زانستی وەبیر دێنێتەوە و دەیخاتە بەر دەممان، هەر بەو شێوەیە بەخشکە وامان پێ دەنوێنێ کە دەتوانین گوتەکانی «مێژلۆپۆنتی» لە مەڕ پێکهاتە خوازییەوە وەک رەوشتێک بناسین.

ناتوانین گەل ناسی وەک لقێکی زانستی پێناسە بکەین کە دەگەڵ بەرچاوێکی تایبەتی کۆمەڵە سەرەتاییەکان سات و سەودای هەیە؛ گەل ناسی شێوە بیر کردنەوەیە کە کەساتێ «ئۆبژە» ئەویترە و وا هەڵدەگرێ خۆمان بگۆڕین بە سەرمان دادەسەپێ. کەواتە ئەگەر لە کۆمەڵی خۆمان دوور کە وینەوە، هەردەبینە گەڵ ناسانی کۆمەڵی خۆمان[22]

لەو روانگەیەوە، پێکهاتە خوازی و هێرمنۆتێک ئیتر رووبەرووی یەک نابنەوە و جیهان بە سەر زات گەلێک دابەش نابێ کە تەنیا لە پاوانی ئەم تاقمە یا ئەو تاقمەی تردابێ؛ ئەو دووانە پێوەندییەکی تەواوکەری یەک لەبەینیان دا بەدی دێ و دەتوانن بەشێوەیەکی بەکەڵک بە بەرهەمێکی تاقانەوە خەریک بن و دەلالەت گەلێکی تەواو کەری لێ هەلێنجن. کەواتە، رەخنەی ئەدەبی نابێ لەفێر بوونی ئەو شتانەی پێکهاتە خوازی پێی دەڵێ خۆ ببوێرێ، تەنانەت دەتوانێ لەمەڕ ئەو بەرهەمانەی کە بۆمان نامۆنین بەبەدیهێنانی مەوداو مۆتالای بەرچاوی کارکردی ئەو بەرهەمانە شتمان فێرکا.

ژنێت ئەو بەشە لەباسەکەی خۆی بەوەبیرهێنانەوەی ئەو خاڵە کۆتایی پێ‌دێنێ کە لەراستی دا ئێمە ناتوانین لەبارودۆخی تایبەتی ـــ مەسەلەن ـــ رۆمانی ئیستاندالی بگەین بێ ئەوەی تا رادەیەک لەکەش و هەوای خەیاڵینی رۆمان وەک بوونێکی گشتی مێژوویی و سەر و مێژوویی* گەیشتبێتین. هەڵبەت ئەو بابەتە زیاد ناکاو من پێوەی دەنێم کە : «زەینی بوون»ی رەخنەی هێرمنۆتیکی هەرگیز ناتوانێ تەواو زەینی بێ.

رەخنەگرێک کە واتای بەرهەمێکی دیاریکراو «دەدۆزێتەوە»، بەردەوام ئەو کارە بە رێکخستنی پێوەندی لە نێوان بەرهەم لەگەڵ سیستەمی ئیدەکانی دەرەوە بە ئاکام و ئەنجام دەگەیەنێ. بۆی هەیە ئەو سیستەمە

بیرۆکەیەک بێ لەمەڕ مرۆڤەوە، یا وەک باسەکەی پوولە بیرۆکەی «زەمانی مرۆڤ» بێ، بەڵام لەهەر حاڵدا دەبێ بیرۆکەیەک بێ کە بتوانێ پاسا و بۆ ئامادە بوونی رەخنەگر بێنێتەوە . بە تەنیا خولقاندنەوەی بەرهەم، هەروەک تۆدۆرۆف لە وتاری پێکهاتەخوازی چییە؟ دا دەڵێ: هەردەبێتەوە دووپات کردنەوەی وشەکانی بەرهەم بە شێوەی پێشوو.

لێکدانەوە هەرچەندەش زەینی بێ، دەبێ بەهێنانی شتێک لەدەرەوەی بەرهەم بۆ ناو بەرهەم بوونی خۆی پاساوبدا.* تەنانەت ئەگەر ئەوشتە دەرەکی‌یە زەینیەتی رەخنەگریش بێ کە لەگەڵ زەینیەتی هونەرمەند جیاوازی هەیە . هەر بەو هۆیەشە هونەرمەندان زۆرکەم خەریکی لێکدانەوەی بەرهەمەکانی خۆیان دەبن، ئەگەریش خۆیانی پێوە سەر قاڵ کەن بەدەگمەن ئاکامێکی باش وەدەست دەخەن. «دۆزینەوەی» هێڕمنۆتیکی مانا ئەغڵەب حەکایەتی تێکۆشانی رەخنەگرە بۆ دیتنەوەی مانا. ئەو چالاکی‌یە رەنگە سرنج راکێش، زانایانە، ناسک و رۆشنگەرانەبێ و تەنانەت خودبە خود جۆرێک ئەدەبیاتی لاوەکی بەدیبێنێ. بەڵام هۆیەکی نییە کە لە نێو چالاکی‌یە مومکینەکان دا، زەینی رەخنەگرانە شوێنێکی بەرز و شیاوتری هەبێ.

بەڵام پێکهاتە خوازی دەتوانێ لە خوێندنەوە ئەدەبی‌یەکان دا خوازیاری پلەو پایەیەکی مەزن بێ. چونکە بە شوێن ئەوەوەیە ئولگوویەک کە لە خودی ئەدەبیات هەڵقوڵاوە وەک سەرچاوەی دەرەکی ئەو بەرهەمانەی دەیانتۆژێتەوە بەدەستەوەبدا. پێکهاتەخوازی بەجووڵان لە خوێندنەوەی زمان بەرەو خوێندنەوەی ئەدەبیات و حەول بۆ پێناسەی بنەما گەلێکی پێکهاتە خولقێن، کە نە تەنیا لە بەرهەمە تاکەکان دا بەڵکوو لە پێوەندی نێوان بەرهەمەکان لە تێکڕای پانتای ئەدەبیات دا حەول دەدەن و تێدەکۆشن، لە سەر ئەوە سووربووە و سوور هەیە کە لە بارترین و زانستی ترین بناخەی مومکین بۆخوێندنەوەی ئەدەبی دابڕێژێ.

مەبەستم ئەوەنییە کە بڵێم ئەوەی تاکەکەسی و زەینی‌یە نابێ شوێنێکی لە خوێندنەوە ئەدەبیەکان دا بۆلەبەرچاو بگرین. تەنانەت لە زانستە سروشتی‌یەکانیش دا دەتوانین نموونەی جۆراوجۆر لەکردەی هەڵکەوتەیی* زەینی بدۆزینەوە، بەڵام بۆ ئەوەی ئەوکارە زۆرترین بەرهەمی لێ بکەوێتەوە، دەبێ چوارچێوەیەکی فیکری سازبکرێ هەتا لەسەر بناخەی ئەو چوارچێوەیە شکڵ بگرێ. لە دڵی ئیدەی پێکهاتەخوازی‌دا، ئیدەی سیستم خۆی مەڵاس داوە: بوونێکی کامڵ و خورێکخەر کە بە گۆڕینی تایبەتمەندییەکانی لەگەڵ پاراستی پێکهاتەی سیستماتیکی خۆی، خۆی لەگەڵ بارودۆخی تازە رێک دەخا. دەتوانین بەو ئاکامەش بگەین کە هەر یەکەیەکی ئەدەبی لە رستەیەکەوە بگرەتا تەکووزی تێکڕای وشەکان، دەگەڵ واتای سیستم پێوەندییان هەیە . بە تایبەت دەتوانین بەرهەم گەلی جودا، جۆرەکانی ئەدەبی و گشت ئەدەبیات بە سیستم گەلێکی پێوەندی‌دار بزانین و ئەدەبیاتیش بە سیستمێک بزانین کە لە نیزامی گەورەتری فەرهەنگی بەشەری دا جێی خۆشکردووە .

دەتوانین پێوەندی بە دیهاتوو لە مابەین هەر کام لەو یەکە سیستماتیکانەوە بخوێنینەوەو ئەو خوێندنەوەیەش بەواتایەکی پێکهاتەگەرانەوە شکڵ دەگرێ. مەترسی‌یەک کە لێرەدا لە گۆڕێ دایە و پێکهاتە خوازانێکی وەک «ژنێت» بە باشی ئاگایان لێیەتی، فەڕزکردنی پێگەیشتوویی* سیستماتیکی‌یە ئەویش لە شوێنێک کە وەها پێگەیشتوویی‌یەک بوونی نییە . یەکێک لە گەورەترین گرفتەکان لە پێکهاتە خوازی ئەدەبیات دا ناسین ولێک جودا کردنەوەی هۆگری و داگەڕان بەرەوسیستم و شکست لەگەیشتن بەسیستمە-(بە تایبەت لە ئاستی بەرهەمی تاک دا ئەو قسەو باسە وەڕاست دەگەڕێ). ژنێت بە دەنگێکی دلێرتر لەهەموان ئەو مەترسی‌یەی لە قاو داوە کە مەبادا بۆ خوێندنەوەی سیستماتیکی بەرهەم گەلی ئەدەبی ئەو بەرهەمانە بەشت گەلێکی «داخراو*» و «کۆتایی پێهاتوو» بزانین.

مەترسی یەکی تر کە لە بەردەم پێکهاتەخوازی دا قوت بۆتەوە دەتوانین بە «هەڵەی فۆڕمالیستی» ناو

دێرکەین. چونکوو پێوەندی بەو سەر کۆنەیەوە هەیە کە ئاراستەی فۆرمالیسم دەکرێ (هەڵبەت) فۆرمالیستە رووسەکان، بە تایبەت لە چاخی هەڵپەو هەڵچوونی سەرەتایی خۆیان دا جارجار موستەحەقی (ئەو سەر زەنشتانەش بوون) هەڵەی فۆرمالیستی پشت گوێ خستنی «مانا[٢٣]» یا «ناوەرۆک[٢٤]»ی بەرهەمی ئەدەبی‌یە. ئەو تاوانەش زۆرتر دەدرێتە پاڵ رەخنەیەک کە دان بە بوونی جیهانێکی فەرهەنگی لە پشت بەرهەمی ئەدەبی و هەبوونی سیستمێکی فەرهەنگی لەو دیو نیزامی ئەدەبی‌یەوە دانانێ. لێرە دا دەبێ دان بەوە دابێنین کە وەسفی فۆرمی رووتی بەرهەم گەلی ئەدەبی و نیزام و سیستمەکانی ئەدەبی بە شێکی گرینگی رەوشتی کاری پێکهاتە خوازی‌یە. بەڵام هەڵە لەوەدانیە کە ناچارین رووبەرگەلێکی* تایبەت لەو بابەتانەی دەخوێندرێتەوە لە شتەکانی تر هەڵاوێرین* هەڵە لە نامۆیی کردن و دان پێدا نەهێنان بەو راستی‌یەدایە کە ئەو رووبەرانە تەنیا رووبەر گەلێکی تاقانەنین، یا لە پێ داگری لەسەر ئەو بابەتەیە کە ئەو رووبەرانە لە سیستمێکی تەواو داخراودا ئیش دەکەن، بەبێ ئەوەی شوێن لە جیهان و ئەو پەڕی ئەدەبیات وەربگرن. پێکهاتە خوازی، ئەگەر بەراستی وەربگیرێ نەتەنیا لە زیندانی فۆرم دا نابەستریتەوەو لە جیهان هەڵنابرێ، بەڵکوو بە پشکنین و گەڕان لەچەندین رووبەری جیاوازدا، راستە و خۆ دەگەڵ جیهان بەرەو روو دەبێتەوە.

پێکهاتە خوازی بە تایبەت بە شوێن دۆزینەوەی پێوەندی سیستمی ئەدەبیات لەگەڵ فەرهەنگێکە کە ئەو سیستمە بەشێکە لەو فەرهەنگە. ئێمە تەنانەت ناتوانین «ئەدەبییەت[٢٥]» پێناسە بکەین مەگەر ئەوەی کە لە بەرامبەر «غەیرە ئەدەبییەت» دا قوتی کەینەوە و بیوەستێنین. هەر وەها دەبێ ئەوەش بزانین کە پێوەندی ئەو دوو کارکردە پێوەندییەکی نابەردەوامە کە هاوڕێ و هاو هەنگاو لەگەڵ کار کردەکانی تری فەرهەنگێکی دیاری کراو لە گۆڕان دایە. بە گوتەی ژێنێت، فەرهەنگێک «هەر بەو رادەیەی لە نووسراوەدا دەرەوشاوە دەبێ لە خوێندنەوەشدا دەدرەوشێتەوە[٢٦]» دواتر (بۆ سەلماندنی ئەو بابەتە) قسەیەکی بۆرخێس بە شاهید دێنێتەوە (بۆرخێس دەڵێ): «ئەگەر بمتوانیبا هەر لاپەڕەیەک کە ئەمڕۆ دەنووسرێ __ تەنانەت ئەو لاپەڕە حازری‌یە__ وەها بخوێنمەوە کە لە ساڵی ٢٠٠٠ دا دەخوێندرێتەوە ئەدەبیاتی ساڵی دوو هەزارم دەناسی[٢٧] بۆرخێس وەک هەمیشە بە شێوەیەکی لەبەر دڵان کە تایبەتی خۆیەتی زێدەڕەوی کردووە. بەڵام واتای شاراوە لەو زێدەڕەوییەدا هەر راست ئیدەی سیستمە لە پێکهاتە خوازی دا، کە لەو دا تێکڕای ماکەکان پێوەندییەکی دوو لایەنەیان هەیە، کەوایە دەتوانین لە هەر نموونەیەکی مانادار دا ئەو شتانە هەڵێنجین. ئەوەش کە تەنیا لاپەڕەیەکی یەک نموونە مانادار نییە، گەمەیەکی بۆرخسیانەیە کە ئەو ئیدەیە لەو دا هەندێک گەورە کراوەتەوە. تەنات دەتوانین ئەو ئیدەیە کەمێک زیاتریش درێژە بدەین و بڵێین لە شێوەی خوێندنەوەی دەقێکی تایبەت لە لایەن فەرهەنگێکی تایبەتەوە، دەتوانین شتێکی فرەتر لە ئەدەبیاتی ئەو فەرهەنگە و دەست بێنین __ بێ ئەوەی بەو قسانە رێی خۆمان لە پێکهاتە خوازی هەڵاوێرین.

پێکهاتە خوازی لە ئاستی دەقە تاکە کان دا هەر کاتێک کە رووبەرێکی مانایی هەر کام لە تایبەتمەندییەکانی دەق دەتوێژێتەوە دیسانەوە لەگەڵ جیهان رووبەروو دەبێتەوە. لە هەندێ لە لێکۆڵینەوەکان دا بۆی هەیە رەخنەگرانێک بە شێوەی تاکە کەسی بەو بڕوایە بگەن کە لە قەدەر توانای خۆیان ئەو رووبەرە لەبیر بەرنەوە هەتا بتوانن تایبەتمەندییەکانی ترجیا بکەنەوە ولێکیان هەڵاوێرن. هەر وەها بە بڕوای من جاری وایە رەخنەگرانی فۆرمالیست و پێکهاتە خواز وایان نواندووە کە دەتوانن مانا ناسی ئەدەبیات زیاتر لەوەی کە چاوەڕوان دەکرێ لە بیر بەرنەوەو ئاکام دەبێتە ئەوەی کە مانا و بایخ گەلی مانا ناسی ئەغلەب بە پێدزەیا بێ هەواڵ دەخزێنە نێو لێکدانەوە کانەوە. بەڵام چون زمان ناسی کە دایکی تیۆری ئەدەبی پێکهاتە خوازی‌یە، یەستاش دڕدۆنگی لە رۆڵی ماناناسی بۆ وەسفی زمان ناسی دەکا. هیچ جێی سەرسوڕمان نییە

کە لە پێکهاتە خوازی ئەدەبیش دا ئەو دڕدۆنگی‌یە لە پەرژانە سەر ئەو شێوازە بە چاوی خۆمان ببینین. سەرە ڕای هەمووی ئەوانە ڕەخنەی پێکهاتەیی ئەو کەمایەسی‌یەی بووە و وەبەرچاونەگرتنیشی هەڵەیەکی کە ڵەیە. چونکوو هەر ڕاست لێرەدایە کە ڕەخنەی ئەدەبی دەتوانێ لەمەڕ کار کردی زمانەوە گەنجێک وەسەر (خەرمانی) زانستی زمان ناسی بنێ.

**فەرهەنگۆک:**

وردە خوازی=ذرە گرایی، اتمیسم
هێڵنج= تهوع
دۆزینەوە= کشف
فیزیکی ڕێژەی= فیزیک نسبیت
خەڵک ناسی= مردم شناسی
گریمانە= فرض
بڕوایی= عقیدتی
بایخ= ارزش
زانیاری ناسی= معرفت شناسی
تەبایی بەردەوام= سازگاری مدام
ژیارمەندانە= متمدنانە
باری باو، دۆخی هەنووکە= وضع موجود
ڕێکخستن= سازمان
تەکووزی وشەکان= نظم کلمات
ڕێسای ئەدەبیات= قاعدە ادبیات
ڕێسامەند= قاعدەمند
داگەڕان= گرایش
گشتێتی= کلیت
ژیوناسی= زیست شناسی
گشتگیر= عمومی
ماکە= عنصر
ئەویتر= دیگری
شت= شئ
نێوان زەینی= بیناذهنی
بەرتەسک کارانە= تقلیل گرایانە

هەمێت= اهمیت- ارزش

دەمارگرژی= تعصب

بارستا= حجم

سەرومێژوویی= فرا تاریخی

پاساودان= توجیە کردن

هەڵکەوتەیی زەینی= نبوغ ذهنی

پێگەیشتوویی= کمال

دەقی داخراو= متن بستە

رووبەر= وجە

کۆ= کل

ورد= جزء

گشتێتی= کلیت

چییەتی= ماهیت

رەخنەگرانە= انتقادی

پرس=قضیە

ناگەڕانەوەیی= برگشت ناپذیری

پرۆسەی ناگەڕانەوەیی: (فرایند برگشت ناپڒیر) = لە زانستە سروشتییەکاندا هەندێک پرۆسە هەن کە بە دوو شێوەی پێچەوانە دەرەتانی روودانیان هەیە، بۆ نموونە ئەگەر دوو ماکەی ( Aو B) تێکەڵ بن و ماکەی (C) پێک بێنن پرۆسەی خوارەوەمان دەبێ (A+B=C) جا ئەگەر پرۆسەکە بە شێوەیەکی تریش واتە (C=A+B) رووبدا، دەڵێین ئەم پرۆسەیە گەڕانەوەییە، ئەگینا وەکوو پرۆسەیەکی ناگەڕانەوەیی چاوی لێدەکەین. «وەرگێڕ»


1. Philosophy of retreat
2. stucturalisn, pp.40-41
3. les structures elementaires de la parente, p.591, Auzias, clefs pour le structuralisme, p.25
4. intergrative
5. holistie
6. faets
7. tractatus logico- philosophicus, london 1953
8. philosophy of rhetic, N.Y, 1965, p.36
9. philosophical sketches, N.Y, 1964, p.59
10. the task of gestalt psuchology, prnceton, 1969,pp.61-62

11. ibid., p.93
12. structural Anthropology, Garden cithy, N.Y., 1967.p.207
13. ibid.,p.95
14. ibid., p.198
15. emile benveniste, problems in Genral Lingaistics.p.82
16. george poulet, les letters nouvelles, 24 June 19459, gerad Gentte, Figures. P.158
17. intersubjective
18. hermeneutice
19. figures.p.158.
20. ibid., p.159
21. ibid., pp. 159-160
22. signes, p.151., Figures, p. 161
23. meaning
24. content
25. literanimess
26. figues , p.169
27. Enque tes, p.224, Figures. P.164

## ژێدەر:

درآمدی بر ساختارگرایی در ادبیات، اسکولزرابرت، ترجمە فرزانە طاهری، نشر آگە، ١٣٧٩.

# ئایین و نوێگەری

مستەفا مەلەکیان[1]
لە عەرەبییەوە: یاسین عومەر

ئێمە، بمانەوێت یان نا، خەڵکێکی هاوچەرخین و ئەهلی مۆدێرنەین، جا چ وتبێتمان مۆدێرنە خەسڵەتی تاکەکانی مرۆڤە، یان خەسڵەتی کۆمەڵگە مرۆییەکانە، یاخود خەسڵەتی قۆناغە زەمەنییەکان و سەردەمەکانە. بێگومان مۆدێرنە پلەو ئاستی هەیە، ڕەنگە من مرۆڤێکی مۆدێرن بم بەڵام تۆ لە من مۆدێرنتر بیت، ڕەنگیشە هەبێت لە هەردوکمان زیاتر ئەم خەسڵەتەی بەدەستهێنابێت. هەر لەم مونتەڵەقی پلەو ئاستەوە دەکرێت قسە لەبارەی مۆدێرنەیەکی کەم و کورت و مۆدێرنەیەکی تێروتەسەل بکرێت، بگرە لەتواناماندایە نمونەیەکی باڵاتر (pattern) بۆ مۆدێرنە گریمانە بکەین کە هێشتا کەس پێی نەگەیشتووە.

بەهەرحاڵ، ئێمە ڕایدەگەیەنین کە بەم چەشن یان بەو شێوە مۆدێرنگەراین. بێگومان ئەگەر لە قسەکردندا وردبینیی زۆر بەخەرج بدەین، دەشێت دان بە بوونی حاڵەتگەلێکی دەگمەن لە نێو ئەو هۆزە سەرەتاییانەدا بنێین کە هەتا ئێستا لە هیچ برێك لە مۆدێرنە بەهرەمەند نەبوون، بەڵام پێویست ناکات ئەم جۆرە هۆزانە بەهەند وەربگرین، نە لە ڕووی ئامادەگی ڕۆشنبیرییان و نە لە ڕووی چڕیی دانیشتوانیانەوە بە بەراورد لەگەڵ کۆی مرۆڤایەتی بەشارستانیبوو. ئەم پشتگوێخستنە لە بێڕێزی نواندنەوە نییە بەرامبەریان، بەڵکو لەبەرئەوەی ئەم حاڵەتە دەگمەن و دوورانە زۆر بێکاریگەرن لەسەر ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە.

کەواتە ئێمە لە لایەکەوە نوێگەراین و لەلایەکی دیکەشەوە باوەڕدارین (مۆمن)، تەنانەت ئەگەر (باوەڕ)یشمان بەوە وەرگرتبێت کە بەواتەی پەیرەوی کردن بێت لە ئایینە مێژووییە کۆنەکان، ئەوا ژمارەی خەڵکانی بێباوەڕ لە جیهاندا زۆر کەم دەبێت. زۆربەی خەڵك لەم سەردەمەدا باوەڕدارن، بێگومان باوەڕیش پلەو ئاستی خۆی هەیە.

با ئێستا بپرسین: ئایا لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا، لە کۆکردنەوەی نێوان باوەڕو نوێگەرایی پارادۆکسێك

یان لێکدژییەك هەیە؟ ئایا کاتێك کە لە یەك کاتدا نوێگەرو باوەڕدار بین ڕەفتارمان ناتەبا و ناسازە؟ ئەمە یەکەم. دووەم: ئایا لەم جیهانە نوێیەدا کە ئاراستەمان دەکات بۆ ئەو شتەی کە نوێترە، دەتوانین پابەند بین بە کام شێوە لە شێوەکانی خوێندنەوە بۆ ئایین؟ ئایا لە توانای مرۆڤی نوێدایە دەست بگرێت بەو خوێندنەوەیە بۆ ئایین کە خۆی دەیەوێت؟ وەڵامم بۆ مرۆڤی هاوچەرخ ئەوەیە کە ئایین بەو شێوەیە وەربگرێت و بیخوێنێتەوە کە مرۆڤی کۆنی پارێزکار (کۆنسێرڤاتیف) وەریدەگرت و دەیخوێندەوە. لەبەر ڕۆشنایی ئەمە، ئەگەر مرۆڤێکی لەم چەشنە لەتوانایدا نەبوو قبوڵی خوێندنەوە تەقلیدییەکە بکات بۆ ئایین _ئەگەر بیەوێت بەشێوەیەکی لۆژیکیی هاوسەنگ ڕەفتار بکات_ ئەوا دوو ڕێگەی لەبەردەمدایەو هیچی تر.

یەکەم: بەیەکجاری واز لە ئایین بهێنێت، کە پاشان هەرچی ئەو تایبەتمەندی و شتە باشانەی کە لەسەر ئاستی تاك لە ئاییندا هەن لەدەستی دەدات (گەر نەڵێین ئەم شتە باشانە لەسەر ئاستی کۆمەڵگەشدا هەن). هەر بۆ زانین، دەستبەرداربوونی مرۆڤ لە ئایین لانی کەم هەستکردن بە بۆشایی ڕۆحی و نیگەرانی و پەشێوی بەدوادا دێت.

دووەم: ئایین بەسەرو سیماو تێگەیشتنێکی نوێوە قبوڵ بکات. بۆت هەیە ئەم تێگەیشتنە نوێیە بۆ ئایین بە مینۆکی (مەعنەویەت) ناودێر بکەیت، وەك چۆن من وا دەکەم، ئەم زاراوەی ئایینە لە هەموو زمانەکاندا، جگە لەو زناکە (مەدلول)ە ئیجابییانەی کە هەیەتی، زناکگەلێکی خاوەن ئیحائێکی عاتفی خراپیش، بە دەرون و زەیندا دەهێنێت. لێرەوە وای بەباش دەزانم ئەم تێگەیشتنە نوێیە بۆ ئایین بە دەربڕینی (مینۆکی) گوزارشت لێ بکەم. ڕەنگە کەسێك بڵێت ئەم مینۆکیە زۆر جیاوازە لە ئایین بە تێگەیشتنە تەقلیدییەکەی، من خۆم هیچ لارییەکم لە قبوڵکردنی ئەمەدا نییە، بەهەر حاڵ من باوەڕم بەم تێگەیشتنە نوێیە هەیە بۆ ئایین نەك بەو تێگەیشتن و خوێندنەوەیەی کە کۆنسێرڤاتیڤەکان (محافەزەکارەکان) پێشکەشمانی دەکەن.

ئەمە وێڕای دان نان بەوەی کە تێگەیشتنی تەقلیدیی پێشوو لەسەروەختی خۆیدا دەستکەوتی باشی هەبووە، بەڵام شایستەی ئەوە نییە کە ئێمە ئەمڕۆ لایەنگیری بکەین، چ لەبەر ئیعتیباری واقیع و چ لەبەر بەرژەوەندی. چ ئەگەر خەمی تاقانەت گەیشتن بێت بە هەقیقەت (دیدی واقیعگەرایی)، و چ ئەگەر خەمت ڕزگار بوون بێت (دیدی بەرژەوەندگەرایی). لە هەر دوو حاڵەتەکەدا ناتوانرێت بەرگری لە ئایین، بە تێگەیشتنە کۆنەکەی بکرێت.

ئەمەیە بانگم دەکات کە بە مکورییەوە جەخت لە پێداویستیی ئەمڕۆمان بۆ مینۆکی (SPIRITUALITY) بکەمەوە، نەك بۆ ئایین بە تێگەیشتنە تەقلیدییەکەی، ئەگەرچی من نکوڵی لەو دەسکەوتە ئیجابییانە ناکەم کە ئایین بەدرێژایی مێژوو پێشکەشی کردوون، باوەڕم وایە کە نابێت دەستبەرداری ئایین ببین[٢]، پاشان ڕەنگە بوترێت _لەدوای بەیانکردنی تایبەتمەندییەکانی مینۆکی_ کە ئەوەش (واتە مینۆکی) هەر ئایینە بە کرۆك و ناوەڕۆکەکەیەوە، دیسان لاریم نییە ئەمەش قبوڵ بکەم.

بۆ ئەوەی وێنایەکی دروستمان بۆ مینۆکی هەبێت، پێویستە هۆکاری ئەوە تێبگەین کە بۆچی مرۆڤی هاوچەرخ ناتوانێت لەگەڵ تێگەیشتنە تەقلیدیی و مێژووییەکەی ئایین هەڵبکات و بژی، بۆ پەیبردن بەم مەسەلەیە پێویستە بگەڕێینەوە بۆ چەمکی نوێگەری و ڕوونکردنەوەی ڕەگەزو سیماو پێکهێنەرەکانی، ئەمەی خوارەوە نمایشێکی کورتی ئەوەیە.

### ڕەگەزو سیماکانی نوێگەری.

چەندین ڕوی جیاواز لەنێوان مرۆڤی نوێگەرو مرۆڤی تەقلیدیدا هەیە، چ لە ڕووی بیروڕا مەعریفییەکانەوە، یاخود لە ڕووی سۆزدارییە هەرستییەکانەوە، یان لە ڕووی کارو کارگێڕییەوە. جیاوازی لەنێوان مرۆڤی

نوێگەرو مرۆڤی پێش نوێگەری لەم سێ بازنەیەدایە.

بەشێوەیەكی گشتی دەتوانین رەگەزەكانی مۆدێرنە پۆلێن بكەین بۆ دوو پۆلی سەرەكی:

1. ئەو رەگەزانەی كە دەكرێت وەلای بنێین و خۆمانی لێ لادەین.
2. ئەو رەگەزانەی كە ناتوانین وەلای بنێین و خۆمانی لێ لادەین.

واتە كۆمەڵێك سیما هەن كە بەسەر مرۆڤی نوێدا هاتوون و بەهیچ شێوەیەك ناتوانین لە مرۆڤی نوێی دابڕنین. كۆمەڵێك سیمای تریش هەن كە دەكرێت مرۆڤی نوێ لە خۆی داببڕێ، دواتر لە توێی پرۆسەكەدا دێمە سەر روونكردنەوەی، بۆ نمونە یەكێك لە سیماو تایبەتمەندییەكانی مرۆڤی نوێ بریتییە لە باوەڕبوون بە پەرەسەندن و دان نان بەوەی كە مرۆڤایەتی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەرەو پێشەوە دەچێت. وەلێ من باوەڕم وایە ئەم سیمەو تایبەتمەندییە سیمەو تایبەتمەندییەكە دەكرێت لە مرۆڤی نوێ زەوت بكرێت، واتە دەكرێت قنیات بە مرۆڤی نوێ بكرێت كە پەرەسەندن دەتوانرێت وازی لێ بهێنرێت و دەستبەرداری ببین. بێگومان ئەمە كارێكی هەروا ئاسان نییە، بەڵام بەهەر حاڵ كارێكی مەحاڵیش نیە.

ئەگەر رازی بووین لەسەر پۆلێن كردنی سیماو رەگەزەكانی نوێگەری بۆ سیماگەلێك كە قابیلی خۆ بەدوور گرتن و وەلانان و سیماگەلێكی دیكە كە قابیلی خۆ بەدوور گرتن و وەلانان نین، ئەوا پێویستە لەسەرمان ملكەچی ئەوە بین كە هەر رەگەزێك لە رەگەزەكانی مۆدێرنە ئەگەر قابیلی خۆ بەدوور گرتن نەبوو ئەوا دەبێت لە بوونی مرۆڤی نوێدا وەكو ئەمری واقیع دانی پێدا بنرێت، جا ئەو رەگەزە شتێكی باش (ستایشكراو) بێت یان خراپ (نەفرەتلێكراو)، جوان بێت یان ناشرین، بەدڵمان بێت یان نا، تەنانەت گەر ویستمان لە مرۆڤی نوێ مرۆیەكی ئایینی (ئایینداڕ) دروست بكەین، پێویستە ئەوە بزانین كە ئەمە بەدی نایەت ئەگەر ئەم سیمایە یان ئەم تایبەتمەندیە لەبەرچاو نەگرین. رێگەم بدەن نمونەیەك بۆ ئەمە بهێنمەوە، بەر لە هەزار ساڵ پێش ئێستا، باپیرانمان لەشەوانی هاویندا دەچوونە سەربانی ماڵەكان و بەدەست ئاماژەیان بۆ منداڵەكانیان دەكرد تا سەیری ئاسمان بكەن .. چییان لە ئاسماندا دەبینی، دەیانویست منداڵەكانیان چی ببینن و چی تیا بخوێننەوە؟ دەیانویست منداڵەكانیان لە مەزنیی بوونەوەر وریا بكەنەوە، بۆیە پێیان دەوتن: ئێمەی مرۆڤ گەر بمانەوێت سەربانێك دروست بكەین، چەند بچوكیش بێت، مەحاڵە ئەگینا هەر پێویستمان بە ستونگەلێك دەبێت سەربانەكە بەرز رابگرێت، بەڵام خوای گەورە ئەم سەربانە گەورەو بەرزەی بێ ستوون و دیوار دروست كردووە، ئەوان وایان دەزانی ئاسمان سەربانە، ئەوان وایان دەدا بەگوێی منداڵەكانیاندا كە بۆ ئەوەی چراكانمان بە داگیرساوی بمێنێتەوە هەمیشە پێویستیمان بە زەیت دەبێت، بەڵام گومەزی ئاسمان چراگەلێكی تێدایە كە سەدان ساڵ دەدرەوشێتەوە بێئەوەی شەوق و رۆشناییەكەی بكوژێتەوە. سەربانی بێ پایەو چرای بێ زەیت، زەینی باپیرانی دێرینمانیان ئاراستە دەكرد بۆ بینینی توانایییەكی خودایی تەواو لەپشت ئەم ئیعجازانەوە. بەڵام ئەو ئەقڵیەتە چییە كە ئێمە ئەمرۆ سەیری ئاسمانی پێ دەكەین، ئەی ئەو شتانە چین كە تێیدا دەیانبینین و مكورین لەسەر ئەوەی كە بۆ منداڵەكانمانیان بگوێزینەوە؟

جیاوازییەك نیە لەنێوان ئەو ئینتیباعە هەستییەی (impression) كە ئێستا ئێمە هەڵگرین لەگەڵ ئەو ئینتیباعە هەستییەی كە باپیرانمان هەڵگری بوون. ئەو روناكییەی چاوانی ئەوانی دەبڕی هەمان ئەو روناكییەیە كە ئێستا چاوانی ئێمە دەبڕێت. هێشتا ئەستێرەكان دەدرەوشێنەوەو دەبریسكێنەوە و لە مێشكی ئێمەدا هەمان ئەو كاریگەرییە هەستیە كۆنانە دادەنێت كە ئەوسا لە چاوی باب و باپیرانماندا دایدەنا.

بەڵام جیاوازییەكی جەوهەریی گەورە هەیە لە نێوان ئەوەی ئەوان لەرێی ئەو ئینتیباعەوە دەیانخوێندەوە

لەگەڵ ئەوەی کە ئێمە ئێستا وێنای دەکەین. چیدی ناتوانین وەك سەربانێك بڕوانینە ئاسمان‌و وەك چراگەلێك بڕوانینە ئەستێرەکان، تیۆریە تازەکان بۆ ئەم مەسەلانە پەردەیان لەسەر واتاگەلێکی نوێ لاداوە، بەچەشنێك کە چیدی ناتوانین ئەم شتانە بەخۆمان بڵێین چ جای بە خەڵکانی دیکە؟ ئەمەش واتای ئەوەیە کە وتمان هەندێ لە ڕەگەزەکانی مۆدێرنە قابیلی دارنین نییە لە مرۆڤی نوێ. کاتێك دەڵێین هەندێ لە ڕەگەزەکانی مۆدێرنە ناکرێت خۆمانی لێ ڕزگار بکەین‌و وەلاینێین، هیچ دەرەتانێکمان نییە دەبێت لەگەڵیدا بژین، تەنانەت ئەگەر پێمان وابوو پوچ‌و ناڕاستیشە، هەروەك ڕەفتاری پزیشك لەگەڵ نەخۆشدا کاتێك داوای لێدەکات کە ئارام‌و هێور بێت تاوەکو خولی سروشتیی نەخۆشییەکە تەواو دەبێت، چونکە تا نەخۆشییەکە خولەکەی خۆی تەواو نەکات نووسینی چارەسەرەکە هیچ سوودی نیە، خۆ ئەگەر نەخۆشییەکەش خولەکەی خۆی تەواو کرد ئاشکرایە نوسینی چارەسەر پێویست ناکات، چونکە نەخۆشەکە چاك بۆتەوە. ئەو کەسەی دەیەوێت بانگی مرۆڤی هاوچەرخ بۆ ئایین بکات، دەبێت بایەخێکی فراوان بەشێوازی مامەڵەکردن لەگەڵ جۆرە لە هەڵوەشاندنەوەنەهاتووەکانی ڕەگەزەکانی مۆدێرنە بدات.

بەڵام ئەو ڕەگەزانەی کە قابیلی هەڵوەشاندنەوەو لێکردنەوەن لە مرۆڤی نوێ، ئەوا بەجێی خۆیان دابەش دەبن بۆ دوو بەش: ئەو ڕەگەزە ڕاست‌و دروستانەی کە قابیلی لێکردنەوەو لێکهەڵوەشاندنەوەن، هەروەها ئەو ڕەگەزە پوچانەی کە قابیلی لێکردنەوەو لێکهەڵوەشاندنەوەن، یاخود ڕەگەزە باشەکان‌و ڕەگەزە خراپەکان. ئەگەر ئەم ڕەگەزانە لە جۆری یەکەم (باشە ڕاستەکان) بوون ئەوا دژایەتیکردنیان هیچ واتایەکی نییە بەڵکو پێویستە قبوڵ بکرێن، بەڵام ئەگەر لە بەشی دووەم (پوچە خراپەکان) بوون ئەوا دەبێت بەربەرەکانی بکرێن، بەڵام بەشێوازێك کە مرۆڤی نوێ لە زاراوەی بەربەرەکانی تێی دەگات، واتە بەربەرەکانی کردنێکی زانستییانە.

بەکورتییەکەی ، ئێمە تەنها بایەخ بەم بەشەی دوایی دەدەین، واتە کارمان بەسەر ئەو ڕەگەزانەوە نییە کە قابیلی وەلانان‌و خۆ بەدوورگرتن نین، هیچ کێشەیەکیشمان لەگەڵ ئەو ڕەگەزانەیشدا نیە کە قابیلی وەلانان‌و خۆ بەدوورگرتنن‌و سەر بە بەشی یەکەمن واتە چاکن، بگرە پێشوازی لەم جۆرەی ڕەگەزەکان دەکەین، هیچ نامێنێتەوە تەنها جۆری سێیەم نەبێت کە ئەویش ئەو ڕەگەزانەن کە قابیلی وەلانان‌و خۆبەدوور گرتن نین‌و خراپیشن.

## چەمکی مینۆکی.

مرۆڤ پەی بە پێویستبوونی مینۆکی نابات تەنها ئەو کاتە نەبێت کە هەست بەدوو شت دەکات: یەکەم: ئاتاج بە ئایین، دووەم: هەستکردن بەوەی کە ئایین بە تێگەیشتنە کلاسیکییە مێژووییە ئوسوڵییەکەی لەگەڵ ئەو ڕەگەزانەی مۆدێرنەدا ناگونجێت کە ناکرێت خۆمانیان لێ بەدوور بگرین‌و وەلایان بنێین، یان ئەو ڕەگەزانەی مۆدێرنە کە دەکرێت خۆمانیان لێ بەدوور بگرین بەڵام ڕاستیشن. ئەگەر لەیەك کاتداو پێکەوە هەستمان بەم دوو مەسەلەیە کرد ئەوا ناتوانین بەواتا باوەکەی ئایین باسی ئایین بکەین، لەم حاڵەتەدا ئەگەر ئایین دژ بوو لەگەڵ ڕەگەزێکی مۆدێرنە کە قابیلی وەلانان‌و خۆ لێ بەدوورگرتن نییە، ئەوا ئەو مۆدێرنەیە سەرکەوتوو نابێت.

هەروەها ئەگەر ئایین دژ بوو لەگەڵ ڕەگەزێکی ڕاست‌و باشی مۆدێرنە کە قابیلی وەلانان‌و خۆ لێ بەدوور گرتنە، ئالەو کاتەدا پەنا دەبەینە بەر ئەوەی کە بڵێین خوێندنەوەیەکی نوێ بۆ ئایین پێویستە کە لەگەڵ ئەو دوو جۆرە ڕەگەزەی کە باسکران دژ یاخود پێچەوانە، مەبەستم لە مینۆکیش هەر ئەمەیە.

ئەقڵانیەت بریتییە لە گەورەترین‌و دیارترین تایبەتمەندییەکانی نوێگەری کە قابیلی خۆ لێ بەدوور گرتن

نیە، لێرەوە یەکەمین تایبەتمەندییەکانی مینۆکی بریتییە لە توانای مینۆکی بۆ سازان لەگەڵ ئەقلانیەتو خۆگونجاندن لەگەڵی. جا ئەو کات دەکرێت بە شێوەیەکی دیکە پێناسەی مینۆکی بکرێت، بوترێت بریتییە لە ئاییندێکی ئەقلێنراو، بۆ ئەوەی ئایین بئەقلێنرێت پێویستە ژمارەیەك ئەركو مەهام ئەنجام بدرێت.

مەبەستم ئەوە نیە کە هەر دەبێت لە سەر ئاستی کۆمەڵگە بەم ئەرکانە هەستین، بەڵکو لە توانای هەر کەسێکدایە کە بەتەنها خۆی بەم کارە هەستێت ئەگەر ئارەزوو بکات لە ئەهلی واتا (مەعنا) بێت. پێویستیش ناکات دامەزراوە ئەکادیمیو مەڵبەندەکانی توێژینەوە لەسەر ئاستێکی کۆمەڵایەتیی فراواندا دەستپێشخەری بۆ ئەم کارە بکەن ئەگەرچی خۆی لەخۆیدا ئەمە پێویستە، کێشەکە ئەوەیە تاك ناتوانێت هەروا چاوەڕوان بمێنێتەوە تا ئەو داموو دەزگاو مەڵبەندانە دادەمەزرێن، بۆیە تاك ناچار دەبێت بە هەوڵو کۆششی خۆی دەستپێشخەری بۆ ئەم کارە بکات، بۆئەوەی ڕوانینی بۆ خۆیو بۆ ئایینیش ڕاست بکاتەوە. ئەمە تێبینیی یەکەم.

تێبینی دووەم: ئەم کارانە، کە پێویستە هەموو تاکێك پێی هەستێت، هەر تەنها تێڕامانگەلێکی تیۆری نین، بەڵکو پێویستە جۆرە چالاکیو وەرزشگەلێکی هەناویشیان لەگەڵدا بێت، بۆئەوەی هەل بۆ خاوەنەکەی برەخسێنێت کە ئاییندار بێت بە ئاییندێکی ئەقلانی. لێرەدا بەپێویستی دەبینم کە ئەو ڕەگەزو سیمایانەی مۆدێرنە بژمێرم کە قابیلی خۆ لێ بەدوور گرتن نین.

-ئەو ڕەگەزانەی مۆدیرنە کە قابیلی خۆ لێ بەدوور گرتن نین: ئەمەی خوارەوە کورتە نمایشکردنو وەڕوخستنێکی ئەو ڕەگەزو دیاردانەیە کە ناتوانرێت لە مۆدێرنە داماڵرێن.

## 1. وەسفکردنی مۆدێرنە وەک میتۆدێکی سەلماندنئامێزی پشت بە بەڵگە بەستوو (برهانیا استدلالیا):

ئەو شتەی کە وا دەکات مۆدێرنە لەگەڵ خوێندنەوەی کلاسیکی بۆ ئایینی مێژوویی تەبا نەبێت ئەوەیە کە ئەمەی دواییان (خوێندنەوەی تەقلیدی بۆ ئایینی مێژوویی) خاوەن مۆرکێکی پەرستشئامێزە). بەڵگەئامێزو پەرستشئامێز (والاستدلال والتعبدیە) دوو لایەنی لێکدژن. چەمکی پەرستش واتە من کاتێك دەڵێم ئێ (ئەلف) بەواتە بێ (با)، داوای بەڵگەم لێدەکەیت، لەوەڵامدا بەوەندە بەس دەکەم: لەبەرئەوەی فلان کەس (س) وای گوت. ئەمە شێوەی گشتیی بەڵگەهێنانەوەیە لەسەر ڕێگای پەرستش. چەندێك ئەم جۆرە بەڵگەهێنانەوەیە ئیستیفزازت دەکات ئەوەندە نزیکی لە فاکتەری مۆدێرنە. لە دیدی مرۆڤی نوێدا هەڵەیەکی گەورەیە پێی بوترێت (ئێ) بەواتە (بێ) چونکە (س) وای وت، پەرستش سوورە لەسەر قسەکەی خۆی.

بەڵام میتۆدی سەلماندن وێنەیەکی دیکەی جیاوازی هەیە، کاتێك کە دەڵێم (ئێ) بەواتە (بێ) داوای بەڵگەم لێدەکەیت، لەسەرمە وەڵامت بدەمەوە بۆ نمونە بڵێم (ئێ) بەواتە (چێ)، و(چێ)ش بەواتە (بێ)، ئەنجامگیری دەکەین کە (ئێ) بەواتە (بێ) ڕەنگە لەگەڵ ڕاکەمدا نەبیت کە (ئێ) بەواتە (چێ)، ئەوکات دەبێت پرۆسەی بەڵگەهێنانەوەکە بەردەوام بێت بۆ نمونە دەڵێم (ئێ) بەواتە (دێ)،(دێ)ش بەواتە (چێ) جائەوجا (ئێ) بەواتە (چێ)، ئابەم شێوەیە تا قەناعەت بە ڕەوتی بەڵگەهێنانەوەکە دەکەیت.

مۆدێرن نابیت تا ئامادە نەبیت کە بە بەڵگەهێنانەوە هەنگاو نەنێیت، لەبەرئەوەی لایەنی بەرامبەر هێشتا چەندین پرسیاری هەیە، جا ئەگەر لە بەڵگەهێنانەوەدا گەیشتیتە قۆناغی ئەوەی کە (کێ) بەواتە (لێ)و بەرامبەرەکەت داوای بەڵگەی لێکردی، بەڵگەت نەهێنایەوەو پەنات بردە بەر قسەی فلانو فیسار، ئەوا بەم کارەت پەنات بردۆتە بەر پەرستش و سنووری بازنەی مۆدیرنەت جێهێشتووە، لەبەرئەوەی بەڵگەهێنانەوە لەسەریەتی لە وەڵامدانەوەی (کە داواکاریی بەردەوامی لەسەرە بۆ بەڵگەهێنانەوە)، ڕانەکات. گەر گەیشتینە

خاڵێك كە بەڵگەمان نەما، ئەوا پێویستە بۆ پاراستنی سیمای مۆدێرنی رەفتاری خۆمان بێدەنگەی لێبكەین، ئەگەرنا سوور بوون لەسەر ئەنجامێك بەبێ بەڵگەهێنانەوە خۆی لەخۆیدا پەرستشە، بەمەش بوارێك بۆ بانگەشەكردنی ئینتیما بۆ جیهانی مۆدێرنە نامێنێتەوە.

یەكەمین كار لە سەر رێگەی بەدیهێنانی مینۆكی بریتییە لەوەی كە چەند لە تواناندا بێت رەگەزی پەرستش لە ئاییندا وەلابنرێت. بۆیە دەڵێم چەند لەتوانادا بێت لەبەر دوو هۆ كە دواتر باسیان دەكەم. لەكرۆكدا بەڵگەهێنانەوە دەگەرێتەوە بۆ ئەو شتەی كە تیلیش بە خۆبەرێوەبردن (خودموختاری) (Autonomy) گوزارشتی لێكردووە نەك كەسانی دیكە بەرێوەی بەرن (Heteronomy). مرۆڤی ئیستدلالی ئامادە نییە خۆی نەبێت كەسی دیكە فەرمانرەوایی بكات، بەڵام مرۆڤی پەرستشكار ئامادەیە كەسانی دیكە فەرمانرەوایەتی بكەن. تەوژمی (پشت بەكەسانی دیكە بەستن) بوو كەسانی وەك فیرۆباخ‌و هیگڵ‌و رەوتی چەپ لە قوتابییەكانی هیگلی بەرەو بیرۆكەی جیابوونەوەو دابڕان لەخود برد. هیگل پێیوایە هەر كەسێك كە دوچاری ئەوەیە پشت بە كەسانی دیكە ببەستێت، كەسایەتیی ئەو كەسە دوچاری نەخۆشیی شیزۆفرینیا بووە، بە چاوپۆشی لە سروشتی ئەو كەسەی پشتی پێ دەبەستێت و بیروڕاو قسەكانی دەپەرستێت، كە رەنگە لە كولتوورێكەوە بۆ كولتوورێكی دیكەو لە سەردەمێكەوە بۆ سەردەمێكی دیكەو لە كەسێكەوە بۆ كەسێكی دیكەو لە تەمەنێكەوە بۆ تەمەنێكی دیكە بگۆرێت، بەڵام ماهیەتی پەرستش سەرباری ئەم جیاوازی‌و ناكۆكییانە هەر هەمان شتەو وەكو خۆی دەمێنێتەوە. پەرستش بریتییە لە قبوڵكردنی رایەك یان حوكمیك تەنها لەبەرئەوەی سەرچاوەكەی فلان كەسە.

## 2. متمانە نەكردن بە مێژوو، زۆر بە كەمی نەبێت پشت بە مێژوو نەبەسترێت:

بێگومان مەبەست لە متمانە نەكردن بە مێژوو ئەوە نییە كە مرۆڤی مۆدێرن دیدێكی مێژوویی نییە. چۆن، یەكێك لە تایبەتمەندییە مەعریفییەكانی مرۆڤی مۆدێرن ئەوەیە كە دیدێكی مێژوویی هەبێت بۆ شتەكان. بەواتە مرۆڤی مۆدێرن كە دەروانێتە دیاردەیەك هەر تەنها لە سنووری برگەی ئێستایدا تەماشای ناكات، بەڵكو درێژبوونەوەی ئەو دیاردەیە لە ستوونی مێژوودا لەبەرچاو دەگرێت، لۆژیكی رۆمانی مێژوویی پێمان دەڵێت تەماشاكردنی برگەیەك لە قەدی درەختێك بەس نیە بۆئەوەی بەتەواوی درەختەكە بناسین، بەڵكو دەبێت تەماشای هەموو بەش‌و برگەكان بكرێت.

مرۆڤی مۆدێرن پێوایە، لە باردا نیە بتوانرێت هەقیەقەتی حكومەت یان ئایین یان هێڵێك یاخود وەرزشێك بزانرێت هەر تەنها بە ئاگاداربوون لە رەوشی ئێستای، بەڵكو دەبێت لەو بارودۆخانە بكۆڵرێتەوە كە ئەم دیاردەو وتەزایانە لە مێژوودا پیایاندا تێپەریون، هەروەها لە سروشتی ئەو ئاڵوگۆرانەی كە بینیویانە.

لەگەڵ تێبینی ئەوەی كە ئەم جۆرە لە نەبوونی متمانە بە مێژوو بەو واتایە نییە كە سوود لە پەندو وانە مێژووییەكان وەرنەگیرێت، بەڵكو ئەوەی مەبەستە ئەوەیە كە مرۆڤی نوێ بەتایبەتی لەپاش سەردەمی دەیڤد هیۆم، تێگەیشت كە ناتوانرێت لە دەروازەی مێژووەوە بگاتە ئەنجامە یەقینییەكان. متمانە نەكردن بەمێژوو بەواتەی ئەوەی كە مێژوو زانستێكی ئیحتیمالیە نەك قەتعی. ئەم ناقەتعیبوونە دەرهەق بە هەموو برگە مێژووییەكان راستە، تەنانەت ئەگەر جگە لە چەند دەقیقەیەك هێندە كات بەسەر روداوەكەشدا تێنەپەرببێت. هەرئەوەندەی روداوەكە چووە ناو ستوونی مێژووەوە، ئیدی سەخت دەبێ حوكمێكی پڕاوپڕی یەقینی بەسەردا بدەین، وەكو ئەوەی كە لە بیركاریدا هەیە كە 2+2= 4. بگرە ناكرێت متمانە بە روداوێكی مێژوویی بكرێت، تەنانەت لە ئاست ئەو یەقینەیش كە لە بواری زانستە ئەزموونگەراییەكاندا بەدەست

هاتووە، وەك ئەو زانستەی کە ((ئاو لە پلەی 100ی سەدیدا دەکوڵێت)). هیوم ڕۆڵێکی گەورەتری گێڕا لە چەسپاندنی ئەوەی کە هەمیشە سەبارەت بە ڕوداوەکانی مێژوو بڕێك گومان هەیە.

تایبەتمەندیی (ناقەتعی)، سەبارەت بە ئاین زۆر پرسیار دەوروژێنێت، لەبەرئەوەی ئاین دەوەستێتە سەر دڵنیابوون لەڕودانی چەند ڕوداوێکی مێژوویی. لە هەموو ئایینێکدا دەبێت وەك پێشەکییەکی پێویست بۆ چوونە سەر ئەو ئایینە تەسلیمی ڕستێك ڕوداوی مێژوویی بیت. لە تواناتدا نییە بانگەشەی ئەوە بکەیت کە مەسیحییت و لەگەڵیدا نکوڵی لە شێوی دوایین بکەیت، یان نکوڵی لە لەخاچدانی مەسیحو دەرکەوتنەوەی سەرلەنوێی لە پاش چەند ڕۆژێك لەمردنەکەی بکەیت. بەڵام هەتا چەند دەتوانین بەراستی سوور بین لەسەر ئەوەی کە ئەم ڕوداوە مێژووییانە ڕوویانداوە؟! دوو هەزار ساڵ ئەوە ماوە زەمەنییەیە کە لەو ڕوداوانە جیامان دەکاتەوە، ئەوەشی بۆ زیاد بکەم کە جگە لە مەسیحییەکان هیچ کەسێك لایەنگری لە ڕودانی ئەم ڕوداوانە ناکات.

ئەم ڕوداوە ئایینییە هیچ مێژوونووسێکی سکیولاریست نەیگێڕاوەتەوە. ئەمە مەسەلەیەکی گرنگە. دەیڤد هیوم لەم بارەیەوە قسەیەکی خۆشی هەیە. دەپرسێت: چ شتێك زیاتر شایستەی باوەڕ پێ کردنە، ڕوداوێك کە هەزار کەس دەیگێڕنەوە و هەموویان مەسیحین یان ڕوداوێك کە دوو سەد مەسیحی و سێ سەد بوزیو چوار سەد مسوڵمان دەیگێڕنەوە، ئا بەم شێوەیە؟ ئاشکرایە کە ڕوداوی دووەم زیاتر شایستەی پەسەند کردنە، لەبەرئەوەی ئەوەی لە حاڵەتی یەکەمدا هاتووە هاوبەشبوونیان لە مەسیحییەتدا دەخلو کاریگەری هەیە لەباوەڕداربوونیان بە ڕودانی ئەو ڕوداوە چ بە ئاگاییەوە بێت یان بە نائاگاییەوە، هەروەها گەر نیوەی هەزار کەسەکە پیاوان بن و نیوەکەی دیکەشی ژنان بن کارەکە هەر بەهەمان شێوە دەبێت، واتە پلەی متمانە بە گێڕانەوەکە زیاتر دەبێت، لەبەر هەمان ئەو هۆیەی کە باسکرا، ڕەنگە مەسەلەی پیاوبوون دەخلی هەبێت بەو هەواڵەوە. ئێستا با گریمانەی ئەوە بکەین کە هەزار کەس کە لە ئایینگەلێکی جیاواز بوون، نیوەیان پیاو و نیوەکەی تریشیان ژن بوون، هەندێکیان دەوڵەمەندو ئەودی دیکەشیان هەژار بوون، ئا لەم شێوە جیاوازییانە، چەند ئەو کەسانەی کە قسەکە دەگێڕنەوە هەمەچەشن بن پلەی متمانەو دڵنیاییەکە بە ڕودانی ڕوداوەکە زیاتر دەبێت.

فرەیی هەمەچەشنی، بەواتە کەمیی تایبەمەندییە هاوبەشەکان، کەمیی تایبەمەندییە هاوبەشەکانیش بەواتە کەمی بەرژەوەندییەکان، کاتێکیش بەرژەوەندییەکان کەم دەبێتەوە، کەوتنە ژێر کاریگەریش کەم دەبێتەوە. لەبەر ڕۆشنایی ئەوە پرسیارەکەم دوبارە دەکەمەوە: ئایا ئەم ڕوداوانە لەلایەن بیرمەندێکی علمانییەوە گێڕدراونەتەوە، کە مامەڵەیەکی بێلایەنانە لەگەڵ ئایینداا دەکات، مامەڵەیەك کە نە لە دژییەتیو نە لەگەڵیەتی؟

بەهەر حاڵ، ئەم سیمایە لە سیماکانی مۆدێرنە (مەبەستم نەبوونی متمانەیە بەوەی کە لە مێژوودا هەیە) وا دەردەکەوێت کە لێکدژە لەگەڵ ئاییندا، کەواتە بۆیە ناچار دەبین لە پلەی متمانەکردنی ئاین بە ڕوداوە مێژووییەکان کەم بکەینەوە، لە کاتێکدا کارەکە لە ڕوی مەعنەوییەوە جیاوازە، بەچەشنێك کەسانێك هەن کە ڕوداوە مێژووییەکان دادانێن بە گۆشەیەك لە گۆشەکانی بیرو ڕەفتاری ئایینی.

### 3. مۆدێرنەی هەنوکەیی _ شوێنی:

بەواتە، ئەو کەسەی کە پێشنیاری چارەسەر بۆ دۆزی (تیۆری) یان گرفتی (پرۆسە) دەکات، دەبێت هەر ئێستاو لەم شوێنەدا، بەمەبەستی زانینی شوێنەوارو بەرئەنجامەکانی ئەم چارەسەرە، ئەم چارەسەرە ئەزموون بکاتو تاقی بکاتەوە. ئەمە بەو واتایە نییە کە مرۆڤی مۆدێرنە هەر دەبێت نکوڵی لە بوونی ڕۆژی

دوایی‌و ژیانی پاش مردن بکات، مرۆڤی هاوچەرخ لە توانایدایە باوەڕی بە ڕۆژی دوایی‌و ژیانی پاش مردنیش هەبێت، بەڵام گرنگ ئەوەیە کە ئێستاو لەم دنیایەدا کە دادەنرێت بە تاکە تاقیگەی زانستی، ئەو مەسەلانە تاقیبکاتەوە. یەکێك لە واتاکانی علمانیەت بریتییە لەوەی هەموو ئەو شتانەی دەیڵێیت‌و بانگەشەی بۆ دەکەیت، پێویستە لێرەدا تاقی بکرێنەوە، تا هەلی ئەوەمان بۆ برەخسێت کە لە ڕاست‌و دروستی ئەوە دڵنیا بینەوە کە دەیڵێیت. ئەگەر بۆ چارەسەری ئەم مەسەلەیە یان ئەم گرفتە پێشنیاری ئایینێك یان ئایینزایەك یاخود ڕێبازێکت بۆ کردین و پاشان بەسەر سەرمانەوە وەستایت‌و فەرمانت پێکردین کە بەبێ مشتومڕ پەیڕەوی لەم چارەسەرە بکەین، بەو هیوایەی کە ئاکامە باشەکانی لەپاش مردنەوە دەربکەوێ، ئەوا مرۆڤی مۆدێرن ڕەتی دەکاتەوە کە بەم شێوازە مامەڵە لەگەڵ پرسەکەدا بکات، چونکە لە ڕوانینی ئەودا ئەمە هیچ واتایەکی نییە. مرۆڤی مۆدێرن ناڵێت ژیانی پاش مردن نییە، بەڵکو دەڵێت من دەبێت ئێستا لەمە تێبگەم. نمونەیەکی سادە لەسەر ئەمە، گەر تۆ بۆ نان کرین چوویت بۆ نانەواخانەیەك، بەڵام بەهۆی ئەوەی کە نانەکە هەڵنەهاتبوو نانەکەت نەکڕی، نانەواکەش پێی وتی: نانەکە بەرە کە گەیشتیتە مزگەوتەکە خۆبەخۆ هەڵیەت! ئێستا ئەگەر ئەم پێشنیارەی نانەواکەت پەسەند نەکرد، ئایا مافی نانەواکەیە کە تۆمەتبارت بکات بەوەی کە تۆ باوڕت بە مزگەوت نیە؟ بەڵێ، مافییەتی بڵێ فلان کەس باوەڕی بەوە نییە کە مزگەوت شوێنێکی باش بێت بۆ تاقیکردنەوەی نان لەڕوی هەڵهاتنەوە، نانەواخانەش تاکە شوێنی گونجاوە بۆ کۆڵینەوە لەم مەسەلەیە.

ئەم نموونە سادەکراوە، ڕۆڵی لە توێژینەوەکەماندا ئەوەیە ئەو ڕاستییە دەربخات کە ئایینەکەمان گەر بانگەشەی شتێکی دیاریکراوی کرد، دەبێت کاریگەریی ئەم شتە تاقیبکرێتەوە، لەم کاتەو لەم شوێنەدا، نەك لە کات‌و شوێنێکی تردا. پاشان ئەگەر ڕۆژی دوایی هەبێت ئەوا تەمسیلی ئەنجامێکی بەردەوامئامێزی ئەو شتە دەکات کە لەم دنیایە دەستت لێداوەو سوودت لێ بینیووە، خۆ ئەگەر ڕۆژی دوایی نەبوو ئەوا بەهەر حاڵ من ئەم دنیایەم لەکیس نەچووە. بەڵام گەر گوترا ناکرێت لە ڕاستیی ئەم چارەسەرە پێشنیارکراوە بۆ مەسەلەو گرفتەکان بکۆڵرێتەوە تەنها پاش مردن‌و چوونە ناو جیهانگەلی نوێوە نەبێت، ئەوا ئەم قسانە لەگەڵ میتۆدی علمانی بۆ مامەڵە لەگەڵ شتەکاندا ناگونجێن.

ئەم تایبەتمەندییەی مۆدێرنە، وا لە مۆدێرنە دەکات کە ناسازو ناتەبا بێت لەگەڵ تەوژمی بایەخدان بە ڕۆژی دوایی، کە ئایینەکان تێیدا هاوبەشن. مرۆڤی مۆدێرن لەو کەسانە دەچێت شارەزاییان لەبارەی کولتووری کۆنەکانی پێش مۆدێرنە هەیە، لەو ڕووەوە کە بە ڕەخنە مامەڵە دەکات نەك بە پەککخستن. واتای ئەم قسەیە لەسەر ئاستی ڕاستگۆیی ئەوەیە کە ئەگەر پێویست بوو لەسەرم نوێژ بکەم‌و ڕۆژوو بگرم‌و حەج بکەم، چار نیە دەبێت لە ماوەی ژیانم لەم دنیایەدا هەست بە شوێنەواری ئەم کارو مومارەسانە بکەم، لەڕێی هەست کردن بە خۆشی و پشوو و ئارامی‌و هیواو ڕەزامەندیی ناوخۆیی مەعنەوی. بەڵام ئەگەر من هەموو کەش‌و سروت‌و پەرستشەکانم ئەنجام بدەم بەبێ ئەوەی هەست بە کاریگەرییەکی ئەم شتانە بکەم‌و هەر بە هێندە بەس بکەم کە بڵێم ئەم کاریگەرییانە لە دنیای دواییندا دەردەکەوێت، ئەوا ئەو کاتە کارێکی سروشتییە کە بەو لایەدا دایشکێنم کە باوەڕم بەوە هەبێت  ئەم کارانە لەم دونیایەدا هیچ سوودێکیان نییە. ئەو تێگەیشتنەی کە مرۆڤی تەقلیدیی موحافەزەکار سەبارەت بە ئایین هەڵگرییەتی ئەوەیە کە ئێمە هەڵدەستین بەم کارو پەرستشانە بەبێ ئەوەی بزانین کە خوا چی لە تۆماری کارەکانماندا تۆمار دەکات. لە فەرهەنگی ئایینیی تەقلیدیدا شتێك نیە ناوی هەستکردن بە پشوو و هیواو دڵنیایی بێت لە دنیادا. گرنگ لای ئەو  دنیاکەی ترە، بەڵام مرۆڤی نوێ باوەڕی وایە کە دەبێت ئایین لەم دنیاشدا هەموو ئەو شتانەی بۆ فەراهەم بکات، لەو دنیایەی کە تیایدا دەژی دەبێت پەرستش کاریگەریی ڕۆحیی هەستپێکراو و

بەرهەستی هەبێت، هەر بەجۆرەی کە لە دوای کرداری نانخواردن هەست بە تێربوون دەکەین. لەبەر رۆشنایی ئەوەی باسکرا مینۆکی بریتییە لە جۆرە تەوژمێکی ئەزموونگەرییانەیە لە ئایین، کاری پێویستی مینۆکی ئەزموونکردنی ئایینە لەم دنیایەدا. بێگومان دەکرێت لە ئایاتو لە گێرانەوەکاندا ئەو گەواهییانە بدۆزینەوە کە دەلالەت لەم واتاو کرۆکە دەکەن. بەڵام نامەوێت توێژینەوەکەم پەلکێش بکەم بۆ ئەم چوارچێوەیە. هەندێ لەوانەی کە دەیزانن دەڵێن: مەبەست لەم واتایە بریتییە لە ئایەتی {من كان في هذه أعمى فهو في الآخرة أعمى وأضلُ سبيلاً} (ا سراو - 72). واتە هەرکەسێك لەم دنیا شوێنەوارەکە نەبینێت ئەوا لەو دنیاش نایبینێت. بێگومان دەکرێت بوترێت ئێمە دەتوانین لەم دنیا هەندێك شوێنەواری ئایینداری ببینین نەك هەموو شوێنەوارەکانی، ئەمەش قسەیەکی ماقوڵە.

گرنگ ئەوەیە لێرەدا هەست بە شوێنەوارێك بکەین، ئەگەرنا ئەو دەرئەنجامە لۆژیکیەی کە نەبینینی هیچ شتێك، بەدوای خۆیدا دەهێنێت، بریتی دەبێت لە پێویستبوونی گوێگرتن لە هەموو شتەکانو پابەندبوون پێوەی، واتە پێویستە لەسەرمان کە هەر کەسێك دێتو پێمان دەڵێت پێویستە بەیانیو ئێوارەی هەموو رۆژێك ئەمەو ئەوە بخوێننەوە، بەقسەی بکەین، دەرئەنجامیش پاش مردن دەردەکەوێت، نابێت نارەزایەتی لەدژ دەربڕین، چونکە ئەو هەمان رێگەی پێغەمبەرانی گرتووە، واتە هەواڵە کردن بۆ پاش مردن. هیچ پێودانگێکی روونیش بۆ یەکلایی کردنەوەی ناکۆکییە ئاینییەکانو یەکالاکردنەوەی سکالا دژ بە یەکەکان لە چوارچێوەی ئاییندا نابێت. مەبەست لەوەی کە مۆدێرنە خاوەن خەسڵەتی (هەنوکەیی شوێنییە) ئەمەیە.

## 4. دارمانو لەرزینی ئەحکامو یاسا شمولییە کۆنەکان:

لەبەر چەندین هۆکار، ئەحکامو یاسا شمولییە میتافیزیکییەکان لە زەینی مرۆڤی مۆدێرندا لەرزییەوە. ئەحکامە میتافیزیکییە کلاسیکییەکان دوو خەسڵەتیان هەیە:

ئێ: زیادەرۆیی لە شمولیەتدا: لەبەر رۆشنایی ئەم شمولیەتەدا، هەموو شتێك، هەر لە هێڵی دەرزییەکەوە تا کۆڵەکەی ماڵ، دەستدەدات لێکبدرێتەوە، گەر لە لایەنگرانی ئەمە لە نموونەی ئیبن سیناو هیگلو سەپینۆزاو دواییندیان هوایتهدت، سەبارەت بە هەر شتێك پرسیارت بکردایە، دەهاتنە لێکدانەوەیو لە سیستمە هزرییەکەی خۆیاندا، کە وای دادەنێن هەموو شتێکی نێو ئەم جیهانە دەگرێتەوە، جێگەیەکی تایبەتیان دەدایە. وەڵامی ئامادەیان بۆ هەموو پرسیارێك هەیە، جا ئەو پرسیارە چ پەیوەست بێت بە پێش مردنەوە یان پاش مردنەوە، چ بە ئاژەڵەوە یان بە مرۆڤەوە، چ بە بێگیانەوە یاخود بە روەکەوە.. لێرەوە دەوترێت کە تیۆرە میتافیزیکییەکان خاوەن خەسڵەتی شمولیانەو گشتگیرانەن (Comprehensive). لەنێو زانایانی پێشینی میتافیزیکادا کەسێك نییە بڵێت: من پسپۆرم لە مەسەلەی جەبر، بۆیە سەبارەت بە فۆرم و ناوەرۆك پرسارم لێ مەکەن. بەڵام ئەمرۆ، کاتێك دەچیت بۆ زانکۆی کامبریج مامۆستایەك دەبینیت پسپۆرە لە جەبردا، پرسیاری سەبارەت بە فۆرم و ناوەرۆك یاخود شوێنو کات لێدەکەیت وەڵامت دەداتەوە کە ئەوە لە سنوری پسپۆرییەکەی ئەودا نیە، ئەمەش هیچ سەرسامییەك لای تۆ ناوروژێنێت، بەپێچەوانەوە پەی بەوە دەبەیت کە ئەم پیاوەی ئەهلی هونەرو پسپۆرییە.

بێ: بیروباوەرە میتافیزیکییەکان بەخەسڵەتێك جیاووکن کە بریتییە لەوەی لە یەك کاتدا ئەقلانیو بینراویو ئەفسانەییشن، واتە ئەم (مەبەست بیروباوەری میتافیزیکییە) لەگەڵ ئەم سێ خەسڵەتە دەگونجێتو سەرچاوە یەکەمینو پشت پێ بەستراوەکانی پێکدەهێنن. ئەقلانیەت بەواتە هۆگیریو بەڵگەهێنانەوە (ئەقڵ لێرەدا بەواتە reason)، شهودی (بینراوی) بەواتە پشت بەستن بە ئەقڵێکی بینراوی

(intellect) ئەفسانەییش بەواتە هەندێ مەسائیلی میسۆلۆجی لەخۆ دەگرێت.
تیۆرە میتافیزیکیەکان مایەی خۆیان لەم سێ سەرچاوەیەوە وەردەگرن‌و لەسەریان دەژین: ئەقڵی ئیستیدلالی، ئەقڵی شهودی، ئەقڵی ئەفسانەیی. ئیبن سیناو مەلا سەدراو ئیبن مەیمون‌و هیگل‌و تۆما ئەکوینی‌و ئەوانی وەك ئەمان بوون بەم چەشنە بوون. بەڵام ئەمڕۆ هەموو ئەم تیۆریانە لە دیدی مرۆڤی مۆدێرندا ڕەونەقی خۆیان لە دەست داوە، هەر لەبەر ئەم سێ هۆکارە سەرەکییە لەرزیوون، بگرە دارماون. ئەمە جۆرێکی دیکەیە لە بێ متمانەیی، پەیوەستە بە میتافیزیکاوە. ئەم تایبەتمەندییەی مۆدێرنە لەگەڵ ئەو ڕاستییەی کە ئایینەکان خاوەن مۆرکێکی میتافیزیکی قورسن، نایەتەوە. لێرەدا قورسی بەواتای کێشی گەورەو ڕەقییەکی توند. بۆ مرۆڤی مۆدێرن ناشێت ئەم میتافیزیکە قورسەی کە ئایینەکان لێی بەهرەمەندن قبوڵی بکات‌و لەگەڵیدا هەڵبکات. نمونەش بۆ ئەمە، تۆ نەخۆش دەکەویت دەچیت بۆ عەیادە تاپزیشك بتپشکنێت‌و چارەسەری گونجاوت بۆ بنوسێت‌و چارەسەرەکە بەکار بهێنیت تا تەندروستیت چاك ببێتەوە، بەڵام ئەی ئەگەر پزیشکەکە پێی وتیت کە ئەم چارەسەرانە کاریگەرییان نابێت لەبەرئەوەی باوەرت بەوە نییە کە ئەو دەرچووی فلان زانکۆیە، تا باوەڕیشت بەوە نەبێت کاریگەری نابێت. ئاشکرایە لەم قسانەی توشی سەرسامی دەبیت. ئێستا ئەگەر پزیشکەکە هەربەوەندە واز نەهێنێت، بەڵکو سەرباری ئەمە داواشی لێکردیت کە دەبێت باوەرت بەوە هەبێت کە فلان پزیشك‌و فیسار پزیشك قوتابیی ئەم بوون‌و دەبێت وەك مەرجی دووەم بۆ کاریگەریی دەرمانەکە باوەڕ بەمەش بکەیت، کاردانەوەت چی دەبێت لە بەرامبەر ئەم داواکاریە بێ مانایانە؟ بێگومان زۆریی ئەم مەرج‌و داواکارییانە گومانی زیاترت سەبارەت بە تواناو شارەزاییەکانی ئەو وەك پزیشکێك لا دروست دەکات.
لەگەڵ ئایینە تەقلیدییەکانیشدا حاڵەتەکە بە هەمان شێوەیە کە هەموویان _سەرباری پلەی جیاوازییان_ هاوبەشن لە پشت بەستنیان بەم شێوە یان بەو شێوە بە قەناعاتە میتافیزییکیە قورسەکان، بەواتەی ئەوەی بۆئەوەی ڕێگەی ڕزگاربوون بەدەست بهێنیت لەسەرتە باوەرت بە لیستێکی دوورو درێژ لە غەیبیات هەبێت، کیرکەگۆر دەڵێت: «ڕزگاربوون، باوەرداربوون بە زۆر مەسەلەی لەرزیوومان بەسەردا دەسەپێنێت». بەڵام ئەگەر پزیشکەکە پێی وتین ئەم ڕاچێتەیە بەسوودە بۆت جا باوەرت بە بروانامەو لێهاتوویی‌و بەڵگەنامەکانم هەبێت یان نا، بێگومان ئەمە دەیسەپێنێت بەسەرماندا کە باوەڕمان بە ڕاستی ڕاچێتەی چارەسەرکردنەکە هەبێت، لەبەر ئەوەی شتگەلی میتافیزیکیانەی لە پشتەوە نییە، هەروەها لەبەرئەوەی پابەندمان ناکات باوەڕ بە شتگەلێکی زۆر بکەین لەدەرەوەی سنووری دەرمانەکەو کاریگەرییەکەی.
ئایینەکان خاوەن مۆرکێکی میتافیزیکی چرکراوەن با لەبرو ئاستیشدا جیاواز بن. لەم بوارەدا بوزا دەڵێت: ئەوەی دەیڵێم بیخەنە ژێر تاقیکردنەوەوە، ئەگەر ڕاست بوو کاری پێ بکەن، خۆ گەر ڕاست نەبوو مەیکەن، بوزا هەمیشە جەختی لەوە دەکردەوە کە ئەو (واتە بوزا خۆی) مەعسوم نییە لە هەڵە، بوزا شوێنکەوتووەکانی خۆی لەوە وریا دەکردەوە کە لەسەر ئەم بناغەیە نەبێت مامەڵەی لەگەڵ نەکەن. (بێگومان بوزییەکان پابەند نەبوون بەم ئامۆژگارییەوە، بەڵکو دەستیان کرد بە بەخوداکردنی بوزا، ئەم چیرۆکە دەگەرێتەوە بۆ کێشەیەك کە کۆمەڵناسیی ئایین لێی دەتوێژێتەوە). بەهەر حاڵ، پێکەوەبوونێك هەیە لەنێوان ئایینەکان‌و باوەڕ بە میتافیزیکا، هەر بوزیەت خۆی، دەیسەپێنێت بەسەر شوێنکەوتووەکانیدا کە باوەڕیان بە دونایدون‌و کارماو سامسارا هەبێت، هەر کەسێك باوەڕی بەم شتانە نەبێت لە شوێنەکەوتووانی ڕاستەقینەی بوزا نییە!
لە ڕاستیدا (مینۆکی) جۆرە ئایینێکە کە لایەنە میتافیزیکییەکانی بۆ کەمترین سنووری قەتیس دەبێت. ئەم ڕۆژگارە کەسانێك هەن ڕەواج بە شێوازی چارەسەری ڕۆحی دەدەن، بۆ نمونە دەڵێت: ئەم (meditation)

مێدیتەیشنە بكە لە ماوەی سێ مانگدا ئەنجامەكەی دەبینیت بەبێ ئەوەی پابەندت بكات بە باوەڕكردن بە هیچ شتێكەوە. پزیشكییە ڕۆحییەكەیان وەك پزیشكییە جەستەییە نوێیەكەی لێهاتووە، كە بۆئەوەی چارەسەرەكە كاریگەر بێت، باوەڕدار بوون بەهیچ شتێك پێویست ناكات. ئەم جۆرە پزیشكێتیە ڕۆحیە ڕوخسارێك لە ڕوخسارەكانی مینۆكی دەنوێنێت، ئەمەش لەبەرئەوەی كە ڕەهەندە میتافیزیكییەكەی تا دوورترین سنوور ڕوون و ئاسان كراوەتەوە.

## 5. زەوتكردنی پیرۆزیی لە كەسەكان:

یەكێك لە سیماكانی مۆدێرنە بریتییە لە بانگەشە كردن بۆ یەكسانی (Egalitarianism). مۆدێرنە لەڕوی مەعریفییەوە بەیەك چاو دەڕوانێتە كۆی ڕۆڵەكانی مرۆڤایەتی. یەكسانی بەواتە: بەیەكچاو تەماشاكردنی هەمووان، ئەمەش بەواتەی ئەوەی كە هەركەسێك بانگەشەی شتێكی كرد دەبێت بەڵگە لەسەر ئەو شتە بهێنێتەوە، گەر ئەمەی كرد قسەكەی پەسەند دەكرێت، ئەگەرنا قسەكەی پەسەند ناكرێت، ئەمەش بەواتای داماڵینی پیرۆزی لە كەسەكان، كە وشەیەكی نارۆشنو نامەفهومە، بەڵام جگە لەو وشەیە هیچ وشەیەكی دیكەم نەدۆزییەوە.

بەهەر حاڵ، كاتێك دەڵێم (داماڵینی پیرۆزیی لە كەسەكان) ئێوە واتایەك تێدەگەن، منیش لەم دەربڕینە ئەو واتایەم مەبەستە. ئەم كارەش لەگەڵ ئایینەكاندا واتە لەگەڵ ئەو شتانەی كە لەسەر ئاستی ئایینەكان باون لە قبوڵكردنی پیرۆزكردنی كەسانێك یەكتر دەبڕێو نایەتەوە، بگرە هەندێ جار دەگاتە بەخواوەند كردنیان. بوزا، كە شوێنكەوتووەكانی لە بەپیرۆز تەماشاكردنی خۆی وریا دەكردەوە، لە ڕوانینی شوێنكەوتووەكانی خۆیدا بوو بە خوا، جا ئەبێ بۆ ئەو كەسانە چۆن بێت كە شوێنێكی جیاواز لە خەڵكی ئاسایی بۆ خۆیان دادەنێن. لێرەدا ویژدان دەیسەپێنێت كە دان بەوەدا بنرێت هیچ یەكێك لە دامەزرێنەرانی ئایینو ئایینزا ناسراوەكانی دنیای ئەمرۆ جیاوكێكی تایبەتییان لەخۆیاندا نەدەبینی تا وایان لێ بكات كە لەسەرو ئاستی پرسیارو گفتوگۆوە بن. بەڵام لەپەیوەند بە موریدەكانیانەوە ڕەوشەكەمان بەو جۆرە نییە، ئەو موریدانەی كە لەسەر باشتریی هێڵی مورشیدەكانیان دەمەقاڵەیان كەوتە نێوان، موریدی یەكەم وتی: ڕێگەی مورشیدەكەم لە ڕێبازی مورشیدەكەت باشترە، موریدی دووەمیش وتی: نەخێر ڕێبازی مورشیدەكەی من باشترە. دەمەقاڵەكەیان توند بۆوە، بڕیاریاندا پەنابەرنە بەر هەمان دوو مورشیدەكە، یەكێك لە موریدەكان بە مورشیدەكەی وت: من دەڵێم ڕێبازەكەی تۆ لە ڕێبازەكەی فلان مورشید باشترە، بەڵام موریدەكەی فلان دەڵێت ڕێبازەكەی ئەو باشترە، هاتووین حوكممان بكەیت. مورشیدەكە تۆزێك ڕاماو پاشان وتی: بۆ ویژدان ڕێبازی فلان كەس لە ڕێبازەكەی من باشترە. هەر دوو موریدەكە لە دادگاكە هاتنە دەرەوە، ئەوەیان كە بەزی بوو وتی: مورشیدەكەم تەنانەت نرخی ڕێبازەكەی خۆیشی نازانێت!

دەتوانیت بڵێیت كە مرۆڤ تەنانەت لە جیهانی مینۆكییشدا ڕەنگە بگەڕێتەوە بۆ كەسێكی دیكە، وەك مامۆستا (ناڵێم شێخ یان مورشید یاخود مورید). بەڵام بیریشمان نەچێت گەڕانەوە بۆ لای مامۆستا پیرۆزكردنی مامۆستا نییە. ئەم گەڕانەوەیە وەك گەڕانەوە بۆ لای پزیشك وایە. تۆ ناتوانیت بەمەبەستی تاقیكردنەوەی كاریگەریی گژوگیاكان لە چارەسەر كردنی نەخۆشی جەستەییدا گشت گژوگیای هەموو دنیا بدەیتە بەرەوەو بیبریت، بەبیانووی ئەوەی كە ئارەزووت نییە ڕاوێژ بە پزیشك بكەیت. پێت دەوترێت تۆ ناتوانیت خۆت لەو ڕێگە دوورو درێژە نەبان بكەیت كە مرۆڤایەتی لە ماوەی هەزاران ساڵدا تەی كردووە و بێیت لە سفرەوە دەست پێ بكەیت. كەواتە پێویستە لەسەرت سەردانی پزیشك بكەیت، بەڵام ئەگەر سەردانیت كرد مافی ئەوەت نییە كە بڵێیت مادەم پزیشكەكە فلان كەسە ئەوا ئیتر هەر دەرمانێك كە ئەو دەینوسێت كاریگەری

دەبێت. پێویست ناکات بڵێیت دەبێت سەرلەنوێ هەموو گژوگیاکان تاقیبکەینەوە، هەروەها پێویست ناکات بە ڕەهایی پشت بە قسەکانی پزیشکەکە ببەستیت و پێت وابێت کە هەر دەرمانێك ئەو دەینوسێت دەرمانێکی ڕاستو کاریگەرە. ئەم دوو حاڵەتە توندڕەوانەن و پێویستە ڕێگەیەکی مامناوەنجی لە نێوانیاندا بگریتە بەر. ڕێگاکە لە سفرەوە دەست پێناکەین، متمانەی ڕەهاش بەو قسانە ناکەین کە پزیشکەکە دەیانڵێت، چونکە هێشتا ئەو کاریگەرییانەمان بەرهەست نەکردوە کە دەرمانەکە دایاندەنێت. گەرانەوە بۆ لای مامۆستا لە سنوری مینۆکیدا کارێکی زۆر ئاساییە، بەڵام بەمەرجێك بۆ مەبەستی کورتکردنەوەی ماوەکە و دوورکەوتنەوە بێت لەوەی کە لە سفرەوە دەست پێ بکەین. بەڵام ئەم کرداری کورتکردنەوەیە چۆن ئەنجام دەدرێت؟ ئەم کردارە لە ڕێی تاقیکردنەوەی ئەو دەرمانانەوە ئەنجام دەدرێت کە پزیشکەکە پێشکەشی دەکات، بێگومان گەر کاریگەرییان هەبوو، خۆ گەر نەیانبوو تۆ ناچار نیت بەم ڕاچێتەیەوە کە سەربارى ئەوەی بێ کاریگەریش بووە پابەند بیت پێیەوە. ئەمە واتای پیرۆز نەکردنی مامۆستایە. ئێمە قسەکانی مامۆستا دەخەینە ژێر تاقیکردنەوەو ئەزموونەوە، گەر لە تاقیکردنەوەکەدا دەرچوو پەیڕەوی لێدەکەین خۆ گەر دەرنەچوو ئەوا هیچ. ئەمە سیمای پێنجەمە لەو سیمایانەی کە ئاینی مێژوویی‌و خوێندنەوەی تەقلیدی بۆ ئاین نیانە.

## 6. ئایینە مێژووییەکان ئەحکامو پاشبەندو پاشکۆگەلێکیان هەیە، مرۆڤی مۆدێرن دەزانێت کە ئەو ئەحکامو پاشبەندو پاشکۆگەلانە بەرئەنجامی ئەوەن کە ئەم ئایینانە ناوخۆیین (LOCALITY):

کاتێك سەرپێیی تەماشایەکی هەموو ئاینو ئایینزا مێژووییەکان دەکەیت، تێبینی دەکەیت کە زۆربەی ئەو شتانەی لەم ئایینانەدا هەن، لە وانە تیۆریو ئەحکامە کرداریەکان، لە ڕاستیدا دەگەڕێنەوە بۆ ئەوەی کە ئەم ئایینانە لە برگەیەکی مێژووی تایبەتدا دەرکەوتوون، و لە پێگەیەکی جوگرافی تایبەتو لە سایەی بارودۆخو هەلومەرجێکی کولتووریو حەزاری تایبەتدا سەریان هەڵداوە. قورئان دەڵێت: {أفلا ينظرون إلى ا بل کیف خلقت} ناڵێت: «أفلا ينظرون إلى الفيله كيف خلقت»، لەکاتێکدا زۆربەی ئەو خوازەو لێکچواندنانەی لە هەردوو ئایینی بوزیو هندۆسیدا هاتوون باس لە فیل دەکەن، لەبەرئەوەی ئاژەڵێکە زۆرترین ئامادەیی هەیە لە نیمچە کیشوەری هندیدا، کە ئەم دوو ئایینە تیایدا سەریان هەڵداوە.

لە ڕاستیدا مینۆکی وا دەخوازێت کە ئایینەکان داماڵرێن لە هەموو ئەو شتانەی کە پەیوەستن بەو تایبەتمەندییانەی کە ناوخۆیین (Locality). تایبەتمەندیی ناوخۆیی (Locality) لە هەموو ئاینو ئایینزاکاندا هەیە. ئەم تایبەتمەندییەش لە سەر هەمان ئەحکامو تەعالیم پاشەکشە دەکات. بۆ ئەوەی بگەینە (مینۆکی) دەبێت مەسەلە ناوخۆییەکان (Local) هەڵپاچین تا لەو ڕێیەوە دەگەینە مەسەلە گشتییەکان (Universal).

کاتێك لەو باوەڕەداین خەڵکی هەموو کە لە شوێنو کاتگەلێکی جیاوازدان، دەکرێت خەڵکێکی بەختەوەر بن سەرباری جیاوازیی بیرو باوەڕشیان، ئەمە بەواتای ئەوەی کە تۆ دان بەوەدا دەنێیت کە ئەو بیروباوەڕانە هیچ دەخلێکیان بەسەر بەدیهێنانی بەختەوەری یان چەرمەسەرییەوە نییە. ئەمەش بەجێی خۆی بەواتای ئەوەی کە ئەو بیروباوەڕە جیاوازانە خاوەن تایبەتمەندییەکی ناوخۆیین (Local).

ئەو دیدە مێژووییەی کە مرۆڤی مۆدێرن لەسەر ئایینەکان هەیەتی، ڕێبەری کردووە بۆ ئەوەی باوەڕ بەوە بهێنێت کە هەندێ لە بیروباوەڕی ئایینەکانو ئەحکامو ئەو تەعالیمانەیان کە خاوەن مۆرکێکی ناوخۆیین،

هی قۆناغو جێگەو بارودۆخێكی تایبەتن.

ئەمرۆ، ڕۆحێك هەیە فەرمانڕەوایە بەسەر پانتایی مینۆكیدا، پوختەكەی ئەوەیە: ئایین بۆ مرۆڤە نەك مرۆڤ بۆ ئایین بێت، واتە ئایین هاتووە خزمەت بە مرۆڤایەتی بكات. هەر وەك دەربڕینە عیساییەكە دەڵێت (شەمە بۆ مرۆڤە نەك مرۆڤ بۆ شەمە). لەبەر ڕۆشنایی ئەمە، ناكرێت لەبەر ڕێزی شەممە خزمەتكردنی مرۆڤایەتی بوەستێنین.ئەم خوێندنەوەیە خوێندنەوەیەكی هاوچەرخانەیە كە گەرەكییەتی بڵێت هیچ شتێك لە مرۆڤ بەڕێزتر نیە. كاتێكیش دەڵێین كە هەموو شتێك لەخزمەتی مرۆڤدایە مەبەستمان ئەو واتا وردو دەقیقەیە كە لە نێو ئەوانەدایە كە چواردەوریان گرتووە، نەك ئەو خزمەتەی كە تەركیز دەكاتە سەر لایەنی مادیی لە ژیانی مرۆڤدا. بە تەقدیری من، دەبێت مینۆكی شێوەیەك بۆ خۆی دابڕێژێت بەو شێوەیەی كە دەریدەخەم، ئایینەكانیش، گەر ویستیان لە خزمەتی مرۆڤی مۆدێرندا بن لەسەر ئەم شێوەیە خۆیان ڕێك بخەن، جا ئەوجاش پێویستە لەسەریان بە هەموو ئەو كارانە هەستن كە ئاماژەیان پێدرا.

یەكەمین كارێك لەو كارانەی كە پێویستە لە ڕاست بەدیهێنانی شێوەیەك بۆ مینۆكی ئەنجامی بدەین بریتییە لە دەستنیشانكردنی كێشەو گرفتەكانی مرۆڤ. گەر ئەو كتێبانە بخوێنیتەوە كە لە بواری پزیشكیی دەروونیو دەروونزانیدا نووسراون، یان سەرپێیی تەماشایەكیان بكەیت، هەر بە سروشتی بارودۆخەكە، تێدەگەیت كە ئەو كێشەو گرفتە دەروونیانە چین كە مرۆڤ بەدەستیانەوە دەناڵێنێت. هەروەها دەتوانرێت لەم كتێبانەدا نەخۆشیو كێشەگەلێكی هەمەجۆرو هەمەچەشن بدۆزرێتەوە. هەروەك ئەگەر كتێبەكانی كۆمەڵناسی بخوێنیتەوە بەتایبەتی ئەوانەیان كە سەبارەت بە لێكۆڵینەوەی نەخۆشیو دەردە كۆمەڵایەتییەكان دەنوسرێن، دیسان ڕوبەڕوی لیستێكی پانوپۆڕ لەو گرفتانە دەبیتەوە كە مرۆڤی ئەمرۆ بەدەستیانەوە دەناڵێنێت. مەسەلەكە لەگەڵ كتێبەكانی ئابووریو ژینگەو سروشتو بیرو ڕۆشنبیریش هەر وایە. گەر ئەم هەموو كێشەو نەخۆشییانە لە لیستێكدا كۆبكەیتەوە ئەوا ژمارەیان دەگاتە هەزاران كێشەو دەردی فەردیو بەكۆمەڵیی هزریو ڕۆشنبیریو كۆمەڵایەتیو سیاسیو ئابووریو زانستیو پەروەردەییو مەعریفیو عەقائیدیو دەروونیو سۆزداری، هەروەها گرفتگەلێك كە پەیوەستن بە بواری كارو كارگێڕییەوە.

بە سەیركردنێكی پشكنینئامێزانەی ئەم لیستە دوورو درێژەی گرفتو كێشەكان بۆمان دەردەكەوێت كە لە پێشبڕكێیەك لەباری درێژیدا ڕێكخراوە، بەواتە هەندێ لەم كێشانە لە هەندێكی دیكەیانەوە سەریان هەڵداوە، بەچەشنێك كە ئەگەر ئەمەیان نەبووایە ئەوا ئەو دیكەیان نەدەبوو، ئابەم شێوەیە لە سیاقێكی تەرتیبیی لەدوای یەكدا. هەموو ئایینێك لەسەریەتی كە ئەو كێشەو گرفتانە بۆ مرۆڤی مۆدێرن بخاتە ڕوو كە زەمینەی باقی كێششەو گرفتەكانی دیكەن، بە هەر دوو جۆرەكەیەوە تیۆریو پراكتیكی. لێرەوە، هەر تەنها دەستنیشانكردنی زۆریی كێشەكان گرێكە چارەسەر ناكات، بەڵكو دەبێت وێنەی هەرەمیی هەڵگەڕاوەی نەخشەیەك بۆ ئەم كێشانە بكێشرێت و ڕۆشنایی بخرێتە سەر كێشە بنەڕەتییەكان، ئەمەش سێ بارودۆخو وێنەی هەیە: یان ئەوەتا بزانین ئەو كێشەیە چییە كە باقی كێشەو گرفتەكانی دیكە لێیەوە سەرهەڵدەدەن، یان هۆكاری كێشەكان بزانین، یاخود زۆرینەی كێشەو گرفتەكان بدۆزینەوە. ئەمە قۆناغی یەكەم. قۆناغی دووەم زانینی ڕەگوریشەی ئەم كێشانەو هۆكارەكانێتی، بەڵام قۆناغی سێیەم هەوڵدانێكە بۆ ناسینی ڕێگەیەك بۆ چارەسەر كردنی ئەم كێشانە. قۆناغی دواتر بریتییە لە ماهیەتی ئەو شێوازە زانستیانەی كە كەفیلن بە گەیشتن بەم ئامانجە، ئەمەش لەبەرئەوەی دەشێت ڕێگاچارەیەكی تیۆری بۆ كێشەیەكی دیاریكراو بدۆزینەوە، بەڵام سەرباری ئەوەش شێوازی كرداری بۆ بەدیهێنانی ئەم چارەسەرە نەزانین. هەر هێندە بەس نیە كە پزیشكی دەروونی پێت بڵێت: كێشەكەت ئیرەییە و چارەسەرەكەت ئەوەیە خۆتی لێ بەدوور بگریت. گرنگ ئەوەیە ڕێگەی دەربازبوون لە ئیرەیی بردنت بۆ ئاشكرا بكات.

قۆناغی پێنجەم و کۆتایش زانینی گرەنتییەکانی دەربازبوونە. لەبەرئەوەی رەنگە من لە دیاریکردنی کێشەکەدا سەرکەوتوو بم، هەروەها لە دەستنیشانکردنی رێگەچارەکەشدا، بەڵام گرەنتی چییە کە بارودۆخەکەم باشتر دەبێت؟!

بەپێی نەریت لە ئایینی هندۆسیدا دەوترێت، گرەنتی باشتر بوونی بارودۆخت یاسای (کارما)یە، لە ئایینی مەسیحیشدا گرەنتی باشتر بوونت لوتفی خودایە، واتە گرەنتی باشتر بوونت لوتفی کەسێکە نەک یاسا. گەر هەر ئایینێك توانی سیستەمێکی خۆبەخۆ لەسەر ئەم شێوەو جۆرە بۆ خۆی دابڕێژێت ئەوا سەرکەوتنی لەم دنیایەدا بۆ دەنووسرێت، ئەمە لەکاتێکدا ئێمە دەزانین کە دارشتنی سیستەمێکی لەم چەشنە گرێدراوە بە ئەنجامدانی ئەو ئەرکانەی کە پێشتر ئاماژەیان بۆ کرا.

بە بۆچوونی من مەسەلەو کێشە بنەرەتییەکانی مرۆڤایەتی، لە ئازارو ئەشکەنجەو چەرمەسەرییدا خۆی دەبینێتەوە، دەبێت کار بکرێت بۆ دیاریکردنی هۆکاری ئەم ئازارەو دەستنیشان کردنی رێگەی زانستییانە بۆ لابردنی، هەروەها دەستنیشانکردنی گرەنتییەکانی بەختەوەری و رزگاربوون (لێرەدا مەبەست لە رزگاربوون بەواتە رزگاربوون لە هۆکاری ئازارەکەیە، جا ئەو ئازارە هەر شتێك بێت).

پێویستە ئەقڵانیەت و مینۆکی کۆبکەینەوە، تا روبەروی چارەنووسی ئەو میللەت و شارستانییانە نەبینەوە کە دەستیان گرتووە بە ئەقڵانیەتەوە و قوربانییان بە مینۆکی داوە، یان بەپێچەوانەوە، ئەمەش بۆتە هۆی وێرانبوونیان. بۆ نمونە شارستانیەتی هندیی کۆن خەڵکەکەی بایەخیان بە مینۆکی دەدا لەسەر حسابی ئەقڵانیەت، ئەوەبوو شارستانیەتەکەیان کوژایەوەو سرایەوە. شارستانێتی نوێی خۆرئاواش دەستی گرتووە بە ئەقڵانیەتەوە و قوربانیی بە مینۆکی داوە، بۆیە دەگاتە بەردەم رێگەیەکی داخراو. ئەمە بوو کە موروواو پاشان ئەندرێ ماڵرۆی والێکرد بڵێن: (پاشەرۆژ، یان نابودبوونی مرۆڤ بەخۆوە دەبینێت، یاخود مانەوەی مینۆکیی مرۆڤ)، ئەمە ئاگادارکردنەوەیەکی راشکاوانەیە لەوەی کە شارستانێتی نوێی مرۆڤایەتی بەهۆی نەبوونی مینۆکییەوە، لەسەر رێگەی نەمانە.

## سەرچاوە:

http://www.assuaal.net/studies/studies.32.htm

## پەراوێزەکان:

١- مستەفا مەلەکیان_ نووسەرو بیرمەندێکی ئێرانییە.

٢- ئەم پابەندکردنە بە واتای ئیلزامی یاسایی نا، بەڵکو گوزارشتە لەوەی کە وازهێنانی مرۆڤ لە ئایین کێشەو گرفتی زۆری بۆ دروست دەکات.

# نەبوونی ئاگۆراو مۆدێرنیتەی ناتەواو

عبدالله کەیخۆسرەوی
لە فارسییەوە: کاوە گوڵکار

## مۆدێرنیتە بە بێ ئاگۆرا ناتەواوە:

ئەگەر مۆدێرنیتە لە ڕۆژئاوادا پڕۆژەیەکی ناتەواو بێت ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ بەردەوامی مۆدێرنە، بەڵام لە ئەم لای ئۆقیانووسەکانەوە، ئەم پڕۆژەیە بێ سەر و بنە نەک ناتەواو. چون هێشتا دەستی پێنەکردووە تا ناتەواوبێت. ڕاستە ناتەواوە لەبەرئەوەی ناوەخت و بێ بەرنامەیە. دێوەزمەیەکی بێ سەرو قاچە کە زۆربەی ئەندامەکانی بزربووە یا لە شوێنی خۆیدا نییە. پرسیار ئەمەیە کە ئەم بوونەوەرە سەیرە هەناسە ئەداو بەڵام بوونی نیە. بۆ نابێ ئەم بوونەوەرە ببێت و بەڵام هەشە؟ لە ڕاستیدا «بوون» یانی چی؟ مەبەستی ئێمە بوون مانا فەلسەفیەکەی وجوود نیە بەڵکە بوون لەو مانادا بەکاری دێنین کە جەماوەر دەیڵێن فلانەکەس بوونی هەیە. وەکو خێوو جنۆکە یاخود ئەڵێن فڵانە کەس جەوهەردارە «بە جەوهەر». کەوابوو بۆ ئەم رەوتی مۆدێرنتیەی ئێمە بێ جەوهەرە.

ئێمە ئەمانەوێت زەرەروزیانی ئەم دۆخە کە ئاڵوودەی بووین شی بکەینەوە، بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەش ئەبێ بگەڕێینەوە بۆ ڕابردوو، بۆ مێژوو یانی ئەو شتەی کە بەردەوام ئێمەی ئازار داوە. فرێدریک جیمسۆن ئەڵێ: «مێژوو شتێکە کە ئێمە ئازار ئەدات» بە واتایەکی تر هەر شتێک مرۆڤ ئازار بدات مێژووە. وەبیر هێنانەوەی مێژوو ئێش و ژانی لەگەڵدایە و ئەوەی دڵ ئەکاتەوە و شادی هێنە مێژوو نیە بەڵکو بیرەوەریە. مرۆڤ بەردەوام حەز ئەکات بیرەوەریەکان دوبارە بکاتەوەو مێژوو بنێت بە تاقەوەو لە بیری بکات. ئەمەش سروشتییە کە مرۆڤ ئازارەکان دوور بخاتەوە یان لە لاشعور «ناخودئاگا»دا هەڵیبگرێت. بەڵام پرسیار ئەمەیە: ئەگەر میکانیزمی نەست و ڕۆح لە بەرانبەر کارەسات و مێژوودا فەرامۆشکردن بێت کەواتە کێ ئەم هەموو کتێبە مێژوویانە ئەنووسێتەوە؟

ڕاستە براوەکان مێژوو دەنووسنەوە گەر پێچەوانە بوایە و دۆڕاوەکان بیاننووسیایە مێژوو زۆرتر

# سەردەم

لە ڕۆمانی تراژیک ئەچوو، بۆ وێنە «مێژووی بەیهەقی» و حیکایەتی لە سێدارەدانی حەسەنی وەزیر. ڕۆح حەزی لە وتنەوەی بیرەوەری و بەرهەمهێنانەوەی دوبارەی ئەوانە و بەم شێوە بیرەوەری ئەچێتە زاکیرەی گشتی و لەوێدا بالاّ ئەکات و دەوڵەمەند ئەبێت. بەڵام لەبیرکردنی عەمدی، لە ڕۆحی تاک و ڕۆحی گشتی کۆمەڵدا چەند چاڵێکی ڕەش بەجێدەهێڵێت کە نزیک بوونەوە لێیان ترسهێنەرە. هەر بۆیە ڕۆح ئینکاری ئەکات. کۆبوونەوەی ئەم چاڵانە هەرەس و داڕمانی لە شوێنە. هەر بۆیە هەندێ نەتەوە ڕەوتی تەکامولی سروشتیان لێ بزر دەبێت و ڕێگەی پێشکەوتنیان پڕ دەبێ لە تاسەو چاڵ و چۆڵ. منداڵی ئەم مۆتەکە هەر دەبێ مەنگۆل بێت و باش و خراپ لای ئەو جیاوازی نەبێت. فەرامۆشی لە مانایەکی تردا، نەبوونی «ئاگۆرا»یە کە مەنگۆلیسمێکی تەواو عەیارە.

غەفڵەت و غایب بوون ڕەوتی ئاسایی پەرەسەندن بەرەو داڕمان دەبەن.. واتا مۆدێرنیتە عەیبدار و هەستی بێ بەش بوون و نائومێدی سەقامگیر دەکات. بیرەوەری تاک دەبێتە پێناسەی یادگەی گشتی و وەکو گۆڕەپانێکی گشتی، ژیانی گشتی بەو دەوڵەمەند دەبێت و ئەم زەنگینینیەتە تەنیا لە ژێر تیشکی پەیوەندیدا جێبەجێدەکرێت و خودی پەیوەندی بەرهەمی پیرۆزی ئاگۆرا و ئاگۆراش مافی سەلمێندراوی هاووڵاتیانە.

لەلایەکی دیکەشەوە چێژوەرنەگرتن بەرهەمی ناموبارەکی نەبوونی پەیوەندی و سڕینەوەی گۆڕەپانە گشتیەکانە. لە هەموو ئەمانەش گرنگتر تایبەتمەندی سەرەکی ئاگۆرا واتە «تێڕامان و تێفکرین و لەسەرەخۆبوونە» کە لە شارێکی پڕ لە ئۆتوبان و شارێدا، جێگەیەک بۆ ئەمانە نیە. هەر بۆیە دیالەکتیکی تێڕامان و ئیجبار لە خێرایدا، تەنیا دۆش دامان و بێ جم وجوڵی گشتی لێدەکەوێتەوە. مرۆڤی بێ دەسەڵات و ناچالاک زیادەیە و مرۆڤی زیادەش هەر چاوەڕێی بەربەریەتی لێدەکرێت. بە کورتی مۆدێرنیتە بەبێ ئاگۆرا ناتەواوەو کۆبوونەوەی مرۆڤی ناچالاک بەبێ پاڵپشتێکی فکری جێگەی مەترسیە. کۆبوونەوەی مرۆڤی زیاد ئاژاوەی لێ دەکەوێتەوە. نیزامی یاسایی سەرچاوەی بیرکردنەوەیەو دابڕان لە بیرکردنەوەش کاتێ ڕوودەدات کە پلە و پایەی یاسایی نیزامێک لەبەرچاو نەگیرێت. خودی بیرکردنەوە شتێک جگە لە ملە و کێشە و بەرە لەگەڵ «حەق» دا یا ڕامان لە چۆنیەتی «باطل»دا نیە. بێگومان هونەر تەنیا «جوانی بێ ناوەڕۆک» نیە و لە بنەڕەتدا، فەلسەفە و بیرکردنەوە گەڕان بە شوێن وەزعیەتێکدایە کە دەبوو ببوایە بەڵام نیە یاخود دیاری کردنی شوێن و ڕێز و مەقامی مرۆڤەکە دەبوو بیبوایە بەڵام نیەتی.

ئەزانین یەکێک لە بنەما گرنگ و سەرەکیەکانی کولتوری مرۆڤایەتی بەرهەمی هونەریە. هونەر وەکو ڕێزمانی بیرکردنەوە یاخود تەماشاخانەی ئەزموونەکانی مرۆڤایەتی. هونەر وەکو ئاوێنەیەک بۆ پیشاندانی چۆنیەتی نیزامی مافی مرۆڤ. بە لە بیرکردنی ئاگۆرا ئاساییە کە هونەر پشتمان تێ بکاو جیهان ببێتە گۆڕەپانی بێ هونەران و زڕە هونەرمەندەکان.

**سەرچاوە:**

گۆڤاری ڕاسان

# ڕۆشنبیرانی ڕوس و پەیوەندییان بە ڕۆژئاواوە

**هاشم سالّح**
**لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع**

دانەری ئەم کتێبە یەکەم کەسە لە زانکۆی سۆربۆن، ناوەندی توێژینەوەی ئیستاتیکای هونەری ئیسلامی دامەزراند کە یەکەم ناوەندی لەو شێوەیەیە لە جیهاندا. کتێبەکەی دەربارەی (ئیسلامو هونەری ئیسلامی)، بووەتە سەرچاوەیەک بۆ هەموو توێژەران. هەروەها کۆمەڵێ کتێبی دەربارەی فەلسەفەی «سیپینۆزا»و «بێرگسۆن»و مەیلی هیومانستی هاوچەرخ نوسیوە. ئەو یەکێکە لەو کەسە لێهاتوانەی کە شارەزاییەکی گەورەیان دەربارەی عەقڵیەتی ڕوسیو فیکری ڕوسی هەیە. لەبەرئەوە ئەم کتێبەی دێتو ناتەواویەک لە کتێبخانەی جیهان پڕدەکاتەوە، چونکە ئێمە تەنها شتێکی کەم لەسەر فەلسەفەی ڕوسی دەزانین.

«ئەلکسەندەر بابا دۆبلۆ»ی توێژەر، یەکێکە لەو کەسە پێشەنگانەی بە زمانی فەرەنسی، کتێبێکی تەواوی دەربارەی فەلسەفەی ڕوسی بڵاوکردوەتەوە. بایەخدانی نوسەر بەم بابەتە بۆ هۆکاری شەخسی دەگەڕێتەوە، ئەو لە شاری کیفو لە دایکێکی ڕوسی لەدایکبووەو بڕوانامەی دکتۆرای لە فەلسەفە وەرگرتووە. لە ڕاستیدا ئەم کتێبەی هەوڵی بەدەستهێنانی دوو ئامانج دەدات، یەکەمیان ئەوەیە دەیەوێت بیسەلمێنێت لە ڕوسیادا فەلسەفە هەیە، بە مانایەکی دیکە فەلسەفەی ڕوسی تەنها دەنگدانەوەیەکی ڕەنگزەردی فەلسەفەی ئەوروپی یان خۆرئاوایی نییە. دووەمیان ئەوەیە دەیەوێت پیشانمان بدات ئەم فەلسەفە ڕوسییە چەند لەژێر کاریگەری خودی فەلسەفەی ڕۆژئاوادایە. نوسەر بۆ بەدیهێنانی ئەو دوو ئامانجە، لەمیانەی سێ سەدەی ڕابردودا، دەروازەیەکی فراوانمان بۆ

چونەناو فەلسەفەی ڕوسی پێشکەش دەکات. تییێدا قسەمان لەبارەی ناوە ناودارەکانەوە بۆ دەکات، لە نمونەی «هێرزین، گۆگۆڵ، تۆڵستۆی، دیستۆفسکی، بێردایێف، باکۆنین، لێنین، سۆڵجنستن»، هەروەها قسە لەسەر هەندێ ناوی دیکە دەکات کە کەمتر بەناوبانگن، وەک «کۆمیاکۆف، سۆلۆفیف، بلیخانۆف»...هتد.

ئەم فەلسەفەیە فەلسەفەیەکی ڕوسی ڕووتە، فەلسەفەیەکە گوزارشت لە ڕۆحێکی قووڵی نیشتیمانی ڕوسیای سلاڤی دەکات. ئێمە گەر لەو فەلسەفەیە بڕوانینو بیخوێنینەوە، دەبینین ڕوسەکان چۆن لە ژیانو مەرگ، لە دادپەروەریو ستەم، ئەخلاقو ئاین، ئیستاتیکاو هونەر، مێژوو مانا، دەڕوانن. ژمارەیەک لە فەیلەسوفە سلاڤییەکانو بیرمەندە ئاینییەکان کە زۆر پابەندی مەزهەبی ئەرسەدۆکسی بون، واتە ئاینی نیشتیمانی ڕوسیا، گوزارشتیان لەو بابەتانەی سەرەوە کردووەو هەڵوێستی خۆیان دەربڕیوە. بەڵام دەستەیەکی دیکە لە فەیلەسوفانی ڕوسیا هەیە کە لەژێر کاریگەری فەلسەفەی ئەوروپاو ڕۆژئاوادا بوون، بۆیە پێیان دەوترا (غەربزەدەکان)، وەلێ ئەو دەستەیە گەرچی لەژێر کاریگەری فەیلەسوفانی ئەڵمانیاو فەرەنساو ئینگلتەرەدا بوون، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا لە قوڵایی ڕۆحیاندا هەر بە ڕوسی مانەوە. بەم شێوەیە دەبینین فەیلەسوفە ڕوسەکان، لە فەیلەسوفە عەرەبو موسڵمانە هاوچەرخەکان دەچن، چونکە ئێمەش بەدەست مەسەلەی ڕەسەنایەتیو هاوچەرخایەتی، کەلتورو تازەگەرییەوە دەناڵێنین. ئێمەش لەژێر کاریگەری دوو سەرچاوەی سەرەکیداین: کەلتوری عەرەبی–ئیسلامی ڕەسەن لەلایەکەوە، کەلتوری ئەوروپای تازەگەر لەلایەکی دیکەوە. ئێمەش بۆ دوو بەش دابەشبوین: بەشێک بە ئاستی جۆراو جۆر نزیکە لە فێندەمێنتیاڵیزمی ئاینی یان نەتەوەیی، هەروەها بەشەکەی دیکەش بە ئاستی جۆراوجۆر نزیکە لە لیبرالیزمو فیکری مۆدێرن. دەکرێ نامەیەکی دکتۆرای قەبە لەسەر شێوازەکانی لێکچونی ڕۆشنبیرانی ڕوسیو ڕۆشنبیرانی عەرەب، لە پەیوەندیاندا بە ڕۆژئاواوە بنوسرێت، پەیوەندییەکە چ پەیوەندی سەرسامبونو کاریگەربوون بێت بە ڕۆژئاوا یان ڕقلێبونەوەو نەفرەتلێکردن بێت.

پێدەچێت ڕوسیا بەدەست هەمان کێشەوە بناڵێنێت، واتە کێشەی ململانێی نێوان کەلتورو تازەگەری، ئەمەش دوای ئەوەی قەیسەری مەزن (بترۆسی گەورە) ڕوسیای خستە ناو کەشوهەوای سەدە تازەکانەوەو هەوڵیدا لاسایی ڕۆژئاوا بکاتەوە. ئەمە هەمان ئەو ڕۆڵە بوو کە «محەمەد عەلی» دواتر سەبارەت بە ڕێنیسانی میسریو عەرەبی پێیهەستا. بەڵام هەندێ لە فەیلەسوفە ڕوسەکان، بە شێوەیەک کەوتنە ژێر کاریگەری ڕەوتە فەلسەفییەکانی ڕۆژئاوا، ڕۆحی خۆیان یان ڕەسەنایەتی (ڕوسی)یان لەدەستدا. هەندێ لە ڕۆشنبیرانی عەرەبیش بە هەمان ئاقاردا ڕۆشتنو بە هەمان شت تۆمەتبار کران. بۆ نمونە لایەنگرانی فەلسەفەی وەزعی، مادیی، ئایدیالیزم، ڕەخنەی نوێ...هتد. دانەری کتێبەکە بایەخ بەو تەرزە فەیلەسوفانە نادات، چونکە پێیوایە ئەوانە دەیانتوانی لە دەرەوەی ڕوسیا بەرهەمەکانی خۆیان بنوسن، ئەوانە هیچ شتێکی ڕوسیان تێدانییە تەنها ناوەکەیان نەبێت. دانەر دەیەوێت بیسەلمێنێت لە ڕوسیا، سەبارەت بە فەلسەفە وێنەیەکی هاوسەنگ هەیە، بۆیە ناکرێت فەیلەسوفانی ڕوس بۆ دوو دەستە دابەشبکرێن: دەستەی فەیلەسوفە سۆفییە ئیماندارەکانو

دەستەی مارکسییەکان، بەڵکو چەندین ڕەوتی فیکری جیاواز جیاوازی دیکە لە ڕوسیادا هەیە.

جگە لەوە، دوای ئەوەی ڕوسیا لە سەدەی هەژدەهەمو لەسەر دەستی «بترۆسی گەورە» پێی نایە ناو چاخی تازەگەرییەوە، چەندین زانای گەورەو مەزن لە بوارەکانی سروشتو فیزیاو کیمیاو گەردونزانیو بیرکاریدا دەرکەوتن، ئەو زانایانە سەبارەت بە بوونو ژیان، بیروڕای فەلسەفی خۆیان هەبوو. بوونی ئەو زانایانە ئەوە دەسەلمێنێت ڕوسەکان هەر هەموویان سەر بە ڕەوتی ئایدیالیزمی تۆباوی یان ڕۆژهەڵاتی نین، وەک ئەو وێنە بەربڵاوەی دەڵێ: ڕۆژهەڵات ڕۆژهەڵاتەو ڕۆژئاوا ڕۆژئاوایەو هەرگیز بەیەک ناگەن.

لێرەوە لە ڕوسیادا خەڵکانی واقعبین هەیە کە ئاڵای زانستیان بەرزکردۆتەوەو بە شێوەیەکی لۆژیکیو ئەبستمۆلۆژیانە کاردەکەن، واتە کار بە فەلسەفەی مەعریفە یان فەلسەفەی زانست دەکەن. گەر وا نەبوایە، نەیاندەتوانی بگەنە مانگو گالیسکەی ئاسمانی دروست بکەنو نەیاندەتوانی لە بورای پیشەسازی چەکدا، ململانێی ئەمریکا بکەن. دانەری کتێبەکە پێیوایە ئاینی مەسیحی لە مەزهەبە ئەرسەدۆکسییەکەیدا، ڕۆڵێکی گەورەی بینیوە لە دروستکردنی کەلتورو عەقڵیەتی ڕوسیدا، گەر ئەم مەسەلەیە لەبەرچاو نەگرین، ناتوانین لە گەورە نوسەرانی وەک «تۆڵستۆی»و «دیستۆفسکی» تێبگەین. ئێمە کاتێ ئەمە دەڵێن، لە هەمانکاتدا دەزانین ئەو دوو نوسەرە گەورەیە، هەردوکیان لەژێر کاریگەری فیکرو فەلسەفەو ڕەوتی ڕۆمانی ئەوروپیدا بوون. سەرسامبونی «تۆڵستۆی» بەشێوەیەک بوو وێنەیەکی «جان جاک ڕۆسۆ»ی خستبووە ناو مەدالیایەکی زێڕینو مەدالیاکەی کردبووە ملی.

دانەر بەشی یەکەمی کتێبەکەی بەم ناونیشانە دەستپێدەکات: سەدەی هەژدەهەمو کاریگەری فەلسەفەی فەرەنسی، تێدا دەڵێ: لەگەڵ هاتنی «بترۆسی گەورە»و ئەوانەی دوای ئەو هاتن، بەتایبەتی خانمی ئیمپراتۆر «کاترینی دووەم»، کۆمەڵگای ڕوسی بەشێوەیەکی سەیر هۆگری هەموو ئەو شتانە بوو کە لە بەرەی ڕۆژئاواوە دەهات، بەدیاریکراوی لە بەرەی فەرەنساوە. ئەو کات کۆمەڵگای ڕوسی بە تەنها لەژێر کاریگەری فیکرو زانستو ئەدەبو هونەری فەرەنسیدا نەبوو، بەڵکو لەپاڵ ئەوانەدا کەوتبووە ژێر کاریگەری ئەخلاقو نەریتو تەنانەت جلوبەرگی فەرەنسی. لاساییکردەوەی ڕۆژئاوا هەندێجار دەگەشتە ڕادەی پێکەنینو وەک جۆرێک لە کۆیلایەتی دەردەکەوت. ژمارەیەک لە نوسەرو ڕۆژنامەنوسە ڕوسەکان، گاڵتەیان بەو شێوازە کاریکاتێرئامێزەی لاسایکردنەوەی کەلتوری فەرەنسی دەکردو بە شتێکی منداڵانەیان لەقەڵەمدەدا. بەڵام ڕوسیا بە شێوەیەکی توند کەوتبووە ژێر کاریگەری فەرەنساوە، ئەمەش بەهۆی سەرسامبونی خانمی ئیمپراتۆر «کاترینی دووەم» بوو بە گەورە فەیلەسوفانی ڕۆشنگەر، لە نمونەی «ڤۆڵتێر»و «دیدرۆ»و ئینسایکلۆپیدییەکان بە شێوەیەکی گشتی.

ئاشکرایە «کاترینی دووەم» کۆمەکی مادیی «دیدرۆ»ی کرد، تاکو بتوانێت ئینسایکلۆپیدا فەرەنسییە بەناوبانگەکە بەئەنجامبگەیەنێت. دواتر ئەم ئینسایکلۆپیدیایە وەرگێڕدرایە سەر زمانی ڕوسی. پاشان کتێبخانەی خانمی ئیمپراتۆر بە نرخێکی گران ئەو ئینسایکلۆپیدیایەی کڕی تاکو

بە درێژایی ژیانی بیخوێنێتەوەو چێژی لێوەربگرێت. دواتر ئەم ئینسایکلۆپیدیایە گواسترایەوە بۆ ڕوسیاو ئێستا بووەتە بەشێک لە کتێبخانەی نیشتیمانی وڵات. بەم شێوەیە «کاترینی دووەم» لە ڕوویی مادییەوە توانی «دیدرۆ» ڕزگار بکات، ئەمەش وایکرد «دیدرۆ» ژیانێکی ئاسودە بژی، لە کاتێکدا هاوڕێ کۆنەکەی «دیدرۆ»، واتە «جان جاک ڕۆسۆ» هەندێجار لەسەر لێواری برسییەتی ژیانی بەسەر بردووە. بەڵێ لەو سەردەمەدا ڕۆشنبیرانی ڕوس، شەیدای «جان جاک ڕۆسۆ»و «مۆنتسیکیۆ»و «بییر باییل»و «فینیلۆن»و ئەوانی دیکە بوون. باڵیۆزی ڕوسیا لە پاریس، ئەوە بوو هەستا بە ڕێکخستنی سەردانەکەی «دیدرۆ»ی فەیلەسوف بۆ ڕوسیاو بۆ بینینی ئیمپراتۆر «کاترینی دووەم» کە وەک ئاماژەمان پێدا زۆر سەرسام بوو پێی. «کاترینی دووەم» بەشێوەیەکی زۆر جوانو شکۆدارانە پێشوازی لە «دیدرۆ» کردو داوای لێکرد لە پێناو هەستانەوەی ڕوسیاو بوژانەوەی کەلتورو زانستەکەی، پلانێکی گشتی پێشکەش بکات، «دیدرۆ» نزیکەی شەش مانگ لەوێ مایەوە. ئاشکرایە «کاترینی دووەم» هەمان بانگهێشتنامەی پێشکەش بە «ڤۆڵتێر» کردو داوای لێکرد سەردانی بکات، بەڵام «ڤۆڵتێر» لەبەر پیریو خراپی باری تەندروستی، دوای لێبوردنی کردو نەیتوانی بانگهێشتکردنەکەی قبووڵ بکات. جگە لەوە «ڤۆڵتێر» بۆ خۆی کەسێکی ملیۆنێر بوو، پێویستی بە پارەی زیاتر نەبوو، گەرچی ئەو پارەی خۆشدەویستو لێزانانە دەیزانی بەدەستیبێنێت، لەمەشدا تەواو پێچەوانەی «ڕۆسۆ»ی نەیاری بوو کە لەم بوارەدا گێلترین خەلقەندەی خودا بوو.

لێرەدا پێویستە ئەوەمان لەیاد نەچێت کە کۆمەڵگای ئەرستۆکراتیو بۆرجوازی لە سان بترسبۆرگو مۆسکۆ، زمانی فەرەنسییان باش دەزانیو بە باشی قسەیان پێدەکرد، لێرەوە بەرهەمی فەیلەسوفە فەرەنسییەکانیان بە زمانی فەرەنسیو لە دەقە ئەسڵییەکەوە دەخوێندەوەو پێویستیان بە وەرگێڕانی ئەو بەرهەمانە نەبوو. وەلێ وەرگێڕانی ئەو بەرهەمانە کارێکی پێویست بوو، ئەمەش لەپێناو چینە ئاست نزمەکانی شارو هەرێمەکانی دیکە. یەکێک لە دیبلۆماسە ڕوسەکان کە لە پاریس نیشتەجێبوو، هەندێ کتێبی «مۆنتیسکیۆ»ی وەرگێڕا، پاشان کتێبەکەی «فۆنتێل»ی وەرگێڕا (گفتوگۆ دەربارەی فرەیی جیهانەکان). ئەم کتێبە بە پاساوی ئەوەی کۆمەڵێ فیکری دژ بە ئاین لەخۆدەگرێت، دەستی بەسەرداگیراو قەدەغەکرا. ئیدی بەشی زۆری نوسەرانی ڕوسیا کەوتنە کورتکردنەوەو ئاسانکردنی فیکری فەیلەسوفانی ڕۆشنگەر، لە بوارەکانی فەلسەفەو زانستو شۆڕشگێڕایەتیو لە ناوەندە میللیە جیاواز جیاوازەکاندا بڵاویاندەکردەوە. بەڵام ڕۆشنبیرانی ڕوسیا هەر بەوەوە نەوەستان لاسایی فەرەنسا بکەنەوەو لەژێر کاریگەری کەلتورەکەیدا بن، بەڵکو دەستیانکرد بە وەرگێڕانی بەرهەمی بیرمەندە ئینگلیزەکان، لە نمونەی «شکسپیر»، «تۆماس مۆر»، «جۆن لۆک»، «هۆبز» ، «نیوتن»...هتد.

وەرگێڕان کارێکی زۆر پێویست بوو، چونکە لەو سەردەمەدا ژمارەیەکی کەمی ڕوس زمانی ئینگلیزیان دەزانی. پێویستە ئاگامان لەوەبێت لەو ڕۆژگارەداو لە تەواوی ئەوروپادا، زمانی فەرەنسی زمانی ڕۆشنبیریو شارستانیەت بووە، واتە بە درێژایی سەردەمی ڕۆشنگەری مەزنو سەدەی هەژدەهەم. هەرچی پەیوەستە بە کەلتوری ئەڵمانییەوە، ئەوا بەهۆی ئەو ئەڵمانانەی لە ڕوسیا نیشتەجێبوونو بە هۆی نزیکی جوگرافیی نێوان ئەڵمانیاو ڕوسیا، کەلتوری ئەڵمانی لە ڕوسیادا ناسراوبووە.

هەروەها پەیوەندی نێوان ئەو دوو وڵاتە، پەیوەندییەکی پتەو بووە. یەکەم فەیلەسوفی ڕوسی کە ناوی «لۆمۆنوسۆف ١٧١١-١٧٦٥» بوو، فەلسەفەی لەسەر دەستی «ۆڵف» قوتابی «لایبنتز»و دواتر مامۆستای «کانت» خوێندووە. بەم شێوەیە فەلسەفەی مۆدرێنی ئەڵمانیا گەشتە ڕوسیا. گەرچی ڕۆشنبیرانی ڕوسیا لە سەدەی هەژدەهەمدا لەژێر هەژمونی کاریگەری فەرەنسادا بوون، بەڵام لە سەدەی نۆزدەهەمدا فەلسەفەی ئەڵمانی، هەژمونو کاریگەری خۆی بەسەر ڕۆشنبیرانی ڕوسیادا دەسەپێنێت. ئیدی بەم شێوەیە فەیلەسوفی ئەڵمانی «شیلینگ» دەستدەگرێت بەسەر فیکری ڕوسیدا، وەلێ ناکرێ کاریگەری «هیگڵ»و ئەوانی دیکەش پشتگوێبخەین.

لە سەدەی هەژدەهەمدا چینێکی کۆمەڵایەتی پەیدابوو پێیاندەوترا (ئەنتلجنسیا)، ئەسڵی ئەم وشەیە ڕوسییە، دواتر لەسەر ئاستی جیهان بڵاودەبێتەوە، تەنانەت لای ئێمەی عەرەبو (کورد-و)یش بەکاردەهێنرێت، مەبەست لەو وشەیە چینی ڕۆشنبیرانە، واتە هەموو ئەو بیرمەندانەی سودیان لە بەزانستکردنی کێشە فەلسەفییەکانی مرۆڤ وەرگرت، سودیان لە بە زانستکردنی فیکر وەرگرت بە واتا مێژوییەکەیو بە واتای ڕێکخستنی کۆمەڵگا. لە ڕابردودا سەرجەمی ئەم کێشە فەلسەفیانە، ڕەنگێکی تیۆلۆژیانەی کرابوبەبەرداو تەنها پیاوانی ئاینی مەسیحی ئەرسەدۆکسی، بۆیان هەبوو قسەی لەسەر بکەن. هەموو ئەو وەرگێڕانانەی قسەمان لەبارەیانەوە کردو هەموو کاریگەرییەکانی فەلسەفەی ڕۆژئاوا، لە دەرەوەی تیۆلۆژیاو کڵێسادا ئەنجامدران، بگرە لە دژی هەردوکیان ئەنجامدران. بەم شێوەیە لەناو ڕۆشنبیری ڕوسیدا، ململانێی نێوان کەلتورگەراکانو تازەگەران هاتەئاراو خەڵکی بۆ دوو بەش دابەشبوون: بەشی یەکەمیان بانگەشەی لاسایکردنەوەو وەرگرتن لە ڕۆژئاوای دەکرد، بەشی دووەمیان بە پاساوی پارێزگاریکردن لە تایبەتمەندیەتیو ڕەسەنایەتی، ئەوەی ڕەتدەکردەوە. دواتر ڕەوتی سێیەم هاتەئارا کە هەوڵی ئاشتکردنەوەی نێوان ئەو دوو بەشەی دەدا. ڕۆشنبیرانی ڕوس بە درێژایی شەو گفتوگۆیان سەبارەت بە فیکری «ڤۆڵتێر»و «ڕۆسۆ»و «شیلینگ»و «هیگڵ» دەکرد. ڕۆشنبیرانی ڕوس بەوە بەناوبانگن کە بەشێوەیەکی شێتانە هۆگری فیکرو مشتومڕکردنن لەسەریو بەشێوەیەکی پەرگیرانە باوەڕیان پێیەتی، دروست وەک ئێمەی ڕۆشنبیرانی عەرەب. دەنگدانەوەی هەموو ئەوانەش لە ڕۆمانە نەمرەکانی «دیستۆفسکی»دا دەبینین.

تازەترین ڕەوتی فەلسەفی کە لە ڕوسیادا بڵاوبووەوە، ڕەوتی ڤۆڵتێریزم بوو، (لەناوی ڤۆڵتێرەوە وەرگیرابوو). ئەم ڕەوتە پیاوانی ئاینی ئەرسەدۆکسیان تەواو بێزار کردبوو، پیاوانی ئاینی هەوڵیاندا دژایەتی بکەن، بەڵام وەک بڵاوبونەوەی ئاگر لە پوشو پەڵاش، بڵاوبووەوە، ئەمەش بە هۆی پێداویستی ڕۆشنبیرانی ڕوسەوە بوو بۆ ڕزگاربوون یان دەربازبوون لە چنگی پیاوانی ئاینی. ڕۆشنبیران لەژێر سایەی هەژمونی کڵێساو فێندەمێنتالیزمی ئاینیدا، هەستیان بە خنکان دەکرد، هەروەها تەواو بێزاربوون لەو کتێبە کەلتورییە زەردباوانەی بە درێژایی چەندین سەدە، هەمان شتیان لەگەڵ هەمان ڕاڤەکردنی ڕاڤەکردنەکاندا دووبارە دەکردەوە. جگە لەوە بێزاربوون لەو کاهینە ئەرسەدۆکسیانەی کۆنترۆڵی خەڵکە سادەکەو لە ڕووی مێژووییەوە کۆنترۆڵی عەقڵیەتی ڕوسیایان کردبوو. کێ لە «ڤۆڵتێر» باشترە تا بارگرانی پیاوانی ئاینی لەسەر شانیان سوک بکات، تا لەبەرامبەر پیاوانی

ئاینی ڕاوەستنو دژایەتیان بکەن.

بەدوای ئەوەداو لە سەدەی نۆزدەهەمدا، فیکری «شیلینگ»ی فەیلەسوفو ڕۆمانتیکی ئەڵمانی دێت. هەرچی کاریگەری «جان جاک ڕۆسۆ»یە، ئەوا کاریگەرییەکەی جیاواز بوو. «ڕۆسۆ» بە بڵاوکردنەوەی بەهای چاکەو دادپەروەریو خۆشەویستی سروشت ناسراوە. هەروەها بەهای ئاینی سروشتیو یاسای سروشتی بڵاوکردەوە: واتە ئەو ئاینەی لەسەر عەقڵو دڵو ویژدانی ناوەکی ڕادەوەستێت، نەک ئەو ئاینەی لەسەر وەحیو موعجیزەو خورافات ڕادەوەستێت. هەموو ئەو بەهایانە لە فەلسەفەکەی «ڕۆسۆ»وە وەرگیراون کە دەربارەی سروشتی مرۆڤی ژیرو چاکەخوازە، بەڵام ئەوەی مرۆڤی پیس کردووە، دامودەزگاکانی کۆمەڵگای ستەمکارو گەندەڵو تاریکبینی زۆردارە. لە ساڵی ١٧٦٩ فەیلەسوفی ڕوسی «ئانیتشیکۆف» کتێبێکی بە ناوی (ئاینی سروشتی) بڵاوکردەوە، واتە ئاینێکی گەردونی تەنها پشت بە عەقڵو هەستێکی تەندروستو چاکەیەکی ناوەکی دەبەستێت، بەڵام کتێبەکە بە تۆمەتی بێ ئیمانی، لەلایەن کڵێساوە سوتێنرا.

ئەو کتێبانەو وەرگێڕانەکان کاریگەرییان لەسەر بارودۆخی سیاسی ڕوسیا هەبوو، بگرە هەندێک لە ڕۆشنبیران جورئەتی ئەوەیان کرد پرسیار لە ڕەوایەتی دەسەڵاتی جێگیر بکەن، واتە دەسەڵاتی قەیسەرو ئیمپراتۆرەکان کە پێش سەردەمی کۆمۆنیستی، لە ئارادابوون. ئاشکرایە کڵێسای ئەرسەدۆکسی ڕەوایەتیەکی ئاینی یان خودایانەی بەخشیبووە ئەو دەسەڵاتانە، دروست وەک ئەوەی لە خاکی ئیسلامدا ڕوویدابوو، بگرە تاکو ئێستاش هەر ڕوودەدات. لەم بارەیەوە تەماشای حاکمیەتی «مەودودی» یان ویلایەتی فقیهی خومەینی یان ئەوانی دیکە بکە.

### سەرچاوە:

شرق الاوسط، ژمارە ١١٢٩٣، ٢٩ تشرینی یەکەم ٢٠٠٩.

# شۆڕشی خوێندکارانی ٦٨

## -کۆتایی یۆتۆبیا یان کۆتایی مێژوو؟-

ئەنوەر بەدر
لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

لە چلەمین ساڵیادی شۆڕشی خوێندکارانی ١٩٦٨، بۆ هەندێک (بە تایبەت ئەوانەی لە ساتەوەختی ڕوداوەکەدا نەژیاون)، شتێکی خۆش و چێژبەخشە پانۆرامای ڕوداوەکانی ئەو قۆناغە بزانن کە لە بەرواری ١٩٦٨/٣/٢٢ دا دەستی پێکرد، کاتێک خوێندکارانی زانستە کۆمەڵایەتیەکان لە زانکۆی(نانتێر)، لە خۆپیشاندانێکدا وەک ناڕەزایی دەربڕینێک دژی شەڕی ئەمریکا لە ڤێتنام، ڕژانە سەر شەقامەکان و پۆلیسیش شەش کەسی لێدەسگیر کردن.

دەست بەجێ و دوای ئەو ڕوداوە بزوتنەوەیەک بە ناوی بزوتنەوەی ٢٢ ئاداری خوێندکاری، لە کەسانی چەپڕەو و هەندێک ئانارشیست دروست بوو. هەر زوو ئەم بزوتنەوەیە بوو بە یەکێک لە گرنگترین هێزە شۆڕشگێڕە ڕادیکالەکان، لە ناوەندی خوێندکاراندا و «دانیال بندت کوهن»ی ئەڵەمانیش ڕێبەرایەتی دەکرد. «کوهن» لەگەڵ چەند خوێندکارێکی هاوڕێیدا دەسگیرکران و پاشان لە زانکۆی (نانتێر) فەسڵکران. مەسەلەکە بەمە کۆتایی نەهات، بەڵکو ناڕەزایی خوێندکاران گەیشتە زانکۆی سۆربۆن، کاتێک فیدراسیۆنی نیشتمانی خوێندکارانی فەرەنسا بڕیاریاندا ڕۆژی سێی ئایار ڤیستڤاڵێک ساز بکەن، بۆ سەرکۆنەکردنی ئەو سیاسەتی سەرکوتکردنەی بۆرژوازیەتی ئەوروپی بەگەڕی خستبوو، بەڵام هێزەکانی ئاسایش پێشتر گەشتبونە سۆربۆن بۆ ڕێگەگرتن لە ئەنجامدانی چالاکیەکەی خوێندکاران. لە پای ئەمە خوێندکارانی زۆربەی زۆری زانکۆکانی فەرەنسا و تەنانەت خوێندکارانی قۆناغی ئامادەیی لە باریس و چەند شوێنێکی دی، دەستیان دایە مانگرتن و چەندین

خۆ پیشاندان لە شەقامەکانی پاریسدا دەستی پێکرد. لە ڕۆژی سیانزەی ئایاردا گەورەترین و گرنگترین سەندیکای کرێکاران لە پاریس هاتە ڕیزەوە و دەستی بە مانگرتن کرد، ئەم پرۆسەیەش پیشەوەران و جوتیارانیشی گرتەوە. لە ڕۆژی بیست و پێنجی ئایاردا ژمارەی مانگرتوان، گەیشتە دە ملیۆن کرێکار.

هەر لەو ڕۆژەدا دانوستانی سەندیکاکان لەگەڵ حکومەتدا دەستی پێکرد و دوای دوو ڕۆژ بە ڕێکەوتننامەی (گرۆنێل) کۆتایی هات کە هەندێ دەسکەوتی لاوەکی بۆ کرێکاران تێدابوو، بەڵام دوای چەند کاتژمێرێک لەو ڕێکەوتنە، سەندیکاکان کشانەوەو بەمجۆرە ڕەوشەکە ئەوەندەی تر دژوارتر بوو. هەر بۆیە لە کۆتایی ئەو مانگەدا «شارل دیگۆل»ی سەرۆکی فەرەنسا بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەنی نوێنەرانی داو، داوای کرد لە زوترین کاتدا هەڵبژاردنی نوێ ئەنجام بدرێت. هاوکات سەرجەم ئەو ڕێکخراو و کۆمەڵانەی هەڵوەشاندەوە کە بەشداری خۆپیشاندان و مانگرتنەکانیان کردبوو، جگە لە پارتی کۆمۆنیست. شۆڕشی خوێندکاران لە سیانزەی حوزەیرانی ١٩٦٨ کۆتایی پێهات، کاتێک هێزەکانی ئاسایش سەر لەنوێ چونەوە ناو زانکۆی سۆربۆن، بۆ دەرکردنی ئەو خوێندکارانەی بۆ ماوەی مانگێک ئەو شوێنەیان خستبووە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە. گێڕانەوەو هێنانە بەرباسی کرۆنۆلۆژیای ئەو ڕوداوانەی بەر لە چل ساڵ پاریسی پایتەختی فەرەنسایان هەژاند، دەتوانێت هۆکارەکانی سەرهەڵدانی ئەو ڕوداوەو پاشان هێور بوونەوەی و کۆتایهاتنیمان بۆ دەست نیشان بکات.

گرنگترین شتێک لە ڕوداوەکانی ئایاری ٦٨ کە بووە مایەی تێڕامانی زۆرێکی زۆری چاودێران، ئەوەبوو کە بە پێچەوانەی تێزەکانی مارکسیزم سەبارەت بە ڕۆڵی چینی کرێکار و حیزبی پێشڕەوی کارگەران، بۆسەرکردایەتی و ڕێبەرایەتیکردنی گۆڕان و بەگژاچونەوەی سستمی سەرمایەداری، خوێندکاران بوونە سیمبولی گۆڕان و ئەوان بوون دروشمە بەناوبانگەکەی «ڕامبۆ»ی شاعیریان بەرزکردەوە کە دەڵێت: (پێویستە ژیان بگۆڕێت، ئەم ژیانە سارد و سڕ و تەقلیدیە بۆ ئێمە دەست نادات).

تۆ بڵێی ئەمە بوو بێتە مایەی ئەوەی کە پارتی کۆمۆنستی فەرەنسی، دژایەتی خۆی بۆ شۆڕش و یاخیبونی خوێندکاران ڕابگەیەنێت؟ ڕۆژنامەی پارتی کۆمۆنیست بە توندی هێرشی دەکردنە سەر و «جۆرج مارشێ»ی ئەندامی مەکتەبی سیاسی ئەو حیزبە کە دواتر دەبێتە سکرتێری گشتی، بە منداڵ و مەزنی بنەماڵە بۆرژوازیە گەورەکان ناوەزەدی دەکردن و «دانیال بندت کوهن»یشی بە کەسێکی ئانارشیست و ئاژاوە گێڕ وەسف دەکرد. هەر ئەمەش وایکرد لە سەرەتادا سەندیکاکانی کرێکاران دو دڵ بن لە بەشداریکردن لە ڕوداوەکاندا و بە پێشنیاری مانگرتنی گشتی ڕازی نەبن. هەرچەندە دەست بەجێ لەگەڵ پەیوەندیکردنیان بە مانگرەکانەوە، بوونە هێزێکی فشاری سەرەکی لەسەر دەسەڵاتی سیاسی، بەڵام هەر زوو بە بڕیاری حیزبە پێشڕەوەکەیان وازیان هێناو دەستیان بە دانوستان کرد، بەو ئومێدەی لەو هەڵبژاردنە پەرلەمانیەی حکومەت بڕیاری لێدابوو، سودمەندبن و بەشی خۆیان کورسی بەرن.

ڕاستە بزوتنەوەی خوێندکاران لە خۆرئاوا داواکاری تایبەتی خۆی هەبوو، سەبارەت بە چاککردنی سستەمی خوێندن و سەرپشککردنی خوێندکار لە هەڵبژاردنی ئەو بەش و کۆلیژەی دڵخوازی خۆیەتی، لەگەڵ پەیوەندی زانستە کۆمەڵایەتیەکان بە داواکاریەکانی سستەمی سیاسی و.. هتد، بەڵام هەر زوو دەست بەرداری ئەو شتانە بوون و داوای گۆڕانکاری سەرتاسەری و جەوهەرییان دەکرد لە واقیعدا. لەبەرئەوەی لەو قۆناغەدا چینی کرێکاران هەر بە تەنها بە تەنگ دەسکەوتەتایبەتی و سەندیکاییەکانی خۆیانەوە بوون، ناچار خوێندکاران خوێن گەرمانە هاتنە سەر شەقامەکان و داوای گۆڕانیان دەکرد. بەڵام نابێت ئەوەشمان لە یاد بچێت کە ئەو بزوتنەوە خوێندکاریەی جیهانی هەژاند، لە پەراوێزی بزاوتە چەپەکان و ئانارشیستەکانەوە هاتبوو، لەنەوەیەکەوە دروست بوو کە هۆشیاری بە ئەنگێزەی یاخی بوونی خۆی هەبوو، لە دژی سستمێک هاتەئارا کە لە هەموو ئاستەکانیدا (سیاسی و کۆمەڵایەتی و مۆڕاڵی) پیر و وشکهەڵاتبوو. خوێندکاران لە هەموو شت کەوتنە گومان (دەسەڵات، سستەمی دادوەری، زانکۆکان)، لە هەموو ئەوانەش گرنگتر گومانکردن لە ئیمپریالیزمی ئەمریکی.

گرنگترین تایبەتمەندی ئەم بزوتنەوە خوێندکاریە ئەوە بوو، کە خۆی لە چوارچێوەی خواست و داواکاریە بچوک و تایبەتیەکانیدا قەتیس نەداو خۆی بەو ڕووبەرە جوگرافیە نەتەوەییەوە نەبەستەوە کە سەردەمانێک شۆڕشی بۆرژوازی دروستی کرد، بەڵکو ئەم بزوتنەوەیەی کە لە ١٩٦٨/٣/٢٢ بە ڕابەرایەتی «دانیال کوهین بندت»ی ئەڵەمانی سەرپێی خۆی گرت، دژی شەڕی ئەمریکا بوو لە ڤێتنام و بەر لەو مێژووەش هاوخەم و لایەنگیری میللەتانی جیهانی سێهەم بوو هەر لە جەزائیرەوە تا کوبا، بەر لەوەی ئەو بزوتنەوە دژ بە جیهانیبونانەی ئێستا بێنەئارا. لێرەوە تێدەگەین کە بۆچی ئەو بزوتنەوە خوێندکاریە لەو کاتەدا بە جۆش بوو بۆ شۆڕشێکی سەرتاسەری و هەمەلایەن، بەمەبەستی گۆڕینی کۆمەڵگە و میکانیزمەکانی حوکمکردن. تیۆرستێکی مەزنی وەک «ئەرنست ماندل» هەوڵێکی زۆری بە خەرجدا بۆ ئەوەی خاڵی هاوبەشی نێوان ئەم بزاوتە و تیۆریا مارکسیەکەی بدۆزێتەوە، لە ڕێی تێگەیشتن لە ناکۆکیە بابەتیەکانی ئەو کۆمەڵگایانەی خوێندکاران خواستی تێکوپێکدان و وێرانکردنیان بوو.

لەلایەکی ترەوە شۆڕشی خوێندکارەکانی فەرەنسا دابڕاو نەبوو لە سیاقی جیهانی و ئەو فەزا پڕ لە یاخی بوونەی زانکۆی شوێنەکانی تری ئەوروپای گرتبووەوە، بە تایبەت لە (ڕۆما و لەندەن و برۆکسل و بەرلین). تەنانەت (برۆکلین) و زانکۆکانی دیکەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش لەم حاڵەتە بەدەر نەبوون. دەکرێت لێرەدا قسە لەو بزوتنەوە یاخی بوون و ناڕازیانەش بکەین کە لە هەمان قۆناغدا، زانکۆکانی مەکسیک و وڵاتی میسریشی گرتەوە. بە هەموو ئەمانەش تابلۆیەکی سەیر و سەرنج ڕاکێشیان دروست دەکرد. (بەهاری پراگ) کە «ئەلکسەندەر دوبچک» لە چیکۆسلۆڤاکیا ڕابەرایەتی دەکرد و هەوڵێک بوو بۆ گەڕان بە دوای سۆسیالیزمێکی هیومانزمیدا، بە یەکێک لە دیاردە دیارەکانی شەستەکانی سەدەی ڕابردوو ئەژمار دەکرێت. سەرەڕای شکست خواردنی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە شەڕی (تێت) لە ڤێتنامی باشوور، ئەمەش ئەوەندەی تر بەرەی

ئەوانەی بەهێزتر کرد کە دژی شەڕ بوون. هەروەها مانگرتنی کرێکارانی کۆمپانیاکانی پیشەسازی ئۆتۆمۆبێل لە هەریەک لە ئیتاڵیا و فەرەنسا و تەنانەت ئەڵەمانیاش.

ئەوەی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش ڕوویدا، خەسڵەتێکی دیکەی وەرگرت. ئەو برینەی (مەکارسیەت) دروستی کردبوو هێشتا خۆش نەبوو بووەوە، هەروەها سەرەڕای تێپەڕبوونی چەند دەیەیەک بەسەر بڕیارەکەی «ئەبراهام لنکۆڵن»دا سەبارەت بە ئازادکردنی کۆیلەکان، بەڵام جیاوازی لەسەر ئاستی پێست و ڕەنگ و ڕوو، بەشێکە لە کلتوری ئەو کیشوەرە تازەیە و ناکۆکیەکی ناو ئەو کۆمەڵگەیە. شکستی بەردەوام لە شەڕی ڤێتنام، کاریگەری خراپی خۆی لەسەر کۆمەڵگەی ئەمریکی و تەواوی جیهان جێهێشتبوو.

لەم سەروبەندەدا بزوتنەوەی (شێرە ڕەشەکان)، وەک پەرچەکردارێک لە بەرامبەر تیرۆرکردنی سەرکردەی ڕەش پێستی ئەمریکا «مالکۆم ئیکس» دروست بوو. ساڵێک دوای ئەوە خۆپیشاندان ویلایەتی شیکاگۆی گرتەوە، مانگرتن لە لۆس ئەنجلۆس دەستی پێکرد و دژایەتیکردنی شەڕی ڤێتنامیش زیاتر جوڵەی شەقامەکانی گەرمتر دەکرد. لە ڕۆژی چواردەی نیساندا بانگەوازخوازی ناتوندوتیژی «مارتن لوتەر کینگ»ی ڕەش پێست تیرۆر کرا. لە پێنجی حوزەیراندا سیناتۆر «ڕۆبەرت کەنەدی» برای سەرۆکی پێشوتری ئەمریکا «جۆن کەنەدی» تیرۆرکرا. من پێموانیە ئەوەی لە جیهاندا ڕوویدا، دابڕاو بێت لەم ڕوداوانە. نزیکەی هەفتەیەک دوای تیرۆرکردنی «ڕۆبەرت کەنەدی»، تانک و زرێپۆشەکانی «شارل دیگۆل» چونە ناو زانکۆی سۆربۆنەوە، بە مەبەستی ڕێگرتن لە یاخی بونی خوێندکاران و کۆتایهێنان بەو خەونی گۆڕانخوازیەی بوو بووە مەراقی گەورەی نەوەی شەستەکان. دیموکراسی فەرەنسی کۆی لەوە نەکرد لە چرکە چارەنوسسازەکاندا، تانک و زرێپۆش بنێرێتە سەر شەقامەکان، ڕەنگە هەر ئەمەش هانی سەرکردایەتی یەکیەتی سۆڤیەتی جارانی دابێت تا لە بیست و یەکی ئابی هەمان ساڵدا، تانک و زرێپۆشەکانی پەیمانی وارشۆ ڕەوانەی چیکۆسلۆڤاکیا بکات، بۆ سەرکوتکردنی ئەو بزوتنەوە چاکسازیەی بە ناوی (بەهاری پراگ)ەوە خۆی ناساند.

لێرەدا زۆر بە ئاسانی دەتوانین سەرنجی ئەوە بدەین کە دەوڵەتی تۆتالیتاری بەسەر خەون و خۆزگەی گۆڕان و مرۆڤەکاندا زاڵ بوو. دەرکەوت ئەو دەوڵەتانە سەرباری جیاوازیان لە ڕوی ئایدیۆلۆژیەوە، بەڵام هیچیان دەست لەوە ناپارێزن سەرکوتی نەیارەکانیان بکەن و ئەو دەنگانە خەفە بکەن کە جیاوازتر دەخوێنن. ئەگەر سیناریۆی ڕۆمانی (١٩٨٤) «جۆرج ئۆرۆیل»، بەڕوداوەکانی سەر گۆڕەپانی واقیع بەراورد بکەین، دەبینین زۆر شتێکی کرچ و کاڵە، چونکە بینیمان لەو قۆناغەدا چۆن چۆنی ڕاپەڕینەکانی خوێندکاران و ئاقارە مرۆگەریەکان سەرکوتکران و ئازادیەکان زیندەبە چاڵکران و خەونە گەورەکانی نەوەی شەستەکان لە بار برا. خەونی ئەو نەوەیەی دروشمی (بڕوخێ دەوڵەتی پۆلیسی و یاخی بوون بەر لە هەر شتێکی دی)، بەرز کردبووەوە، بە مەبەستی گۆڕینی دنیا یان وەکی «جان پۆڵ سارتەر» دەیوت: (بۆ بەرفراوانکردنی ئاسۆی ژیان، هێندەی بکرێت). بەم پێیە بزوتنەوەی خوێندکاران تەنها بەرهەمی گۆڕانکاریە خێرا و لەناکاوەکانی کۆمەڵگاکانی خۆرئاوا

نەبوو، هێندەی کردنەوەی دەرگای تر و ئاسۆی تازە بوو بە ڕوی مرۆڤی هاوچەرخدا کەتینوی ئازادی زیاتر و زۆرتر بوو. بزوتنەوەی خوێندکاری وەک چۆن دەستی هەبوو لە قوڵکردنەوەی جیابوونەوەو دابڕانی تیۆری و سیاسی لە نێوان پارتە کۆمۆنیستیە کلاسیکیەکان و ڕۆشنبیرەکانیدا، ئاوەهاش ڕۆڵ و کاریگەری هەبوو لە گواستنەوەی بزاوتی فیکری و فەلسەفی لە ناوەندی ئەوروپاوە، بەرەو کەنار و وابەستەبوون لەگەڵ خەباتی شۆڕشگێڕانەی گەلانی جیهانی سێهەم کە لە جەزائیرەوە درێژ دەبووەوە بەرەو کوبا و ڤێتنام و شوێنەکانی دیکە.

ئەم بزوتنەوەیە وەک چۆن دەستی زۆرێک لە بزاوتە چەپەکان و بیریارانی خستە ڕوو، بە هەمان شێوەش توانی دۆگما بونی ئایدیۆلۆژی چەندین تیۆریای کۆمەڵایەتی و فەلسەفیش ڕابگەیەنێت. لەو سەردەمەدا هەر بە تەنها مارکسیزم پێگەی خۆی نەدۆڕاند، بەڵکو لە گەڵیشیدا بونگەرایی «سارتەر» و بونیادگەری «فۆکۆ»ش گەیشتنە بنبەست، بەڵام بونگەرایی و بونیادگەری توانیان ئاسۆی مەعریفی تر لەبەردەم خۆیاندا بکەنەوەو لە ژێر چەتری لێکشیتاڵکردندا، درێژە بە ڕەوتی خۆیان بدەن. ئەوەتا کەسێکی وەک «جاک دێریدا» هەر بەوەندەوە ناوەستێت کە ڕەخنە لە تیۆریا باوەکانی وەک مارکسیزم و بونیادگەری بگرێت، بەڵکو ڕاشکاوانە داوای لێک شیتاڵکردنی ناوەندچێتی ئەوروپی دەکات و دەخوازێت بەرەو کەنار بڕۆین، لەمەشدا ئەو سەرمەشق و دەست پێشخەر بوو.

"دێریدا» کە پشت بە تیۆریای دابڕان و کۆتایهێنان بە میتافیزیک دەبەستێت (وەک ئەوەی نیچە باسی لێدەکرد)، لە هەوڵی تێکوپێکدانی هەقیقەتدا بوو بە مانا میتافیزیکیەکەی، لەگەڵ تێکدانەوەی واقیع بە مانا پۆزەتڤستیە ئەمبیرکیەکەی، بۆ ئەوەی زمان بگەڕێنێتەوە بۆ سەنتەر و بیکاتە چەق لە پرۆسەی بیرکردنەوەو نێو لێکدانەوەدا. هەموو ئەمانەش لە پێناو بڕینی ئەو پەیوەندیەی نێوان زمان و هەرچی ئەو شتانەی دەکەونە دەرەوەی زمانەوە.

ئەگەر بونیادگەری لەسەر ئەو ئایدیایە چێ بوو بێت کە باس لە باڵا دەستی لۆژیکی بونیاد دەکات بەسەر مرۆڤ و گۆڕانکاریەکانەوە، ئەوا دەبینین ڕوداوەکانی ١٩٦٨ جەخت لە هێز و نەگۆڕی بونیادی دەسەڵاتی سیاسی دەکاتەوە لە فەرەنسا و شوێنەکانی دی، واتە دەسەڵاتی دەوڵەت لە بەرامبەر هەر ئۆپۆزسیۆنێکدا. هەر ئەمەش «میشێل فۆکۆ» و «جیل دولۆز» و تەنانەت «سارتەر» و «ڕۆجێ گارودی» و «ئیف مۆنتان»ی ناچار کرد، پێگەی تیۆری خۆیان بگۆڕن و دابەزنە خوارێ بۆ بینینی ئەو خوێندکارە مانگرتوانەی لەسەر شەقامەکاندابوون.

لە پای ئەم گۆڕانکاریانە، دەست بەجێ ئاسۆیەکی فراوان لە بەردەوم بەرەو پێشچون و گەشەکردنی زانستە مرۆڤایەتیەکاندا کرایەوە. لێرەوە ئاقارگەلێکی تازە لەگەڵ «فۆکۆ» و «دولۆز» لە بواری فەلسەفەدا و «ڕۆلان بارت» لە بواری ڕەخنەی ئەدەبیدا و «کلۆدلیڤی شتراوس» لە بواری ئەنسرۆپۆلۆژیادا، سەریهەڵداو تێکڕا ئەمانەش وەک خیانەتێک لە فیکری کلاسیکی خۆرئاواو چەمکی ناوەندچێتی خۆرئاوا سەیر دەکران.

لەمبارەیەوە «جاک دێریدا» دەڵێت: (سەروەختێک دەستمدایە ڕەخنەگرتن لە ناوەندچێتی ئەقڵی ئەوروپی، پاڵنەری سەرەکیم ئەو شتانەبوون کە لەسەر دەستی کۆلۆنیالیزمی فەرەنسی لە

جەزائیر ڕوویاندا بوو. هەستم دەکرد بە نیسبەت ئەورووپاوە من پەراوێزنشینم، لەبەرئەوە دەتوانم پرسیاری نوێ ئاڕاستەی کلتوری ئەورووپی بکەم. بۆ ئەم مەبەستەش میتۆدی لێکشیتاڵکردنم دامەزراند، تایبەتمەندی ئەم میتۆدەش لەوەدایە کە هەڵدەستێت بە لێکشیتاڵکردنی تەواوی داخرانە فیکریە دێرینەکان و سەرجەم دەمارگیریە ئایینی و نەتەوەیی و ئیتنیکییەکان).

لە دوای خامۆشبوونی شۆڕشی خوێندکاران، چەندین بزوتنەوە لە ئەورووپا سەریان هەڵدا، لەوانە بزوتنەوەی فێمێنیزم لەگەڵ «سیمۆن دی بۆڤوار» کە دواجار ڕێگەی پێدرا کتێبەکەی (ڕەگەزی دووەم) بە چاپ بگەیەنێت. هەروەها بزوتنەوەکانی ژینگە و پارتە سەوزەکان سەریانهەڵدا و «دانیال بندت کوهن» یش پەیوەندی پێوەکردن و هەنوکە ئەو نوێنەری سەوزەکانە لە پەرلەمانی ئەورووپا. دواتر پرۆسەکە بە شۆڕشی سێکسی گەیشت و بووە مایەی گەڕانەوە بۆ لای «ولیەم ڕایش» دوای دوو دەیە لە مردنی. تەنانەت هەندێک پێیان وایە یەکەمین بڵێسەی بزوتنەوەی ٢٢ ی ئادار، بە لێکچەرێک لە (نانتێر) دەربارەی «ڕایش» دەستی پێکرد کە داوای دەکرد بەشی ناوخۆی کوڕان و کچان لە زانکۆ جیا نەبێت و تێکەڵ بە یەک بکرێن.

هەروەها شۆڕشی خوێندکاران لە دوای خۆی، بووە مایەی دروست بوونی چەندین ئاقاری تازە لە بواری فیکر و کلتور و تەنانەت سینەماشدا. بەشێک لە ڕابەرانی ئەو شۆڕشەش گەیشتنە کورسی دەسەڵات، یەکێک لەوانە «دانیال بندت کوهن»ە و ناسراوبوو بە «دانیە سور»، لە کاتی خۆیدا بە تۆمەتی ئاژاوەگێڕی لە زانکۆ دەرکراو ئێستا بۆتە «دانیە سەوز «و ئەندامی پەرلەمانی ئەورووپیە. هاوکات «بیرنار کوشنەر» پۆستی وەزیری دەرەوەی فەرەنسای لە دەستدایە و وەکی ئەویش پێشتر «یۆشکا فیشەر» وەزیری دەرەوەی ئەڵمانیا بوو.

«ئەرنست ماندل» دەرهەق بە ڕووداوەکانی ساڵی ١٩٦٨ دەڵێت: (خوێندکاران لە دەست دەسەڵاتی زانکۆ و کۆمەڵگە جاڕس بووبن و مەسەلەکە پەیوەندی بەو ژینگە داخراوەی زانکۆ و سستمە نەزۆکەی خوێندنەوە هەبوو، بە تایبەت لە بواری زانستە کۆمەڵایەتیەکاندا). بۆچوونی «دانیال کوهین بندت»یش کە ڕابەرایەتی یاخی بونی خوێندکارانی کرد لە زانکۆی (نانتێر)، جیاوازی لەگەڵ ئەو بۆچونەی «ماندێل»دانیە و ئەویش جەخت لە بونیادی دەسەڵاتخوازانەی زانکۆو داخرانی ئەو ژینگەیە دەکاتەوە، بەڵام پێیوایە دایناموی ڕووداوەکان شتێکی دی بوو، لەمبارەیەوە دەڵێت: (ئێمە زیاد لە پێویست گەشبین بووین بە پاشەڕۆژ، ئەمەش وا دەکات ئەو بزوتنەوەیەی ئێمە جیاواز بێت لەوەی لەمڕۆدا دەیبینین، ئێستا ترس و نیگەرانیەکی زۆر هەیە... نەوەی ٦٨ دەیویست شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی بەرپا بکات و بەگژ دەسەڵاتدا بچێتەوەو هەرچی سەربە سستمی کۆن بێت لە ناوی بەرێت، بەڵام لەمڕۆدا گەنجان و نەوەی نوێ هیچ خواست و ویستێکیان نییە بۆ گۆڕینی جیهان و بگرە دەتوانین بڵێین، توانای ئەوەیان نییە خەونی گەورە ببینن). هەر دەرهەق بەم مەسەلەیە «هانز کریستیان شترۆبلە»، یەکێک لە پارێزەرانی چەپی ئەڵمانی لەشەستەکاندا دەڵێت: (بۆچونی زاڵ لەو سەردەمەدا ئەوە بوو کە دەبێت شۆڕشێکی هەمەلایەن لە کۆمەڵگەدا بکرێت، ئەمەش ئەو شتەیە لەمڕۆدا نایبینین. ڕەنگە لێرەو لەوێ خۆپیشاندان لە دژی پەلاماردانی عێراق لەلایەن ئەمریکا و

هاوپەیمانەکانیەوە ببینین، بەڵام بێگومان شتێکی لەو جۆرە ئامانجی شۆڕشی کۆمەڵایەتی نییە یان خواستی ژێرەو ژوورکردنی سستمی حوکمڕانی نییە لە خۆرئاوا یاخود لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. خەم و خولیای گەنجانی ئێستا زیاتر خەمی فەردی و تاکە کەسیە و بە زۆریش پەیوەندی بە مەسەلەی مادە و گوزەرانەوە هەیە). ئایا ئەمە کۆتایهاتنی یۆتۆبیا و نەمانی هەموو ویست و ئیرادەیەکە بۆ خەوبینین بە دنیایەکی جوانترەوە، یاخود کۆتایی مێژووە وەک ئەوەی هەندێک باسی دەکەن؟ وەڵام هەر چیەک بێت، ناچارین دان بەوەدا بنێین کە دۆخی ئێستا لەسەر ئاستی تاکە کەس و خەباتی گەلان، زۆر تراژیدی ترەو تۆتالیتاریزمی دەسەڵات (هەرچەندە چارشێوی دیموکراسیش بەسەر خۆیدا بدات)، ویستی گۆڕانی بەرەو دنیایەکی مرۆڤانە تر و جوانتری لەناو برد. هەر بۆیە ئێستا ڕۆژانە پێچکە زەبەلاحەکانی ئابوری بەردەوام و زۆر بێڕەحمانە دەمان هاڕێت، ئەم پرۆسەیەش زۆر بە زەقی لەو وڵاتانی جیهانی سێهەمدا دیارە کە ئێمە ڕۆڵەی ئەو وڵاتانەین.

### سەرچاوە:

ماڵپەڕی (اوان)، ١٣/٥/٢٠٠٨.

# ئەو شاعیرەی بە خراپەی خۆیدا هەڵدەگوت



## باسێك لەسەر شیعر و ژیانی "سافۆ" ژنە شاعیری کەونارا

لە فارسییەوە: لەیلا ساڵحی

«سافۆ» لە شاعیرانی یۆنانی چاخی حەوتەمی بەر لە زایین بوو کە لە سەردەمی کەونارادا بە ناوی مەزنترین شاعیری شیعری ئەویندارانە لەقەڵەم دراوە . ئەو هەوەڵ ژنێک بوو کە لە پەنا هەستی تاکەکەسی خۆیەوە، تایبەتیترین هەستەکانی ژنانەی لە شیعردا دەردەبڕی. شیعرەکانی شوێنێکی کاریگەریان لەسەر هاوچاخەکانی دانا. هەر بە زیندی سەری نەک تەنیا لە شاری شوێنەزای خۆی، بەڵکوو لە شوێنە دوورەدەستەکانیش بەرهەمەکانی دەخوێندرانەوە و سەرنجی هۆگرانی شیعریان بۆ لای خۆیان رادەکێشا. بە بڕوای «ئەفلاتوون» ئەو دەیەمین خاتووخوای هونەرە . «کاتولووس» وەک «سافۆی پیاو» ناوی دێنێ و شێخێکی ئاسووری بە ناوی «تاتیانووس» وەک «سۆزانی»، شێتی ئەوین و ئەو کەسەی بە خراپەی خۆیدا هەڵدەڵێ «ناوی دەبا. زیاترین دەنگۆ لەمەڕ ئەودا،

باسی هۆگری ئەوە بە هاوجسن خوازی، کە تاقمێک لە نووسەران ئاماژەیان پێکردووە. «سافۆ» لە شیعرەکانیدا ستایشی ئەوینی نێوان ژنان دەکا. تایبەتمەندی سەرەکی نووسراوەکانی، بوێری و دەربڕینی رووتی هەستی ژنانەیە، ئەویش چەندین سەدە بەر لە ئێستا، بە شێوەیەک کە ئەمڕۆکەش و تەنانەت لە داهاتووشدا ئەو بابەتانە نوێ و بوێرانە دەنوێنن.

وەک لە سەرچاوە مێژووییەکان دەردەکەوێ «سافۆ» مامۆستای فێرکاری گەورە کچان، بۆ دەستپێکی ژیانی هاوبەشی تێکەڵ بە خێر و خۆشی بووە. هەر لەبەر ئەوەیە کە لەمەڕ ئەوەوە دەڵێن: هۆگری بە هاوجسنی خۆی واتە ژن بووە. کەچی بە شایەدی نووسراوەکانی و بە گوتەی «سیموونە فرێلینگ» سافۆ ئەو جۆرە نەبووە کە فیمینیستەکانی ئەمڕۆکە باسی دەکەن. ئەو شاعیرە، شیعرەکانی خۆی بۆ ستایش و رێزلێنان لە پلەوپایەی ژنان تەرخان کردووە. بۆ گەورەکردنەوەی ژن لە روانگەی ئەو پیاوانەی کە خوازیاری ژن حەولێکی زۆری داوە، هەروەها بۆ ئاگادارکردنەوەی پیاو لە گەورەیی و جوانیەکانی ژن تێکۆشاوە.

سافۆ لەدایک بووی دوورگەی «لیزبۆس»ە و هەر لەبەر ئەوەش ئەمڕۆکە بە ژنانی هاوجسن خواز دەڵێن لێزبین.

لە سەردەمی «سافۆ»دا کە هاوچاخی «سۆلۆن»، «بوختولنەسر» (فەرمانڕەوای نێوان چۆمان)و «جۆرمیا»بوو، «لیزبۆس»دوورگەیەکی زەنگین بوو کە پڕ بووە لە باخی زەیتوون و رەز و مەزرای بەراو و دارستانی چڕوپڕ. کەش و هەوای ناوچەی دەریای ناوەڕاست و زەوی و زاری بەپیت و بەرەکەتی ئەوێ، کۆمەڵگایەکی یەگجار دەوڵەمەندیشی بەرهەم هێنابوو. «لیزبووس»سەد ساڵ بەر لە چاخی زێڕینی «پریکلێس»، ناوەندی کولتووری یوونانی کەونارا و چاوگەی راهێنای شاعیرانی شیعری ئەویندارانەی وەک «ئالکایووس» و «سافۆ»بوو.

دانوستان و بازرگانییەکی بێوچان لە شارەکانی نزیکەو بەستێن، لە ئاسیای بچووک و دوورگەکانی «ئێژە»و تەنانەت لەگەڵ میسردا بەردەوام بوو، بەڵام بازرگانە دەرياييیەکانی ئەو دوورگەیە، زیاتر هەر لە ماڵێ دەمانەوە و رێی دووریان نەدەگرتە بەر. ئابووری «لیزبووس» لەسەر بنەمای بازرگانی، پیشەسازی و زرێڤانی دامەزرابو. شەراب، رۆن، زەیتوون، دانەوێڵە، کووپە و تونگەی سواڵەت و روح، چرای گڕسۆز و شتی لەو بابەتە گرنگترین حاسڵاتی بازرگانی ئەو دوورگەیە بوون. «میتی لین ناوەندی دوورگەی "لیزبووس" وەک گرنگترین شاری ئەو محاڵە دەهاتە ئەژمار. مێژوونووسان دەڵێن "سافۆ" لە ساڵی 526ی بەر لە زایین لەو شارە لەدایک بووە. بەڵام دیتنەوەی هێندێک سککە لە شاری"ئێرسووس" بە وێنەی "سافۆ"وە ئەو رایە لەگەڵ کێشە بەرەورووو دەکەنەوە. لەمەڕ ساڵی لەدایک بوونی "سافۆ" شەوە ناکۆکیەکی زۆر هەیە. "ئاتوور ویگال" سیاسەتوان و مێژوونووسی ئامریکایی پێی وایە لە ساڵی 261ی بەر لە زایین لەدایک بووە. وێڕای ئەوەی کە زۆربەی نووسەران ئەو رێکەوتەیان پەسەند کردووە، گەلێک مێژوونووسی دی هەن کە لەگەڵ "ویگال" هاوڕا نین، چونکە پێیان وایە زۆر جار هەر ئەو نووسەرە، واتە "ویگال" بووەتە هۆی دەرخستنی نەریتی نالەبار و زانیاری دستکردی مێژوویی بەدەستەوە داوە. (لە لایەکی دیکەشەوە دیتنەوەی پاپیرووسێک کە ناوی

سافۆی بەسەرەوەیە و مێژووی بۆ50 ساڵ بەر لە زایین دەگەڕێتەوە ئەو رایە هەڵدەوەشێنێتەوە.)

بەگوێرەی نووسراوەی چەند نووسەرێک سافۆ سێ برای بە ناوەکانی «کاراکسووس»، «لاریکووس» و «ئۆریگیووس» هەبووە. بە پێی زانیاری مێژوونووسان «دووریکا» ژنە دەوڵەمەندی شەڕاب فرۆش برا گەورەی «سافۆ» واتە «کاراکسووس»ی لە میسرییەکان کڕییەوە.

«سافۆ» لە شیعرەکانیدا بە هۆی هەبوونی پێوەندی لە نێوان «کاراکسووس» و «دوریکا»–کە «هێرۆدۆت» ناوی ئەوی بە «رودوپیس» تۆمار کردووە–رەخنە لە برای گەورەی دەگرێ. ئەم بابەتە لە چاخی کەوناراشدا بەزۆری باسی لەسەر کراوە. «ئیستراپۆ» نووسیویەتی کە لە چاخی هەوەڵی بەر لە زاییندا رەوایەتێک بووە کە باس لەوە دەکا: یەکێک لە هەرەمەکانی میسر «دوریکا» بینای کردووە. لە برای دووهەمی «سافۆ» تەنیا ئەوەندە زانیاری لەبەردەستدایە کە شەرابی بە حکومەتی «میتی لین» فرۆشتووە و ئەو ئەرکەش بەرای «ئاتێنئۆس» تەنیا تایبەتی کوڕانی لاوی بنەماڵە دەست رۆیشتووەکان بووە. لەوە را بۆمان روون دەبێتەوە کە »سافۆ» لە بنەماڵەیەکی بە شان و شەوکەتی دوورگەی «لیزبووس» دەرکەوتووە، کە خاوەن زەوی و زار و باخاتێکی زۆر لە دەروروبەری شاری «میتی لین» بوون. هیچ هەواڵێکیش سەبارەت بە برای سێهەمی سافۆ لەبەردەستدا نییە. «هێرۆدۆت» دەڵێ ناوی باوکی سافۆ «ئیسکاماندرۆ نیمۆس»ە. (skamandronymo) و ناوی دایکیشی بە «کلە ئیس» تۆمار کراوە.

تاقمێک پێیان وایە سافۆ لە تەمەنی مێرمنداڵیدا لەگەڵ «کیەرکۆلاس» کە بازرگانێکی خەڵکی دوورگەی «ئانۆرۆس» بوو، زەماوەند دەکات و بەرهەمی ئەو زەماوەندە کچێک بووە بە ناوی «کلێ ئیس».

«ئالکایووس»ی هۆنەر یەکێک بوو لە هەڤاڵانی «سافۆ» کە زۆر بە گەرمە ستایشی دەکا. بە رای «هێرمسیاناس»، «ئالکایووس» چەنگی لێ دەدا و سترانی دەخوێند تەنیا لەبەرئەوەی ئەوینی خۆی بە «سافۆ»بنوێنێ. لە یەکێک لە شیعرەکانیدا ئاوا باسی دەکا:

سافۆ

بە گوڵە وەنەوشەی لای بسکەکانیەوە

بە بزەیەکی شیرینی لە گوێن شیلەی هەنگ و ...

لە مەڕ ناوی «سافۆ»شەوە هەندێک دڕدۆنگی لەئارادایە. بە زمانی یۆنانی ئایۆلی کە زمانی زکماکی «سافۆ»بووە، ناویان بە «سافا» نووسیوە و لە یۆنانی «ئاتێن» یش دا بە «سافۆ» هاتووە. لە پاپیرۆسیکدا کە هی ٥٠٠ ساڵ بەر لە زایینە هەر بە «سافا» نووسراوە، بەڵام لەسەر زۆربەی سککەکان و هەندێک قاپ و گوڵدانی کەونارا بە «سافۆ» ناویان بردووە. بەپێی نەریتی باوی بێژکردن و نووسینی ناوەکانی ئەورووپایی ئەو ناوە لە تاقمێک لە سەرچاوەکاندا بە sappho نووسراوەتەوە.

لە سەدەی چوارەمی زاییندا ئوستوورە و ئەفسانەگەلێکی زۆر لەمەڕ کەسایەتی «سافۆ»وە بەدیهاتن، وەک ئەوەی کە ئەو ژنێکی سۆزانی بوو، یان ژنێک بوو کە بە هۆی ئەوەی ئەویندار

پیاوێکی زرێڤان بە ناوی»فائۆن» بووە، لە تاوی ئەو لەسەر گاشەبەردێکەوە خۆی توورِ هەڵداوەتە خوارێ، یان ئەوەی کە دوو»سافۆ» هەبوون یەکیان شاعیر و ئەوی دیکە ژنێکی دەوڵەمەند بووە، یان ئەوەی کە ئەو ژنێکی ناحەز و ناشیرین بووە.

«ماکسیمۆس تیروس» بە: «سافۆ»ی جوان ناوی دێنێ. چونکە «سوقرات» لەبەر جوانی شیعرەکانی و کەسایەتی خۆی پێی خۆش بوو وای پێ بڵێ، لە کاتێکدا ئەو کورتە باڵا و رەش ئەسمەر بوو. نووسەرێکی تری کەونارا دەڵێ: «سافۆ» نەقوستان بووە و بە بولبولی باڵکراو و مرۆڤی بستە باڵای دەشوبهێنێ.

«و.ی.ب دوبوا» رۆشنبیری «ئافرۆ–ئامریکایی» بەپێی نووسراوەی «ئۆیدیۆس» دەڵێ: سافۆ قولەرەش بووە. ئەو»سافۆ» لەگەڵ «ئاندرومدا» کچی پادشای «ئیتیۆپی» هەڵدەسەنگێنێ. هیچ شکێک لەوەدا نیە کە خەڵکی «ئائۆرلی» دورِە بوون و لەگەڵ پێوەری ئاتێنیەکان؛ واتە باڵای بەرز و قژی کاڵ نەدەگونجان، بەڵام قولەرەش بوونی «سافۆ» دوور لە راستییە.

ئەوەی کە «سافۆ» ورد و کورتە باڵا بووە، دەکرێ بڵێین لەو شیعرەی خۆی رایە کە دەڵێ: دەستەکانی ناگاتە ئاسمان، چونکە ئەو یەکجار وردیلەیە. بەڵام پرسیارێک کە لێرەدا قوت دەبێتەوە ئەوەیە کە داخۆ ئەو باسی جەستەی خۆی دەکا یان لەهەمبەر کاکەشانی گەورەی جیهان خۆی بە بچووک دەزانی؟

روخساری «سافۆ» لەسەر سککەکان بە جوانی خاتووخوای ئافرۆدیت نەخشێندراوە. جوانی دەروونی «سافۆ»ش هەم لە وتەی هاوچاخەکانی دەردەکەوێ و هەم لە شیعرەکانی خۆیدا.

کۆمێدی نووسانی سەدەی چواری بەر لە زایین وەک «ئامفیس» و «ئانتی پانس» و هێندێک کەسی دی «سافۆ» و شیعری سافۆیان دەدایە بەر تیری تانە و تەشەر و ئاتێنیەکان زۆریان گاڵتەیان بەوە دەکرد ژنێک بتوانێ هەستە تاکەکەسی یەکانی خۆی دەربرِێ. بەتایبەت کە پیاوان لە شانۆ کومێدییەکاندا رۆڵی ژنانیان دەگێرا. نووسەران نەوەک هەر گاڵتەیان بە کەسایەتی «سافۆ» دەکرد، بەڵکو زمانی شیعری ئەویشیان بە زمانی شیعری سۆزانیەکان دەزانی. تەنانەت جاروبار حیکایەت گەلێکی زۆر لە پێوەندی هاوجسن خوازانەی ئەو بە راشکاوی لەلایەن ئەو پیاوانەوە دەگێردراوە، کە نیشاندەری جۆری تێگەیشتنی ئەوان لە شیعرەکانی «سافۆ» بوو.

ئەم خاڵە کۆمەڵگای پیاوانەی «ئاتێن» و ئەوانەی گاڵتەیان بە «سافۆ» دەکرد بە ئێمە دەناسێنێ. بەرای وان، ناوبانگ و مەزنایەتی «سافۆ» بۆ کەسایەتی بە توانای پیاوانی ئەوکاتە جێی مەترسی بوو. ئەوەی کە کومێدیەکان پێی دەگەیشتن ئەوە بوو کە ئەگەر بێتوو کۆمەڵگایەک بهێڵێ ژنان هەستەکانی خۆیان دەرببرِن، ناکرێ چاوەروانیەکی وات لێی هەبێ.

حوکم دانی راشکاو و راستەوخۆ لەسەر نووسراوەکانی «سافۆ» لە دونیای مەسیحیەتدا وەدی هات، بەڵام ئەم نووسراوانە هەرچۆنێک بوو، چاخەکانی ناوەراست و چاخی فیکتۆریای تێپەرِ کرد و تا ئێستاش بەشێک لە نووسراوەکانی لەبەردەستن. مەسیحیەتی ئەوەڵ هەر لە پێشدا نووسراوەکانی «سافۆ» ی رەت کردەوە. «تاتیانووس» نووسیویەتی کە لە ساڵی ٣٨ی زایینیدا، ئۆسقۆفی

شاری کونستانتینوپۆل(قەستەنتەنییە) «سێنت گرێگۆریۆس نازیاترۆس» ئەمری کرد تا هەموو پەڕتووکەکانی شیعری «سافۆ» بکەنە دەستەچیلەی ئاور و ئەو کارەشیان کرد و گڕیان لە خەرمانی بەرهەمەکانی ئەو یەکەم ژنە شاعیرەی جیهانی کەونارا بەردا.

لە ساڵی ٣٩١ی زاییندا، مەسیحیەکان هەموو ئەو کتێبخانانەی «ئەسکەندەرییە» یان سووتاند کە نووسراوەی نووسەرانی کلاسیکی یان تێدابوو. ئەوەش کە لە ساڵی ٧٣٠ زایینی جارێکی تر پاشماوەی پەڕتووکەکانی «سافۆ» لەسەر ئەمری «پاپ گری گوریووسی حەوتەم» لە «رۆم» و «قەستەنتەنییە» ئاوری تێبەر درا، نیشاندەری ئەوەیە کە شیعری «سافۆ» تا ئەو کاتەش هەر لەبەردەستا بوون، لە چوارەمین شەڕی سەلیبیدا کە سەرداره وێنیزییەکان شاری «قەستەنتەنییە» یان تاڵان کرد، ئەوەی کە بەجێما لە ساڵی ١٤٥٣، پاش سەرکەوتنی تورکەکان بەسەر «بیزانس»دا، بە غەنیمەتی ئەوان چوو. وێدەچێ کە ئێستاش کتێب و شیعرەکانی «سافۆ» لە تورکیا هەر مابن. گرنگتریش ئەوەیە کە ئەو بیرۆکەیەش بەهێزە کە رەنگە ئێستاش لە ئارشیفی کتێبخانەی «فاتیکان» لانی کەم دەستنووسێک لە نووسراوەکانی «سافۆ» پارێزرابێ، بەتایبەت وەک بەڵگەیەک لە گوناحی شیعر و کەسایەتی شاعیر. ناکرێ بڕوا بکەین کە «فاتیکان» هەموو ئەو بەرهەمانەی بە نووسراوەی لاڕێ و چەوتی دەزانین و یاساغی دەکردن، لەناوی بردبێتن. کلێساکان تەنانەت بەڵگەکانی تاوانیش دەپارێزن. کتێب دارەکانی هەموو جیهان، کتێب و نووسراوە و کاغەز ناسووتێنن، بەڵکو لە شوێنێک دەیشارنەوە .

«سافۆ»و نووسراوەکانی بێجگە لە دوژمنانی سەرەکی ئایینی، قوربانیی داڕمانی کۆشکی زانست لە سەدەکانی ناوەڕاست و هەروەها تێپەڕینی زەمانیش بوون. بەپێی روونکردنەوەی سەرچاوە مێژووییەکان، هیچ کتێبێکی تەواو و کامڵ لە نووسراوەکانی لەبەردەستدا نییە. ئەو بەشە لە نووسراوەکانی «سافۆ» کە تا ئێستا دۆزراونەتەوە، بریتین لە هەندێک کۆپلە شیعر و وشە و دێڕی بە واتا و دڵبزوین، کە لەلایەن نووسەرانی یۆنانی و رۆمەوە کۆکراونەتەوە. بەشێکی زۆر لە نوسراوەکانی کە لەسەر پاپیرۆس نووسراون دیتراونەتەوە، لەوانەش هەندێکیان بەهۆی کارتێکەری کەش و هەوای شوێنی راگیرانیان لەناوچوون. لە پێنسەد شیعر، تەنیا پێنسەد بەشی بچووکی خوێندراوەتەوە .

سەرەڕای هەمووی ئەوانە ناکرێ ئەو سەدەیە لەگەڵ سەدەیەکی تر هەڵبسەنگێندرێ. «سافۆ» شاعیری هەموو چاخەکانە و ئامێزی هەموو زەمانەکان بە روویدا کراوەیە. ئەو لە کاتی ژیانیدا بۆ زۆربەی خەڵک جێگەی رێز بووە و هەر بەو شێوەیەی بۆ خۆی دەڵێ پاش مەرگیش لەبیر ناچێتەوە. نووسەران و شاعیرانێکی زۆر ویستوویانە ئەو قسەیە نەسەلمێنن و مەرگی ئەدەبی «سافۆ» رابگەیەنن، بەڵام «سافۆ» خۆی ئەوەی سەلماندووە و ئەمڕۆش وەک ٢٥٠٠ساڵ لەمەوبەر بیر و شیعری هەر نوێیە. جا چ هاوجسن خواز بوبێ و چ راهیبە گرنگ نییە، ئەوەی گرنگ و شیاوی لێ وردبوونەوەیە پێکهاتەی پتەو و بیری بەرزی شاعیرانەی ئەو ژنە بلیمەتەیە لە دووتوێی شیعرەکانیدا.

# چەپکە شیعرێکی سافۆ



1

خۆشم دەوێ

هەر شتێک منی خۆش بوێ.

من پێم وایە

ئەوین

بەشێکی لە هەتاو پێ براوە.

2

هۆ وشەکان

ئەگەر ئێوەش هێزوگوڕێکتان تێدابێ

زمانی من نەمرتان دەکا.

3

بەیان

گوڵێکی تاوسی زێڕین بوو

بە دەم ئاسۆگ و دەریاوە.

4

نیوەڕۆیان

ئەو دەمەی هالاوی گەرما

دەکەوێ و

ئەستوونی خاک دەتوێتەوە،

ئاهەنگیک ساز دەکەن سیسرکەکان

بەلێکدانی باڵەکانیان

لە توێی «نیوپەردەیەک»دا.

5

ئێوارانە

کیژۆڵەکان گوڵێک دەچنن

بە تەنیا هەر بۆ بووکەکان.

6

هیسپرووس

ئەتۆ شوانی ئێوارانی

وەک رانە مەڕ دەیهێنیەوە بۆماڵێ

هەموو ئەو شتەی سپێدە

بەرەبەیان بڵاوی دەکاتەوە.

ئەتۆی کە خەو دەهێنیەوە بەرەو ماڵێ

هەر وەک مێگەلی مەڕ و بزنەکان.

هەر تۆش منداڵ

لە باوشی دایکی دەردێنێ.

7

تریفە دەبەخشێ مانگ، بە شەوەکان

کیژەکانیش
جێگەیەک دەدۆزنەوە کە دانیشن
وەک رۆنیشتن لە دەوری میحراِبێک.
8
ئەستێرەکان لە دەوری مانگ
روخساری رووناکی خۆیان دەشارنەوە
لە ناو لەپی دەستیاندا
ئەو دەمەی کە مانگی تەواو
لە ئاسمانەوە
بە تریفەکەی زێو دەڕێژێتە سەر عەرز.
9
ئێسکی رانە قەڵەوەکانی
بزنێکی سپی
بۆ تۆ قوربانی دەکەم
لە چەقی میحراِبتدا.
10
ئەستێرەکان هەڵدێن
وەک تەڵاشی پنجی دارە کاژەکان
لە ناو کوچکاوری مانگدا.
ئاگر پڕیشکەی لێ دەبێتەوە و
پەل دەبزێوێ
هەتا زەوین.
11
خەو
تاریکی چڕوپڕی خۆی دەڕێژێ
بەسەر چاوەکانی ئەودا.
سەری خستۆتە سەر مەمکی
کیژۆڵەیەک.
12
مانگ، سەرتاپێ زێڕپۆش
خزمەتکاری ئافرۆدیتە.
وێدەچێ شەو
هەر بۆ من درێژ بێتەوە.
13
خەو لێکدەنێ
چاوەکانی
لە شەوێکدا
لە شەوێکی تەواودا.
منیش لەناو پێخەفە نەرمەکەی خۆمدا
لەشی ماندووم
دەکێشمەوە.
14
مانگ و ئەستیرەی کۆ رۆچوون و
لە تاریکیدا خنکاون.
لە جامی شەو
کەلاو دەکا زەمان.
هەر من،
داخ وجەخار، هەر منم
کە تاق و تەنیا
دەچمە توێی نوێنی خەوەوە.
15
من پێم وایە کە تەنانەت
ناتوانم
ئاسمان بگرمە ئامێز.
16
هاتە لای پێخەفەکەم
بە «کاڵە»کانی یەوە...بەیانی،
هەڵیشی ستاندم
هەر ئەو کاتە.
17
نازانم بۆچی
دووپات بوومەتەوە.
18
لە خەیاڵدا

من لەگەڵت دواوم–گەلێک!
ئەی خاتوو خوا، کیسپریس.

19

هۆ سافۆ
تۆ دەتوانی چی ببەخشی
بەو کەسەی کە خۆی بە وێنەی ئافرۆدیت
خاوەنی هەموو شتێکە؟

20

ئەی کیپریس»
«کریتا»جێ بێڵە، وەرە
بۆ خۆت دەزانی بۆ کوێ،
لە ژێر تاجی گەڵاکاندا،
ئێرە دارستانی تۆیە.

21

لە میحراب دووکەڵ هەڵدەستێ و
ئاو دێتە خوار لە بەرزایی
بەدەم سترانەوە لە ژێر دار بەهێکانەوە
بۆ ژێر سێبەری سوورەگوڵ.

خەو دەتکێ
لە خشەخشی گەڵاکان.
دەڕژێتە سەر خاک و
دەڕژێتە چاوەکانەوە.

لەوێ، لە بژوێنەکان
جوانووە ئەسپەکان دەلەوەڕن
لە بەهاری پڕ لە»سەرەخس»و»شەودێر»دا
–با–ش لە نێو گژوگیادا
هەر دەشنێتەوە.

وەرە، ئەی کیپریس، بەرەو لام
بەرەو ئێرە و بۆ لای من وەرە.
پیاڵەی زێڕینم بدەیە
لێوالێویان کە لە شەراب
لەو شتەی کە
هەر خوداکان دەیخۆنەوە.

22

## «بۆ کچەکەم کلێ ئیس»

کلێ ئیس!لێم مەپرسە چی بپۆشی!؟
من دەسماڵی گوڵدۆزی کراوی «ساردیسی»م
نیە
تاکوو بە دیاری بتدەمێ
لەو دەسماڵەی خۆم پۆشیومە.
دایکم هەمیشە هەر دەیگوت:
لە سەردەمی ئێمەدا تەنیا بەستنی
پەلکەکانمان
بە دەسرەیەکی ئەرخەوانی
هێمای گەورەماڵی و شکۆ بو.
بەڵام نەمان دەفامی ئێمە
ئەو کیژەی کە
قژەکانی زێرینترە لە گڕی فانووس
هەرگیز نابێ بۆ رازندنەوەی قژی
شتێک جگە لە گوڵی تازە
هەڵواسێ.

23

## «بۆ تیماس»

ئێمە ئەو کووزوویە و ئەو نووسراوەیە
لەسەر ئەو پاپۆڕە دادەنێین.
ئەوە خۆڵەمێشی «تیماس»ی بچووکە
کە جوانەمەرگ
بەرەو شوێنی خەوی تاریکی پێرسەفوون
بەڕێکرا و
ئەو

له ماڵی خۆی دوور بوو
کیژەکانی هاوتەمەنی
تیغە زاخاو دراوەکانیان هەڵگرت
تا بە دابی تازیەباری
چەپک چەپک قژە خاوەکانیان ببڕن.

24

خۆ تۆ ئێرە دەزانی
کەوابو «کرێت»جێ بێڵە و وەرە ئێرە .
لێرە کە چاوەڕێت دەکەین.
ئێرە لە بۆ تۆ پیرۆزە
ئێرە کە دەنکەکانی ئەسپەندەر
لە پێش میحڕاب
بە بۆن و بەرامەوە دەشنێتەوە و
کانیلە فێنکەکان
لە ناو لقەکانی دار سێودا
بەدەم سترانەوە دەخۆشن و
ئەو پنچکە جوان و چڕوپڕەی سوورەگوڵ
سێبەر دەخاتە سەر زەوی.
گەڵاکانیش بە دەم سەماوە
خەوێکی قووڵ دادەبارن.
لێرە کە لە پێدەشت و مێرگەکان
ئەسپەکان دەحیلێنن.

25

ئەو مەزنترە لە قارەمانێک.
لەچاوی مندا ئەو خوایە
ئەو کە دەتوانێ لەلات دانیشێ و
عاشقانە گوێ بداتە
زەمزەمەی شیرینی دەنگت
ئاوازی پێکەنینی دڵڕفێنت
کە دڵەکوتەی من توندتر دەکا.

26

تامەزرۆم و
لە تامەزرۆییدا بوومە خەڵووز
تۆی ئەو کەسەی
کەبابم دە...*

*ئەو شیعرە لە بەردەنووسەکەی سافۆدا ئاوا ناتەواوە و بەشی کۆتایی سواوەو نەخوێندراوەتەوە.

### سەرچاوەکانی وەرگێڕان :

١- سافو شاعره ی یونانی دوران باستان، ترجمه علی عبدالهی، مجله نافه، شماره٢٦، ص٤٩-٥١
٢- سافو نخستین زن شاعر، ترجمه پیرایه یغمایی، برگرفته از کتاب women poems، ص٤١-٤٢ (www.mesyeux.blogfa.com)
٣- مختصری درباره سافو، ترجمه علی ثباتی، برگرفته از دایره المعارف بریتانیکا، (www.vazna.com)
٤- www.fa.wikipedia.org زیرعنوان "سافو"

# بەلاش ئەژین، بەلاش!

له فارسییەوە: سەروەر عومەر

### ژیاننامە و روانینێک بۆ دونیای شیعریی ئۆرهان وەلی کانیک

ئۆرهان وەلی کانیک له ١٣ی ئەپرێلی ١٩١٤ له شاری ئەستەنبوڵی تورکیا لەدایک بووە، لەوێ دەستی بە خوێندن کرد و دوای ماوەیەکی کورت، باوکی بۆ درێژەی خوێندن ناردیە ئەنکەرە. له قۆناغی ئامادەییدا لەگەڵ (ئۆکتای ڕەفعەتو مەلیح جەودەت)دا، دووان له شاعیرە یاخییەکانی تورکیا ئاشنا بوو و ئاشناییەکەیان بوو بە هاوڕێیەتی. دوای گەڕانەوە بۆ ئەستەنبوڵ، چووە کۆلێژی ئەدەبیات (بەشی فەلسەفە) و دوای ماوەیەک خوێندن، وازی لێهێنا. له ئەنکەرە ماوەیەک له بەشی بەڕێوەبەرێتی پۆست و تێلگراف کاری کرد و ماوەیەکیش له وەزارەتی پەروەردە، له نووسینگەی وەرگێڕان، سەرقاڵی ڕاژە بوو. دوای ماوەیەک، بەهۆی نادیموکراتی بوونی فەزای ئەوێ (بە وتەی خۆی) دەستی لەکارکێشایەوە.

له جێنیوەری ١٩٤٩ دەستی دایە چاپکردنی بڵاوکراوەیەک بە ناوی «یاپراگ» -گەڵا- کە پازدە ڕۆژ جارێک له دوو پەڕەدا بڵاوئەبوویەوە. چاپکردنی ئەم بڵاڤۆکە تا جونی ١٩٥٠ درێژەی کێشا و توانی ٢٨ ژمارەی لێ دەربکات.

له ١٤ی نۆڤەمبەری ١٩٥٠دا، له تەمەنی سیو شەش ساڵیدا بەهۆی خوێنبەربوونی مێشکەوە مرد. کتێبە شیعرییە چاپکراوەکانی بریتین له « نامۆ» - ئەو شیعرانە لەخۆئەگرێت کە لەگەڵ مەلیح جەودەت و ئۆکتای ڕەفعەت، ساڵی ١٩٤٤ نووسیویانن-. «پەشیمانەوە ١٩٤٥»، «وەک جەنگنامە

١٩٤٦»»، «تازە ١٩٤٧»»، «ڕووبەڕوو ١٩٤٩» و «کۆمەڵە شیعرەکان ١٩٨٢»».

لە دوای «یەحیا کەمال» کە لەو باوەڕەدان یەکەمین زەبری لە شیعری دێرینی تورکیا وەشاند و هەروەها لە دوای نازم حیکمەت کە باوەڕی وابوو کێشی شیعر ناتوانێت بەشێکی نەگۆڕی شیعر بێت، ئۆرهان وەلی کانیک بێگومان یەکێکە لە کاریگەرترین شاعیرە یاخییەکانی تورک، کە کاریگەرییەکی بەرچاوی لەسەر شیعری تورکیاوە هەبووەو هەیە. بەڕای ئەو شیعر هەرچۆن کە ناتوانێت زمانێک و کێشێکی تایبەتی هەبێت، هەر بەو شێوەیەش ناتوانێ بابەت و بیرۆکەی لەپێشدا دیاریکراوی خۆتی بەسەردا بسەپێنی. هەروەها لای وابوو کە شیعر هیچ پێویستییەکی بە کێش و مۆسیقا نییە، بەم پێیە ئەتوانرێت ئەوانە لە شیعردا لاببرێن. شیعری ئۆرهان وەلی ڕووکەشێکی زۆر سادە، گاڵتەئامێزو سەرنجڕاکێشی هەیە، زمانی شیعریی ئەو لە جۆری زمانە قورسە ئەدەبییەکان نییە. ئەو هەندێک جار هەر لەم توخمە ئاساییانە، هەر لە وشەی باوی نێو وتوێژیی ڕۆژانە، بەبێ جەختێک بۆ ئەدەبی کردنەوەی زمان دونیایەک ئەخوڵقێنێت، کە تێدا حکومەتی پێوەرە جوانی ساتە پارامیترە نۆڕماتیڤە ئەدەبییەکان تادوا رادە ئەڕووخێنرێت. ئەو نیازی نییە بۆ نوێ کردنەوەی شیعر، بیر و وانە ئەدەبییەکانی خۆی لە ژێر سێبەری تەکنیکدا، بەسەر وشەکاندا بسەپێنێ. شیعری ئەو بە توندی دژی نوخبەگەرایی ئەدەبی ئەوەستێتەوە. تا ئەو رادەی کە شیعرەکانی هەندێکجار ئەبنە ئەو شتانەی کە ئێمە زۆر کات لە وتووێژی ڕۆژانەماندا بەکاریان دەهێنین، بێ ئەوەی تەنانەت بیرمان لە شیعر بوونیان کردبێتەوە. شوێن پێی شیعر لە هەموو شتێکدا هەیە و سایەی بەسەر هەموو شوێنێکدا کێشاوە. بۆ دۆزینەوەی پێویست ناکا بە ئاسمانەکاندا بگەڕێین یاخود دڵ بەچەند وشەیەک خۆش بکەین، پێویست ناکا شیعر تەنها بەو چەند وشەیەی سەر کاغەز بزانین.

شیعرەکانی ئۆرهان ڤەلی ئەمانەمان پێئەڵێت، پێمانئەڵێت بۆ خوێندنەوەی راستەقینەیان ئەبێت لە دەقی شیعرەکان تێپەڕین و بگەڕێینەوە بۆ دەقی ژیان، ئەو جێگایەی کە شیعر بەردەوام لەوێوە هاتووەو دێت. وشەکان فریودەرن و لە پێشڕەویدا هەندێکجار هێندە ترسناک ئەبن کە ئەکرێت تەنها ڕستەیەک کە لە دەمێکەوە دەرئەچێت گۆڕستانێک بەدیبهێنێت. شیعری ئۆرهان وەلی بەدوورە لەهەر جۆرە زیادە بێژی و ڕازاندنەوەیەک. شیعری ئەو، شیعرێکی دۆگما نییە و زۆرجار بە ئاوازێکی بەڕواڵەت تەوساوی و دۆگمایانە و لە ناخدا گاڵتەیە، هەر جۆرە بنەبڕییەک دەکات، ئەو هەندێک جار لە شیعرەکانیدا هەمان دژایەتیکەرانە دڵتەنگییە سادەکانی مرۆڤی پەراوێزنشین بەبێ هیچ ئاتاجێک بە داپۆشینی، بێ پێچانی لە بەرگی جوانی ئەدەبیو بێ هیچ کەم و کورتییەک دەرئەبڕێت.

شتێک کە ڕەنگە هێشتا لای زۆرێک لە ئێمە بە هیچ شێوەیەک بە «شیعر» دانەنرێت، بە تاڵ بێت لەوەی بانگدەرانی پیشەسازی «شیعر» بە شیعر ناوزەدی ئەکەن و بەدووربێت لە هەرجۆرە پیرۆزاندێکی جوانی ناسانەی ڕەوانبێژان و فۆرم خوازان، بەو بەڵگەیەی کە هەموو کەسێک ئەتوانێت ئەمانە بڵێت: بەڵگەیەکی زادەی ترس، ترسی لەنێوچوونی دیکتاتۆرێکی بچووک بەناوی «شاعیر»، ترس لەوەی کە ئەگەر شیعر بەبێ دەستێوەردانی شاعیر هەیە، کەواتە شاعیر کێیە؟ هەر ئەم دڵەڕاوکێیانەی کە سەرچاوەیان لە ئەندێشەی نوخبەگەرایانەوە گرتووە و لە ناخی زۆرێک لە ئێمەدا

هەن، بێئەوەی کە دانیان پێدابنێین و هەندێک جار بێ ئەوەی کە خۆمان بزانین. کەواتە شیعری ئۆرهان وەلی بەجۆرێک ئاشکراکەری ترس و خۆپارێزییەکانی ئێمەشە، نە لە ڕووی بچووککردنەوەیان، بەڵکو ڕەنگە لە ڕووی هاودڵییەوە. روونکەرەوەی راستیەکی ناسک !. ئەگەرچی شیعری ئەو هەندێک جار سوود لە شتە هەر ڕۆژەکانی ئەبینێت، بەڵام مەرج نییە شیعرێک بێت بە ئاڕاستە و سوودی رۆتینی بوونەوە هەر ڕۆژە. ئەو بۆ ڕاگەیاندنی بێزاریی خۆی لە پووچی ئەوەی بە «هەر ڕۆژە» ناوی ئەبەین، چەمکە ئاخاوتنی یان هەر ڕۆژەکان لە جێگەی چەمکە قورسە ئەدەبییەکان دائەنێت. هەر لەم سوود وەرگرتنەیدا لە تۆنی «چەمکی» ئاخاوتنی هەرە ڕۆژە، توانا دەگمەنەکانی «زمانی تەنز» کەشف ئەکات. (پێویستە ئاماژە بەوە بکرێت کە لە زمانی تورکیدا زمانی ئاخاوتن لە زمانی نووسین دانەبڕاوە، واتە خەڵکی هەربەو شێوەیەی کە قسە ئەکەن، ئەشنووسن، هەرلەبەر ئەوە نووسیم «چەمکی ئاخاوتن» و نەمنووسی «زمانی ئاخاوتن» یا «زمانی قسەکردن».) بە گشتی روانینی شیعریی ئۆرهان وەلی بۆ جیهانی دەوروبەری سادەیە، زۆر سادە، بەڵام پانتاییەکی بێکەنار، لە قووڵایی ڕوانینیدا هەیە.

بۆ فێربوون لە دونیای شیعری ئۆرهان ڤەلی کانیک درەنگ نییە. ئەو فێرمان ئەکات کە شیعر لە جێگایەکی دیکەیە، ئەو جێگایەی کە مۆنۆلۆگەکان کۆتاییان دێتو لە پانتاییەکی بێسنووری لێبوردەییدا، دیالۆگی گیانبەخشی مرۆڤ لەگەڵ خۆیدا دەستپێئەکات.

ئۆرهان وەلی زیندووە، شیعرەکانی ئەمە ئەڵێن. مەرگ بەمانای تەواو بوون سووکایەتییەکی نەبەخشراوە بۆ بەرامبەر ئینسانی شیعری ئەو.

## نەورۆز

مەحاڵە
شیعر نووسین
ئەگەر عاشق بیو
شیعر نەنووسین
ئەگەر مانگ
مانگی نەورۆز بێت.

## ئارەزووەکان و بیرەوەرییەکان

ئارەزوو شتێکی دیکەیەو
بیرەوەری شتێکی دیکە
لە شارێکی هەتاو نەدیودا
بڵێ چۆن ئەکرێ بژین؟

## زیندەوەران چ مێروەکان

بیرمەکەرەوە
تەنها ئارەزوو بکە
سەیرکە، مێروەکانیش هەر وا ئەکەن.

## بانگهێشت

چاوەڕوانم
لەدۆخێکدا وەرە کە
پەشیمانی مەحاڵ نەبێت!
شتێک وەک بادە لەم کەش و هەوایانەدا
شتێکی وەک بادە لەم کەش وهەوایانەدایە
مرۆڤ تێک دەدات، تێک
لەلایەکەوە ئەگەر حەسرەتی جودایی هەبێت

عەشقت لەلای یەکێکی دیکەو
تۆش لە جێگایەکی دیکە...
مرۆڤ پڕ ئەکات لە ئازار، پڕ
شتێک وەک بادە لەم کەش و هەوایانەدایە
مرۆڤ مەست ئەکا، مەست.

### یەک دونیا سوپاس بۆ خودا

هێشتا کەسێکی دیکە لە ماڵەوە هەیە
یەک دونیا سوپاس بۆ خودا
هەناسەی هەیە
دەنگی پێی هەیە
سوپاس بۆ خودا، یەک دونیا سوپاس بۆ خودا.
میوان
دوێنێ تا شەو حاڵم زۆر خراپ بوو
دوو پاکەت جگەرەش سوودی نەبوو
دواجار دەستمکرد بە نامە نووسین
کەمانم ژەنی (لە تەواوی ژیانمدا ئەمە یەکەم جارم بوو)
پیاسەم کرد
تەماشای تەختەی تاوڵەچییەکانم کرد
گۆرانییەکی نەشازم وت
پاکەتێکی شقارتە مێشم گرت
خودا بەنەفرەتی کا
دواجار هەستام هاتم بۆ ئێرە.

### کە بە کۆڵاندا تێئەپەڕم

کە بە کۆڵاندا تێئەپەڕم
کاتێک بیرم ئەکەوێتەوە چۆن پێشتر
هەروا لەبەرخۆمەوە پێکەنیووم
لەوەی کە وایانزانیبێ شێتم
پێکەنین ئەمگرێ.

### ناتوانم تێتان بگەیەنم

ئەگەر بگریم
ئایا دەنگم لە دێڕەکانمدا ئەبیستن
ئایا ئەتوانن دەست لە فرمێسکەکانم بدەن
بەر لەوەی دووچاری ئەم ئازارە ببم
بیرم لەوە نەئەکردەوە کە گۆرانییەکان تا ئەم ئەندازەیە جوان بن و
وشەکان تا ئەم ئەندازەیە بێ کەڵک.
جێگایەک هەیە ئەزانم
جێگایەک کە تیایدا تواناى وتنی هەموو شتێک هەیە
زیاد لە ئەندازە لێی نزیک بوومەتەوە، گوێم لێیە
ناتوانم ئێوەی لێتێبگەیەنم.

### هەور

مامەی باڵندە فرۆش
ئێمە،
هەم باڵندەمان هەیە،
هەم درەخت
تۆ تەنها هەندێک هەورمان بدەرێ.

### سەر بەرەوژوور

لەو دونیا دەمە و ئێواران
لە سەعاتی تەواوبوونی ئیشی کارگەکەماندا
ئەو ڕێگایەی ئەمانگەیەنێتەوە ماڵەوە
ئەگەر ئاوا سەر بەرەوژوور نەبێت
مەرگ هێندەش خراپ نییە.

## شتێک هەیە

هەموو ڕۆژێک ئەوەندە جوانە ئەم دەریایە؟
هەمیشە بەمجۆرە دێتە بەرچاو ئاسمان؟
هەمیشە ئەوەندە دڵڕفێنە
ئەم شتانە، ئەم پەنجەرەیە؟
نا،
بەخوا نا
فێڵێک — شتێک لەم کارەدا هەیە.

## Quantitative

ژنە جوانەکانم خۆشئەوێ
ژنە کرێکارەکانیشم خۆشئەوێ
بەڵام ژنە جوانە کرێکارەکانم
زیاتر خۆشئەوێ.

## لەبەر ئێوە

لەبەر ئێوە، خوشک و برا مرۆڤەکانم
هەموو شتێک لەبەر ئێوەیە
شەو لەبەر ئێوە، ڕۆژیش هەروەها
لە ڕۆژدا، ڕووناکی خۆر
لەشەودا، تریفەی مانگ...
گەڵاکانی ژێر تریفەی مانگ
تاسەی نێو گەڵاکان
ئەندێشەی نێو گەڵاکان
هەزار و یەک سەوزیی نێو ڕووناکی خۆر
زەردەکانیش لەبەر ئێوە، پەمەییەکانش
هەر لەبەر ئێوە
توێ توێ بوونی لەپی دەست
گەرماییەکەی
نەرماییەکەی
ئەو ئاسوودەییەی لە ڕاکشاندا هەیە
سڵاوەکان، لەبەر ئێوە
لەبەر ئێوە تیرەکە لەرزۆکەکانی بەندەرگە
ناوەکانی خۆر
ناوەکانی مانگ
ڕەنگی بەلەمەکان لەبەر ئێوە
لەبەر ئێوە پێی پۆستچی
دەستی شریقە وەشێن
عارەقەی ڕەوانی تەوێڵەکان
لە بەرەکانی جەنگدا گوللە ڕەهاکراوەکان
لەبەر ئێوە گۆڕەکان، کەلەپچەکان، سزای لە سێدارەدان
لەبەر ئێوە
هەموو شتێک لەبەر ئێوە!

## لە پێناوی نیشتیماندا

چیمان نەکرد تەنها لە پێناوی ئەم نیشتیمانەدا
هەندێکمان مردین
هەندێکمان وتارمان دا.

## بەلاش ئەژین، بەلاش

بەلاش ئەژین، بەلاش
هەوا بەلاش، هەور بەلاش
جۆگە، گرد بەلاش
باران، خۆڵ بەلاش
ڕووکەشی ئۆتومبیلەکان
دەرگای سینەماکان...
نان و پەنیر نییە بەڵام
ئاوی شیللەتێن بەلاش
ئازادی بە نرخی سەرت
کۆیلەیی، بەلاش
بەلاش ئەژین، بەلاش.

## چەند خۆشە

ڕەنگی ئەم چاییە چەند جوانە
بەیانیی زوو
لە هەوایەکی ئازادا
هەوا چەند خۆشە
ئۆهۆی کوڕە چەند خۆشە!
چایی چەند خۆشە!

## عەسرانی یەک شەممە

ئێستا جلەکانم ناشیرینن
بەڵام دوای ئەوەی کە قەرزەکانم دایەوە
پێموابێ دوو هێندە جلی جوانم ئەبێتو
وابزانم دیسان تۆ منت خۆشناوێ:
عەسرانی یەک شەممە
کاتی تێپەڕین بە کۆڵانەکەتاندا
بە جلوبەرگێکی ڕازاوەوە
پێتوایە ئایا
من دیسان هەروەک ئێستا حساب بۆتۆ ئەکەم؟!

## بۆئەوەی کارێکم کردبێت

تەواوی ژنە جوانەکان وائەزانن
شیعرە عاشقانەکانی من
بۆ ئەوان نووسراون...
بەڵام من ئەگەر بەردەوام ئازارەکانی
ئەوانم بەگیان کڕیوەتەوە
تەنها لەبەر ئەوە بووە
کە کارێکم کردبێت.

## شیعری تەنیایی

ئەوانەی کە تامی ژیانی تەنیاییان نەچەشتووە
نازانن
بێدەنگی چ ترسێک ئەخاتە گیانی مرۆڤەوە
مرۆڤ چۆن لەگەڵ خۆیدا ئەکەوێتە قسەکردن
چۆن بەرەو لای ئاوێنە ڕائەکات
لە حەسرەتی زیندوویەکدا
نازانن.

## ڕوودا و

منداڵ بووم، منداڵ بووم
قولاپەکەم هەڵدایە نێو دەریاوە
ماسییەکان هێرشیان برد
دەریام بەچاو بینی
کۆلارەیەکم دروستکرد، هەروەک بووکی تارا بەسەر
کلکەکەی پەلکەزێڕینەیی
هەڵمدا بۆ ئاسمان
ئاسمانم بە چاو بینی
گەورەبووم، بێئیش بووم، برسی مامەوە
ئەبوو لە شوێنێک پارە پەیاکەم
چوومە نێو کۆڕی مرۆڤەکانەوە
مرۆڤەکانم بە چاو بینی
نەچاو لەسەر و هاوسەر ئەپۆشم
نە لەدەریا، نە لە ئاسمان بەڵام
ئەم دواین شتەی کە بینیم لێم ناگەڕێ
لێم ناگەڕێ: زەحمەتی دابینکردنی گوزەرانی ژیان
بەخۆم ئەڵێم کەواتە ئەمەیە
دواین شتێک کە شاعیری بەدبەخت ئەبێ ببینێ.

## حیکایەتی ئەحمەد بۆ عەلی ڕەزا

چەند سەیرە حیکایەتی ئەحمەد
بۆ عەلی ڕەزا
یەکێکیان لە لادێ دائەنیشێ

یەکێکیان لە شار
هەموو بەیانییەک
ئەوەی کە لە شارە ئەڕوات بۆ لادێ
ئەوەی کە لە لادێیە ئەڕوات بۆ شار.

### لە ژوورەوە (لە نێو زیندان)

پەنجەرە، لە هەموو شتێک باشتر پەنجەرەیە
لانی کەم ئەو باڵندانەی لە حاڵی تێپەڕیندان
ئەبینی
لە جیاتی بینینی چوار دیوار.

### ناخ

دەریاگەلێکمان هەیە لە ناخی هەتاودا
درەختگەلێکمان هەیە، لە ناخی گەڵادا
سبەینێ کە شەو تێپەڕی دێین
لەگەڵ دەریاکانمان لە نێوان درەختەکانماندا
لە ناخی بێ شتیدا.

### درەخت [١]

بەردێکم هەڵدا بۆ درەخت
بەردەکەم نەکەوتە خوارەوە
بەردەکەم نەکەوتە خوارەوە
درەخت بەردەکەمی خوارد
بەردەکەم ئەوێتەوە
بەردەکەم ئەوێتەوە.

### های کای

بۆنی قەوزەو
دەفرێک ڕۆبیان
لە لووتی ساندیکدا.

### جیابوونەوە

لە بەلەمێک ڕاماوم
کە ڕێگەی خۆی گرتووەو خەریکە
بەرەو پێش ئەڕوا
ناتوانم خۆم بخەمە دەریاوە، دونیا جوانە
لەلایەکیشەوە
پیاوەتیم
ڕێگەی گریانی لێگرتووم.

### ڕۆنەکەرە

مامە هیتلەر!
ڕۆژێک بفەرموو بۆ ماڵمان
زوڵفو سمێڵت پیشانی دایکم بدە
لەبەرامبەردا منیش بە دزییەوە
ئەڕۆم لە یەخچاڵی چێشتخانەکە
ڕۆنەکەرەت بۆ ئەدزم،
دەرخواردی سەربازەکانتی بدەی.

### ئاسوودە

ئەڵێی: ئەم شەڕو هەرایە لەناکاو تەواو ئەبێت،
ئەڵێی: برسی نەبم
ئەڵێی: ماندوو نەبم
ئەڵێی: میز نەکەم
ئەڵێی: خەوم نەیەت
دەبڵێ: بمرم ئیدی!

### ڕاستەوخۆ بەرەو «گملیک» [٢]

ڕاستەوخۆ بەرەو «گملیک»
دەریا ئەبینی
سەرسام مەبە!

## کۆچ

لە پەنجەرەکەیەوە
کە بەسەر سەربانەکاندا ئاوەڵایە
بەندەرگە ئەبینرێت و
ناقوسی کڵێسا
تەواوی ڕۆژ یەکبینە لێی ئەدا
جارناجار شەوان
دەنگی شەمەندەفەری لە پێخەفەکەیدا ئەبیست
تازە عاشقی کچێک بوو بوو
لە ئاپارتمانەکەی ئەوبەرەوە
لەگەڵ تەواوی ئەمانەدا
ئەم شارەی بەجێهێشتو
ڕۆیشت بۆ شارێکی دیکە.

## بەسەر

باڵندەکان بەسەر هەورەکاندا تێئەپەڕن
باران بەسەر هەوردا ئەبارێ
باڵندەکان بەسەر شەمەندەفەرەکەدا تێئەپەڕن
باران بەسەر شەمەندەفەرەکەدا ئەبارێ
باڵندەکان بەسەر ڕابردوودا تێئەپەڕن
باران بەسەر ڕابردوودا ئەبارێ
یار دێت، باڵندەکان بۆ هەرکوێیەک ئەیانەوێ
بابڕۆن
بە سەربارانەوە خۆر هەڵدێت.

## درەختەکەم

لە گەڕەکەکەماندا
ئەگەر جگە لە تۆ درەختێکی دیکەش هەبووایە
تۆم تا ئەم ئەندازەیە خۆشنەئەویست
بەڵام ئەگەر تۆش بتتوانیایە
لەگەڵمان یاریی خلیسکێنە بکەی
لەمە زیاتر خۆشم ئەویستی
درەختە جوانەکەم،
کاتی ووشک بوونی تۆ
ئەگەر خودا ویستبێتی
ئێمەش بۆ کۆڵانێکی دیکە گواستوومانەتەوە!.

## مرۆڤەکان

هەمیشە، بەڵام، بەتایبەتی
ئەوکاتانەی کە ئەزانم خۆشت ناوێم
حەزئەکەم تۆش لە ئامێزی دایکمدا ببینم
وەک ئەو مرۆڤانەی کە تەماشام ئەکردن
لە منداڵیمدا.

## خەون

لەخەودا بینیم کە دایکم مردووە
هەر کە بە گریانەوە لەخەو ڕاپەڕیم
یادی ئەو بەیانییەی جەژنم کەوتەوە؛
ئەو ساتەی بەگریانەوە
دوورکەوتنەوەو لەدەستچوونی کۆلارەکەم
لە ئاسماندا
تەماشا ئەکرد...

## سەرئێشە

١

ڕێگاکان هەرچەندە خۆشبن
شەو هەرچەندە فێنک بێت
جەستە ماندوو ئەبێت
سەرئێشە ماندوێتی نازانێ.

٢

تەنانەت ئەگەر هەرئێستاش بڕۆمەوە بۆ ماڵەوە
هیچ دوور نییە کەمێک دواتر بێمەدەرەوە
تاکاتێک ئەم جلو پێڵاوانە هی منن و
تاکاتێک کۆڵانەکان هی کەس نین.

## لە ناکاو

هەموو شتێک لەناکاو ڕوویدا
لەناکاو تیشکی خۆر بەر زەوی کەوت
ئاسمان لە ناکاو ڕوویدا
شین لەناکاو.
هەموو شتێک لە ناکاو ڕوویدا؛
لەناکاو دووکەڵ لە زەوییەوە دەستیکرد بە لوولخواردن و بەرزبوونەوە
چووزەرە لەناکاو دەرکەوت، شکۆفە لە ناکاو
میوە لە ناکاو دروستبوو
لە ناکاو،
لە ناکاو،
هەموو شتێک لە ناکاو ڕوویدا
کچ لەناکاو، کوڕ لە ناکاو،
جادەکان، ئاواییەکانی دەوروبەر، پشیلەکان
مرۆڤەکان...
عەشق لەناکاو ڕوویدا
شادی لەناکاو.

## شیعری کون

گیرفانی کون هێلەکی کون
قۆڵی کون چاکەتی کون
پانتۆڵی کون کراسی کون
ئاخر پڵاوپاڵێوی براکەم!

## گرفتاری عەشق بووم؟

ئایا بڕیار بوو من ئەوەندە بکەومە بیرو خەیاڵەوە،
یا مرۆڤێک بووم کە بێخەوی لێم بات،
ئاوا بێدەنگ و مات ببم،
تەنانەت حاڵم تێک بچێت لەو زەلاتەیەی
کە زۆرم حەزلێی بوو؟!
کەی بڕیار بوو وام لێبێ!

## Illusion

لە شەڕی عەشقێکی دێرینە ڕزگارم بوو
ئیدی ژنەکان هەموویان جوانن
کراسەکەم تازەیە
حەمامم کردووە
سەرم چاکردووە
ئاشتی بەرقەرار بووە
بەهار گەیشتووە
هەتاو سەری دەرهێناوە
هاتوومەتە نێو کۆڵان، مرۆڤەکان هەموو ئاسوودەن...
منیش هەروەها.

## شیعری مووکێشیی

نە بۆمبی ئەتۆمی
نە کۆنفڕانسی لەندەن
لە دەستێکیدا مووکێش،
لە دەستێکیدا ئاوێنە؛
هەرچی بەسەر دونیادا بێت
ئەو مێش میوانی نییە!

## سێبەرەکەم

ماندوو بووم، توانام نەما
بەردەوام بەدوای خۆمدا ڕایئەکێشم
ساڵانێکە پێبەپێی من خەریکە دێ
لەم دونیایەدا با ماوەیەکیش
هەریەکەمان بەجیا بژین؛
ئەو بەتەنیا
منیش بە تەنیا.

## ژیان 2

ئەزانم ژیان ئاسان نییە
بەڵام بەهەرحاڵ
پێخەفی مردوویەک هێشتا گەرمە
یەکێکیش تازە دەست ئەکا بەکار
ژیان ئاسان نییە هاورێیان
مردنیش ئاسان نییە
ئاسان نییە دابڕان لەم دونیایە!

### پەراوێز:

١- (بە هاوبەشی لەگەڵ ئۆکتای ڕەفعەت).
٢-ناوچەیەکە لە نزیک دەریای مەڕمەڕە.

### سەرچاوە:

مفت زندگی می کنیم، مفت
وەرگێڕانی لە تورکی ئەستەنبوڵییەوە: و.م. ئایرۆ
نشر الکترونیک مایند موتور ١٣٨٨

# من ئەوەم کە هەم

## بەشی دووهەم لە کتێبی گفتوگۆیەك لەگەڵ ئەدۆنیسی باوکمدا

نینار ئەسبەر
لە سویدییەوە: هیوا قادر

**نینار:** باسی گیرۆدەبوونی خۆتم بۆ بکە، ئالودەبوونی خۆت.

**ئەدۆنیس:** من ئالودەی نووسینم. جارێکی تریش ئەیڵێمەوە: من ئەگەر نەنووسم هەست ناکەم زیندووم. کاتێک ئەنووسم بۆم دەرئەکەوێت کە من کێم، من فێربووم خۆم بدۆزمەوە و پەردە لەسەر ڕووی خۆم هەڵماڵم. سەرباری ئەوەش نووسین ئەگەری ئەوەم ئەخاتە بەردەم کە ئەوانی تر باشتر بناسم، بێگومان دواتر هەموو دنیاش. من هەستێکم لەمەڕ ژیانی خۆم هەیە کە تەنها سەفەرێکە بۆ دۆزینەوە. ئەم جۆرە سەفەرەش ئەگەری ئەوە ئەخاتە بەردەمی ئینسان کە هەستبکات بوونی هەیە، بەشدارە لە دروستکردنی دنیا و گۆڕانەکانی. ئینسان لەم لایەنەوە چی سەبارەت بە شیعر بڵێت بەهەمان شیوە ئەتوانێت سەبارەت بە داهێنانی ناو کایەکانی تری وەک هونەر و فەلسەفەش بڵێت.

**نینار:** حەزت لە چ شتێکی ئەو ئالودەبوونەی خۆتە، ئەو وێنەیەی خۆت کە لای کەسانی ترە؟ چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەمەدا ئەکەیت؟ تۆ بۆ هەندێک کەس هەڕەشەیت، بۆ هەندێکی تر "ئەستێرە"، بۆ هەندێک کەسی تر "دیدێکی ئایندە"یت، بۆ هەندێک کەسانی تریش "خائن"ێکیت. تۆ هەم خۆشەویستیت و هەم ناحەز، ئایە ئەمە تۆ ناترسێنێت؟

**ئەدۆنیس:** ئەگەر هەمووان خۆشیان بویستمایە ئەوا شکم لە خۆم ئەکرد! ئەم جۆرە بڕیاردانە

مانایەکی سەرپێیانەی وای هێناوەتە ئاراوە کە گوایە ئەو کارانەی من هەر لە سەرەتاوە پرسیارێکی وای نەهێناوەتە ئاراوە و هیچ گفتوگۆیەکیشی لێ نەکەوتۆتەوە. کاتێک کە من گەردەلولێک لە دژەگوتن خەبەرئەکەمەوە دوو حاڵەت دروست ئەکەم: ئەو گروپە لە خەڵکی کە منیان خۆشئەوێت و لەگەڵ بیروڕاکانمدان، هەروەها ئەو گروپەشی کە ڕقیان لێمە. کاتێک کە ئەمە ڕوودەدات ئەو کات ئیتر من ئەزانم لەسەر ڕێگەیەکی تەواوم. بەڵام لەڕاستیشدا من هیچ گرنگییەکی ئەوتۆ نادەم بەوەی کە خەڵکی چۆن باسی من ئەکەن، ئیتر ئەو باسکردنە بەلایەنی باشەبێت یان خراپە.

**نینار:** ئایا هۆی چییە کە بیروبۆچوونەکانی تۆ هیچ گفتوگۆیەکی لە فەرەنسا و ئەوروپادا دروست نەکردووە؟ ئەمە هۆی چییە؟ تۆ لە ئەوروپادا شاعیرێکی عەرەبیت، بێگومان بە دیدگا و تێڕوانینی جیاوازی خۆتەوە. سەربارى ئەوەش تۆ نەبوویتەتە قوربانییەکی ئەو مەیلەی کە پێی ئەوترێت "سیاسەتێکی دروست"! ڕەنگە هی ئەوەشبێت پێش هەرشت کاری هەر بیریارێک ئەوەبێت کە بیر لە ئینسانەکان بکاتەوە ـ نەک بیر بۆ ئینسانەکان بکاتەوە بەڵکە بیریان لێبکاتەوە. تا ببێتە نووسەر و کەسێکی لێهاتوو لە گفتوگۆکردندا، ئەوەتا تۆ لەناو ئەو هەموو پێچ و پەنایانەی کە ڕوویان لە شوێنی مەبەستە تۆ بوویت بە گفتوگۆکەرێکی شارەزا و دەرکەوتوو، وانییە؟

**ئەدۆنیس:** من ناتوانم لەگەڵ ئەو ڕایەی تۆدابم کە ئەیڵێیت!

**نینار:** لەبەرئەوەی تۆ کەسێکی دیاریت و ئەو ترسەی کە ئینسانەکان هەیانە پیشانیان ئەدەیت، ئەو لاوازی و بێ مانایی و دەست و دڵ فراوانی و ئالۆزییەی کە هەیانە، هەروەها ئەو نائومێدبوونانەشی کە لە تۆیان هەیە پیشانیان ئەدەیت. تۆ "هەیبەتێکی باوکانە"یت بۆ زۆر لە وەچەکان. هەندێک لە ئینسانەکان تۆیان قبوڵە و هەندێکی تریشیان بەهیچ شێوەیەک قبوڵتناکەن.

**ئەدۆنیس:** من ئەمە بە شتێکی سروشتی ئەزانم. ئەم جۆرە تێڕوانینە جیاوازانەی ئەوان لەسەر من بەهیچ شێوەیەک توشی سەرسوڕمانم ناکات. ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە لەڕاستیدا من ئەبزوێم و خەریکی شتێکم کە گرنگە ـ بەبێ ڕەچاوکردنی باشی و خراپی هەڵسەنگاندنەکانی ئەوان لەسەر من. ئەمەش سەرباری هەموو ئەو شتانە هێز و وزە و باوەڕبەخۆبوونم پێئەبەخشێت. من دوودڵنیم کاتێک یارمەتی کەسێک ئەدەم. من هەرگیز هەوڵمنەداوە پلەوپایەی خۆم بەکاربهێنم بۆ شکاندنی کەسێک، تەنانەت شکاندنی ئەو کەسانەش کە هەڵسوکەوتی خراپیان لەگەڵ کردووم. بەگشتی من سەرم لە توانای خۆم ئەسوڕمێت، کەلەگەڵ بەرەو پێشچوونی کاتدا توانیومە لە دروستکردنی خۆمدا سەرکەوتووبم، من نە کەس ئازار ئەدەم و نەکەسیش بریندار ئەکەم. من زۆرجار کراومەتە یاری ڕمهاویشتن بۆ زۆر ڕەخنەی ژەهراویی، بەڵام گەر یەکێک لەوانەی کە ڕەخنەیان لێگرتووم شتێکی گرنگی هەبووبێت و خستبێتیەڕوو، ئەوا من ڕەخنەکەی ئەوم قبوڵکردووە و بەکارێکی ڕەوام زانیوە. لەو حاڵەتەشدا کە قابیلی وەڵامدانەوەبووبێت هەوڵمداوە وەڵامێکی کتومتی بدەمەوە.

**نینار:** دڵڕەقی بۆتە شتێکی عادەتی ڕۆژانە و چەکێکی لاوازی ئەوان. ئەو توندوتیژییەی کە بەکاریدەهێنن هۆی ئەو لاوازییەی ناوەوەیانە. تۆ پێویست ناکات توندوتیژی بەکاربهێنیت. چونکە تۆ لە راستیدا هەیت، شیعرەکانت هەن، ئەمانەش بۆخۆیان هێزن. ئەو هێزەش لە هەمانکاتدا لەلای ئەوانەوە وەک جۆرێک لە دڵرەقی سەیرئەکرێت بۆیە تۆیان خۆشناوێت!

**ئەدۆنیس:** هەندێک جار زۆر زەحمەتە کە هەروا سەیری ئەو جۆرە ڕەخنە و پەلاماردانانە بکەیت. بەشێوەیەکی تایبەت ئەو کەسانەی کە زۆرینەی جار پەلامارئەدەن بەچەشنێک خۆیان سازئەکەن کە تا بتوانن زۆرترین زەرەر بدەن. بەڵام سوپاس بۆ ئەوەی کە خۆشم نازانم چۆن هەمیشە توانیوومە بەرگەی ئەو جۆرە تاڵی و هەڕەشە و پەلاماردانانە بگرم. کە هەندێکجار ئەو هەڕەشانە تا ئاستێکی ترسناک ئەچن!

**نینار:** هەندێک لەو ڕەخنانە کوشندەن.

**ئەدۆنیس:** بەهەرحاڵێک ئەوەی شتێکی هەبێت بۆ وتن بەردەوام ئەبێت و ئەوەشی ئامانجێکی لە ژیاندا هەبێت بەدوایدا ئەچێت.

**نینار:** من هەستم نەکردووە کە بە شانوباهووتا هەڵئەدەم کەچی وا پەنجا دەقەشمان تێپەڕاند!

**ئەدۆنیس:** ئینسان ناتوانێت لەگەڵ کەسانی ناحەزدا بکەوێتە گفتوگۆوە. نزمکردنەوەی ئاستی خۆت بۆ ئاستی ئەوان مانای ئەوەیە کە تۆ زیاد لەو قەبارەیەی کە هەیانە گرنگیان پێ ئەدەیت.

**نینار:** گەر ئەوان شتێکی گرنگیان هەیە بۆ وتن چ پێویست ئەکات کاتی خۆیان بە قسەی بێ سەروبەر بکوژن.

**ئەدۆنیس:** من کاتی خۆم بە وەڵامدانەوەی ئەوانەوە ناکوژم. بەگشتیش هەرگیز وەڵامی هیچ لەو کەسانە نادەمەوە کە سوکایەتیم پێئەکەن.

## چەند سەعاتێک دوای ئەوە

**نینار:** تۆ ناوی یەکەمت عەلی یە، نازناوی نووسەریشت ئەدۆنیسە. پێئەچێت ناوی ئەدۆنیس زیاتر زاڵبێت. کەوایە چ جێگەیەک بۆ ناوی عەلی ئەمێنێتەوە؟ چیتر عەلی پشتگوێخراوە و لەناوتا ناژی، ئایا هیچ کات هەوڵی ئەوەنادات خۆی لەدەستی ئەدۆنیس ڕزگاربکات؟ نایەوێت لە ئەدۆنیس یاخیبێت؟ یاخود عەلی و ئەدۆنیس هەردووکیان یەک کەسن؟

**ئەدۆنیس:** من هیچ ناکۆکییەک لە نێوان ئەدۆنیس و عەلیدا نابینمەوە. ڕەنگە بەهۆی ئەوەوەبێت کە ناوی فامیلیەکەم یارمەتیدابم بۆ لەناوبردنی ئەو ناکۆکییە. ناوی یەکەمم عەلی لە "ئەل"ـەوە هاتووە

کە سەردەستەی خوداکانی سۆمەرییەکان بووە. هەروەها "ئەل، ئەلی، عەلی و ئەدۆنیس" مانای "گەورەم" ئەگەیەنێت. هەموو ئەو ناوانە یەک سەرچاوەیان هەیە. کە پێئەچێت ئەمە یارمەتیدابم بۆ ئەوەی ڕزگاربم لەو ناکۆکییەی کە لەنێوان ئەو دوو ناوەمدا هەیە. ئەمەش زۆر یارمەتی داوم. بەهەرجۆرێک بێت من بۆ خۆم هیچ جیاوازییەک لەنێوان ئەدۆنیس و عەلیدا نابینمەوە. دایکم بە عەلی بانگم ئەکات. خۆشم ئەم ناوەم زۆر پێخۆشە، ڕەنگە هی ئەوەبێت کە لەگەڵیدا گەورەبووم. بەڵام ئەدۆنیس زیاتر ئەو ناوەیە کە بەدنیای کلتوری ناساندووم.

**نیننار:** لەڕاستیدا ناوی ئەدۆنیس ناوێکی بەهێزی نامەسیحیانەی بەخەسڵەتە و ناوی عەلیش ناوێکە وابەستەیە بە دینی تاکخواییەوە.

**ئەدۆنیس:** من لەبەری نامەسیحییەکانم، بەڵام هەرچکاتێکیش بچوکترین ناکۆکی لەنێوان ئەو دوو ناوەدا بدۆزمەوە خێرا ئەیگەڕێنمەوە بۆ سەرچاوەکەیان کە ئەویش "ئەل"ـە.

**نیننار:** بەڵام لەبەر درێژی ناوی ئەدۆنیس نییە کە بووە بە عەلی؟ ئایا لە ناوی عەلی درێژتر حەزت بە ناوێکی تر کردووە؟

**ئەدۆنیس:** ئەدۆنیس درێژکراوەی "ئەل"ـە. ناوەکان جیاوازن و بۆخۆشیان دروستکەری کۆمەڵێک خەیاڵن و تەلەفوزیشیان جیاوازە، بەڵام لە سەرچاوەوە هەر یەک ناوبوون.

**نیننار:** بەڵام ئەو ناکۆکییە تەنها ناوەکان ناگرێتەوە بەڵکە لەئاستێکی بەرزدا جەوهەریشیان ئەگرێتەوە.

**ئەدۆنیس:** من هەستم بەهیچ ناکۆکییەک نەکردووە.

**نیننار:** ئایە بەڕاستی تۆ هەر هەمان ئەو کەسەیت، هەمان ئەو کەسەی پێش ئەو ناوەیت؟

**ئەدۆنیس:** ئەمەیان شتێکی ترە! ئەو کەسەی کە هەبووم هەقی بەسەر ناوەوە نییە. من ئەو کەسەم کە لە لادێکەمەوە هاتووم، بەڵام لەهەمان کاتدا کەسیکی تریش بووم. من ئەو کەسەم کە لەلادێ ژیاوم، بەبێ ئەو کەسەش من نەمئەتوانی ببم بەم کەسەی کە ئێستا هەم. بەو شێوەیە ئەوکەسەش هەر خۆمم، بەڵام کە ئەڵێم "خۆم"م مانای ئەوەنییە بڕیارمدابێت کە من ئەمرۆ کێم. ئەو "من"ـە چیتر پێناسەی من ناکات. بەڵکە ئەو "من"ـەی ئێستامە کە ئەڵێت من کێم. وەک ئەوە وایە ئینسانێک بە جەستەیەکەوە بڕوات کە لەناویدا گۆڕابێت، بەڵام بە چ ڕۆحێکەوە کە تا ئێستا وێنەیەکی تەواوی نەبووە ـ بە پەیوەندی بەو جەستەوەی کە ئینسان پێوەی لەدایکبووە ـ بۆ ئەوەی لەو ناکۆکییەش بگەیت کە لەنێوان ئەوەی بووە و ئەوەی کە ئێستا بەڕێوەیە ببێت. ئینسانێک بۆ من ئەوەنییە کە هەیە، بەڵکە ئەوەیە کە هەوڵئەدات ببێت بە چی. ئینسان بە کامڵی لەدایک نەبووە: لە ژیاندا ئەبێت بەوەی کە لە خۆیدا دروستی ئەکات. شوناسی ئینسان بوونی ئینسانە، ئەمەش تەنها

لەسەر ئەوە بنیاتنانرێت کە پاشخانی ئەم ئینسانە چییە بەڵکە لەسەر ئەوە بەندە کە ئەم ئینسانە چ شتێکی لەبەردەمی خۆیدا داناوە بیکات.

**نینار:** لە ڕاستیدا ئەمڕۆ تۆ ئەدۆنیسیت، لەگەڵ هەموو ئەو مانایانەی کە هەیەتی، ئایە ئەمە تۆ مەجبورناکات کە هەڵگری بیروبۆچونێکی ئەخلاقی بیت لە خۆتدا؟

**ئەدۆنیس:** من هوشیارم بەوەی کە من بەرپرسیاریەتیەکی گەورەم لە کۆمەڵێک ئاستدا لە ئەستۆدایە. ئەم بەرپرسیارییەشم هەم وەک شاعیرێک و هەم لە ڕووی هەڵوێست وەرگرتن و پەیوەندییەکانەوە هەڵگرتووە.

**نینار:** قەت هەستناکەیت گیرۆدەبوویت بەدەست ئەو "ئیماژە" دیمەنەی کە هەتە؟

**ئەدۆنیس:** من گوێم لە بیروبۆچوونی خەڵک بووە لە سەر خۆم و هەوڵیشمداوە تێیانبگەم، بەڵام من تا ئێستاش هەر بەردەوام ئەوشتە ئەکەم کە هەڵمبژاردووە یان هەستئەکەم کە لەناوەوە پێویستم پێیەتی بیکەم. هەربۆیەشە نەمهێشتووە عاسی بم، نەمهێشتووە گیرۆدەبم بەدەست ئەو پیاهەڵدان و پەلاماردانانەوەی کە ئەکرێم. زۆرجار هەردوو جۆرەکەم پێوتراوە بەڵام تائێستاش من بەردەوام لەسەر ئەو ڕێگایەی خۆمم کە لە قەناعەتەکانی خۆمەوە نزیکترینە، لە ڕاستیدا نزیکترینیشە لە خودی خۆمەوە.

**نینار:** ئەمەش بۆخۆی ڕەنگە هەروا ئاسان نەبێت!

**ئەدۆنیس:** وایە قورسە! هەندێک جار ئینسان کە شتێک ئەنووسێت هەندێک پێیانوایە خراپە و هەندێکی تریش پێیان تایبەت و جوانە. ئەگەر ئینسان خۆی ساغنەکردبێتەوە کە خۆی کێیە و چەندە تواناى هەیە، ئەوا بۆخۆی تیائەچێت.

زیاد لە پێویست گرنگە خۆت بناسیت، ئەگەرچی لە بنەڕەتیشدا لەم دنیایەدا ئینسانێک نییە ئیتر "ژنبێت یان پیاو" کە خۆی پێش هەرچ کەسێکی تر باشتر نەناسێت. دیارە خەڵکانی واش هەن کە بە پەلەپڕوزکێ خۆیان ناسیوە و باش و تایبەتیش نین. بە دڵنیاییەوە ئەمەش پەیوەندی بەو مەرجانەوە هەیە کە ئەو کەسانە لەسەر خۆیان هەیانە، بەو بارودۆخەی کە تیایدا ئەژین، ئەم پەیوەندیانەش ژیانی دژوار کردوون. لەبەر ئەمەشە کە زەحمەتە بۆ ئەوان لە دنیادا باش سەرنج لە کەسایەتی خۆیان بدەن.

سەبارەت بە شیعرەکانم ئەتوانم بڵێم کە کەس هێندەی خۆم باش تێیان ناگات، هەر لەبەر ئەم هۆیەشە کەس ناتوانێت وەک خۆم ڕەخنەیان لێبگرێت. دوای پەنجا سال نووسەربوون تێگەیشتووم کە خوێنەر هەمیشە باشتر لە شیعرەکانم ئەگات گەربێت و جارێکی تر بیانخوێنێتەوە.

**نینار:** ئەمەش تایبەتمەندییە، وانییە؟

## دواتر

**نینار:** ئەگەڕێینەوە بۆ لای ئەدۆنیس. بۆچی پێتوابووە کە تۆ پێویستت بەو نازناوەیە؟ بەچاوپۆشی لەو شتانەی کە باستکردن: هەمیشە ڕۆژنامەکان کە شیعرەکانی تۆ بڵاوئەکەنەوە خۆیان ناوەکەت لە ژێریدا ئەنووسن.

**ئەدۆنیس:** نازانم.

**نینار:** ویستووتە بگەیت بەچی؟

**ئەدۆنیس:** هیچ شتێک. من بەرێکەوت ئەو ناوەم هەڵبژارد. بە مەبەستێکی تایبەتیش ئەمەم نەکردووە.

**نینار:** بەڵام هیچ شتێک نییە رێکەوت بێت؟

**ئەدۆنیس:** بەهەرحاڵێک ئەمە پلانی بۆ دانەنرابوو.

**نینار:** سەرباری ئەوەی کە تۆ پلانت بۆ هەڵبژاردنی ئەو نازناوەش دانەنابێت بەڵام ئەم جۆرە هەڵبژاردنانە بێ بیرکردنەوە نین، چ شتێکی تایبەت لە پشتی ئەو نازناوەتەوە هەیە. ئینسان بۆچونێکی وای بەرامبەر بە تۆ لەلا دروستئەبێت کە تۆ ئەتەوێت لە پشتی شتێکەوە خۆت بشاریتەوە. تۆ بەدوای پاساوهێنانەوەدا ئەگەڕێیت بۆ ناوەکەت. تۆ ئەتەوێت لە پشتی کەسایەتییەکی نا مەسیحی ئەفسانەییەوە خۆت بشاریتەوە بۆ ئەوەی بە شێوەیەک لە شێوەکان خۆت بکەیتە کەسێکی دەستپێنەگەیشتوو.

**ئەدۆنیس:** من پێموایە کە تەنها ڕوونکردنەوەیەک هەبێت بۆ ئەو هەڵبژاردنە ئەوەیە کە پەیوەندی بە مەنفای خۆمەوە هەیە. ئەو هەڵبژاردنەش هێمایەک بووە بۆ ئەو هەستە قوڵەی کە خۆم وەک پەناهەندەیەک بینیوە.

**نینار:** بەڵام لە هەمانکاتدا نازناو مەودایەک لەنێوان ئەوەی کە لە راستیدا هەیت و ئەوەی کە هەوڵئەدەیت ببیت دروست ئەکات. تەنانەت مەودایەکیش لە نێوان تۆ و خەڵکانی دەوروبەرتدا دروستئەکات. ئەمەش ڕەنگە هەندێک جار ببێتە هۆی دروستکردنی "کەسایەتییەک" کە ئینسان خۆی لە پشتییەوە بپارێزێت. من بیر لەو دوو "ئیدیۆل"ـەی خۆم ئەکەمەوە: مارلین و بویی. مارلین مۆرۆ کەسایەتییەکی بۆ خۆی دروستکرد کە ئەیتوانی لە پشتییەوە خۆی بشارێتەوە، بەڵام هەندێکجاریش ئەو کەسایەتییە ئاشکرای ئەکرد. ئەو هەرگیز نەیتوانی لە دەستی ئەو کەسایەتییە ڕزگاریببێت و لە کۆتایشدا ئەو زاڵبوو بەسەریدا. دەڤید بوییش خۆی خزاندبووە ناو کۆمەڵێک کەسایەتییەوە. وەک زیگی ستاردوس، ئەلادین سانە، دۆقە سپییە لاوازەکە[1] و چەندانی تر. ئەمانەش

هەموویان بەناخۆشی کۆتاییان هات. چیش ڕوویدا ئەوەبوو کەسایەتی خاوەن نازناوەکان بەشێوەیەک بەسەر ئەودا زاڵبووبوون کە لەڕاستیدا دواتر ئەو نەیئەزانی خۆی کێیە. ئایا تۆ قەت شتی وات بەسەردا نەهاتووە کە خەریکبوو‌بێت کۆنترۆڵی خۆت لەدەست بدەیت.

**ئەدۆنیس:** نا، هەرگیز.

**نینار:** حەقیقەتی ئەم هەڵبژاردنە بەتایبەتی لەپشتی ئەم نازناوەوە چییە؟ ئایە ئەدۆنیس چی بەخشیوە بە تۆ؟ ئەم ناوە تۆی بەکوێ گەیاندووە؟

**ئەدۆنیس:** ئەم ناوە خەڵکی توڕەکردووە.

**نینار:** نەخێر، من لەگەڵ خودی تۆ قسەئەکەم. ئەدۆنیس چی بەتۆ بەخشیوە؟ ئەمەوێت زیاتر بۆم ڕوونبکەیتەوە کە بۆچی تۆ بەتایبەت ئەم نازناوەت بۆخۆت هەڵبژاردووە. ئەمە چ مانایەکی هەیە بۆ تۆ؟

**ئەدۆنیس:** من بەڕێکەوت ئەم ناوەم هەڵبژاردووە. پەیوەندیی بە ئاگاییەوە نییە.

**نینار:** باشە ئەگەر ئەوە ڕێکەوت بووبێت ئەی بۆچی تۆ تائێستاش ئەو ناوەت هەیە؟

**ئەدۆنیس:** لەبەر ئەوەی هەر لەگەڵ بەکارهێنانی ئەو ناوەدا ئەو ناوە گونجا. ئیتر خەڵکیش بەو ناوەوە بانگیان کردم.

**نینار:** کام لەو ناوانە عەلی یان ئەدۆنیس زیاتر لای خەڵکی کاریگەرترە؟

**ئەدۆنیس:** ئەدۆنیس، لە ڕاستیدا! ئەگەر لەمڕۆدا بمەوێت زۆر لەبەرچاونەبم ئەوا ناوی یەکەمم بە عەلی ئەنووسم. عەلی بۆتە ناوی یەکەمم لە ناو پاسپۆرتەکەمدا، ناوێکیشە بۆ بەڕێکردنی کاروباری ئیداری.

## ڕۆژێکی تر

**نینار:** ئایا پێتوایە دوای مردنت خەڵکی لە تۆ بگەن؟ قەت بیرت لەوە نەکردۆتەوە؟

**ئەدۆنیس:** بێگومان نا.

**نینار:** قەت بیرت بۆ دواڕۆژێکی وا ناچێت؟

**ئەدۆنیس:** نەخێر، لەبەرئەوەی ئەمە بەلامەوە گرنگ نییە. وەکو تریش ئینسان ناتوانیت ڕێ لە خەیاڵی ئەو خەڵکانە بگریت کە چۆن سەیری ئەکەن. تەنها شتێک کە بەلای منەوە گرنگبێت ئەوەیە کە خەڵکی تێمبگەن. هەموو تەمەنایەکی من ئەوەیە کە وەک کەسێکی نزیک بە خۆیان تێمبگەن.

**نینار:** ماوەیەکی هێندە زۆر لەمەوبەر نییە کە هاورێیان کۆبووبوونەوە و باسی تۆیان ئەکرد. منیشیان لەگەڵ بووم، من لەویادا دەمودەست تووشی حەپەسانێک بووم نەبێتەوە کاتێک کە پیاوێک لەناویاندا دەستیکرد بە قسەکردن لەسەر تۆ، ئەو بەجۆرێک باسی ئەکردیت وەک بەوەی باس لە پاڵەوانێکی ناو حەکایەتەکان یان ئەفسانەکان بکات، کە هیچ کەسێک لەوەوبەر نەیناسیبێت. ئەو شێوە هەڵسوکەوت و باسکردنەی ئەو کەسە لەسەر تۆ حەکایەتخوانەکانی ناو چایخانە کۆنەکانی شامی بیرئەهێنامەوە.

**ئەدۆنیس:** ئەیووت چی؟

**نینار:** هەر لەسەرەتاوە هەڵسوکەوتەکەی وای لێکردم تووشی سەرسوڕمانبم. ئەو لەسەر قەنەفەیەک بەرامبەر بە من دانیشتبوو. هاتبووە سەر قەراخی قەنەفەکە و قیت دانیشتبوو بەچەشنێک هەموو قورسایی جەستەی خستبووە سەر بڕبڕەی پشتی و سێبەنەی. لنگیشی لێ فشکردبوەوە و دانیشبوو. لای ڕاستی جەستەی هێنابووە پێشەوە و خستبوویە سەر ڕانی چەپی و لای چەپیشی بردبووە دواوە. چاوەکانی بریسکەیان ئەهات و دەستەکانی خێرا خێرا لەگەڵ قسەکانیدا ئەجوڵاند. من خۆم خزاندبووە ناو قەنەفەکەوە و بەوردی سەرنجم ئەدا، وتی: "ئێوە ئەزانن زۆرترین شتێک لەماڵدا ئەدۆنیس حەزی لێیبێت چییە؟" هەموو هاورێکانی ترم کەمێک شەرم گرتنی، بەڵام پێئەچوو ئەو پێیوابێت کە مەسەلەیەکی گرنگ باس ئەکات. "نا، زۆرترین شتێک کە ئەدۆنیس حەزی لێبکات چییە؟" وەڵامی ئەویش ئەوەبوو ووتی: "ئەدۆنیس زیاتر حەزی لە حەمامە! گرنگترین ژوورێک لە ماڵدا بۆ ئەو حەمامە. خۆشترین کاتەکانی ڕۆژانی ئەو لەوێوە دەست پێ ئەکات!" هەموو ئەوانەی لەوێ بوون - بە منیشەوە کە لەتاوا خۆم خلافاندبوو - بە کۆرسێک وتمان: "ئۆی، چەند شتێکی حەکیمانەیە! جا باش ناکات!" من بەتەواوەتی واقموڕمابوو و حەزیشم نەکرد هیچ بڵێم! ئەوکات هەستمکرد کە تۆ تا چ ئاستێک کەسێکی ناسراویت. مادام تۆ هەر لە ئێستاوا ئاوایت، ئەبێت دوای مردنت چەند لەمە زیاتر باسبکرێیت! بۆیە پێئەچێت هەرکەسە و لای خۆیەوە حەکایەتێکی بچکۆلەی لەسەر تۆ هەبێت!

**ئەدۆنیس:** ناتوانرێت ڕێ لەم جۆرە شتانە بگیرێت. ئەبێت چی بکەیت؟ هیچ.

**نینار:** وایە، ئەوە زۆر ڕاستە، ناتوانیت هیچ شتێک بەرامبەر ئەمە بکەیت.

**ئەدۆنیس:** ئەمە تەنها کەسایەتی خەڵکی پیشان ئەدا.

**نینار:** وایە، بەڵام ئەو وا باسی تۆی ئەکرد وەک بەوەی تۆ مردبیت، وەک ئەوەی حەقیقەتێکی وای ئاشکرا کردبێت کە کەس نەتوانێت پێیبڵێت وانییە. هەر لەبەر ئەوەش بوو کە من تووشی شۆک بووم! ئەی خۆت لەم بارەوە ئەڵێیت چی؟

**ئەدۆنیس:** هیچ.

**نینار:** هەر ئاوا ئاسان، ئێ خۆ ئەمە لەبەرچاوی مندا ڕوویدا. من گوێم لە هەموو ئەو قسانەی بوو کە کردنی ناچاریشبووم گوێی لێبگرم.

**ئەدۆنیس:** بەڵام ئەم جۆرە کەسانە زۆر کەمینەن.

**نینار:** ئەوەی کە ئەم قسانەی ئەگێڕایەوە ڕەخنەی لە تۆ نەئەگرت. ئەو کەسێکی هاویاربوو لەگەڵ تۆ. ئەوەی منی زۆر تووشی شۆک کرد ئەوەبوو تێگەیشتم کە تۆ چەندە چویتەتە ناو ژیان و قسەی خەڵکانی ترەوە ـ وەک ئەوەی ئەوان بە جۆرێک لە جۆرەکان دەسەڵاتیان بەسەر تۆدا بشکێت.

**ئەدۆنیس:** ڕاستییەکەی ئەوەیە خەڵکی چیرۆکی زۆر لەسەر من ئەگێڕنەوە. هەندێکیان ئەڵێن کە من لە هەموو شوێنێک کۆشکێکم هەیە وەک نیویۆرک، یابان، پاریس و لەندەن.

## دواتر

**نینار:** تۆ چ پەیوەندییەکت لەگەڵ جەستەی خۆتدا هەیە؟ ئایا تۆ هەر زوو هەستت بەوە کرد کە پیاوێکی قۆز و سەرنج ڕاکێشیت؟

**ئەدۆنیس:** نەخێر، من تا ماوەیەک لەمەوبەر هەستم بەوە نەکردبوو ـ تازە درەنگە وانییە!

**نینار:** بێگومان! (پێئەکەنێت) پێتوایە من باوەڕ بەو قسەیەت بکەم؟

**ئەدۆنیس:** بڕوابکە، زۆرنییە کە هەستم پێکردووە، تەنها چەند ساڵێک ئەبێت!

**نینار:** تۆزقاڵێک چییە باوەڕت پێ ناکەم! (پێئەکەنێت)

**ئەدۆنیس:** سەربارى هەموو ئەم شتانە شتێک هەیە ئازارم ئەدات، ئەویش ئەوەیە کە من جێگای ئەو هەموو سەرنجدانەبووم و کەچی تائێستاش من پێمنەزانیووە! (پێئەکەنێت)

**نینار:** جێی باوەڕنییە!

**ئەدۆنیس:** تەنها هەر بیست ساڵێک لەمەوبەر ئەبێت هەستم پێکردووە. ڕەنگە چەند ساڵێک لەوە زیاتریش بێت ـ ئەوکاتە بوو کە بووبووم بە چل ساڵ.

**نینار:** بەهەرحاڵێک من وێنەی ئەو کاتانەی تۆم بینیوە کە چل ساڵ بوویت. وەک ئەوەی کە خەڵکی ئەڵێن، تۆ وەک "قومبەلەی زەڕرە" وابوویت هێندە قۆزبوویت. هەر بەڕاستی تۆ ئەوکات هەستت بە جەستەی خۆت نەکردووە کاتێک کە بیست ساڵ بوویت؟

**ئەدۆنیس:** ئا بەڕاستمە. من ئەزانم کە هەندێک جار ووتوومە کچان زۆر حەزیان لێکردووم ئەمەش ڕاستە، بەڵام هەرگیز تێنەئەگەیشتم بۆچی. کە واشم نەکردووە تەنها هەر پەیوەندی بەوەوە هەبووە

کە من زۆر سەرقاڵی کەسایەتی خۆم و بنیاتنانی کەسایەتی کلتوری خۆم بووم. بێ لەوەش زۆر هەژاربووم و هیچ پارەیەکیشم نەبوو.

**نینار:** ئێمە قسەمان لەسەر پارە نییە، بەڵکە باسی درککردنی تۆ ئەکەم بۆ جەستەت.

**ئەدۆنیس:** من هەستم بە پێویستی و ئارەزووییەکی وا نەکردووە لەگەڵ ئافرەتاندا بچمەدەرێ. بیرم لەم جۆرە شتانە نەئەکردەوە. زۆر بە سادەیی بۆت ڕوونبکەمەوە ئەوەبوو کە من زۆر سەرقاڵبووم بە دروستکردنی کەسایەتی خۆم و دنیای خۆمەوە. هەروەها هەندێک کێشەشم هەبوو کە پەیوەندیان بە خۆمەوە هەبوو. من پارەی ئەوەم نەبوو کچێک داوەتی خواردنەوە یان خواردنێک بکەم لەبەر ئەوەی کە زۆر هەژاربووم. ئەوەی هەمبوو نەمبوو تەنها هەر بەشی خۆمی ئەکرد.

بۆیە من زۆر درەنگ بەوەم زانی کە ئەمتوانی کچێک بکەم بەدۆستی خۆم. (پێئەکەنێت) هەندێک لەو کچانە کە ئێستاشی لەسەربێت زۆر لە من گەنجتربوون، ڕەنگە ئەوان وەک باوکێکی گەورە سەیری منیان کردبێت. بۆیە ڕاهاتبووم ئەمووت: "ئاخر من ئەوەندە پیرم بە باوکتان ئەشێم!" کچانیش پێیان ئەوتمەوە: "تۆ شاعیریت، کەچی هێشتا باسی تەمەن ئەکەیت!".

**نینار:** (پێئەکەنێت)

**ئەدۆنیس:** منیش وەڵامم ئەدانەوە: "بەڵام وایە چیبکەین!" بەهەرحاڵێک من هەرگیز کاتی ئەوەم نەبووە بۆ ئەم تەرزە پەیوەندیانە. کاتێکیش ئینسان ئەچێتە ساڵەوە تەنها دەستمایەیەکی ژیان کە بەدەستییەوە مابێتەوە تەنها هەر کاتە. ئەو کاتەی کە ماومە زۆر گرانبەهایە بۆ من. بۆیە ئەبێت هەموو سەعاتێکی کە لە عومرم ئەڕوات بۆ کار تەرخانیبکەم، یاخود شتێک بکەم بنیاتنەربێت. ئەگەر وانەکەم پێموایە کات بەفیڕۆئەدەم.

**نینار:** ئەگەڕێمەوە بۆ سەر بابەتەکەی پێشوو. تۆ چۆن لەو هێزی سەنجراکێشانەی خۆت تێگەیشتبوویت؟ دیارە زەحمەتە هەمیشە هەم جوانبیت و هەم سەرنج ڕاکێشیش، تۆ خۆت هەم شاعیربوویت و هەم بیریاریش. ئایا بۆ تۆ زەحمەت نەبوو مامەڵەکردن لەگەڵ هەموو ئەمانەدا؟ قەت نیگەران نەبوویت بەمە؟

**ئەدۆنیس:** هەرگیز بەلامەوە گرنگ نەبووە.

**نینار:** مەبەستت ئەوەیە بڵێیت ئینسان بۆیە هەست بەو فشارەناکات لەسەر خۆی لەبەرئەوەی هەست بە هێزی سەرنجراکێشانی خۆی ناکات؟

**ئەدۆنیس:** کاتێک ئینسان هەستی کرد بە ڕواڵەت جوان و سەرنج ڕاکێشە یان هەستیکرد لەلایەن خەڵکەوە خۆشەویست و چاولەدووە ڕەنگە ئەمە ببێتە هۆی کێشە و دروستکردنی ئاڵۆزی لەپەیوەندیکردنی لەگەڵ خەڵکی تردا. بەڵام من بۆ خۆم هیچ کات لەم جۆرە کێشانەم نەبووە. ڕەنگە

تا ئێستاش هۆیەک هەبێت ئەوەیە کە: هەرگیز من باوەڕم بەوەنەبووە کە خۆشەویستی یان پەیوەندی سێکسی ئەتوانن ببنە هۆی چارەسەرکردنی کێشەکانم. ئەگەربێتوو چارەیەک هەبێت ئەوا لای من تەنها لەناو نووسین و شیعرەکانمدایە. ئەگەر هات و بخرامایەتە بەردەم هەڵبژاردنی پەیوەندییەکی خۆشەویستی لەگەڵ ئافرەتێکی زۆر جواندا و لەبەردەم نووسیندا، ئەوا بێ چەندوچوون نووسینم هەڵئەبژارد. ئەمەش مانای ئەوەنییە کە پێموابێت شیعرنووسین باشتربێت لە پەیوەندییەکی خۆشەویستی. شیعر بۆ ئافرەت، ژیانێکی شاعیرانەیە. ڕاستره بڵێم کە من باوەڕم بە شتێکی تر نییە کە باشتربێت لەو گوزارشتەی کە لە بوونی خۆمی ئەکەم جگە لە داهێنانەکانم.

**نینار:** ئەی جەستەت؟ ئایا هەست ئەکەیت کە تۆ زۆر ئازا و ئازادیت لەگەڵ جەستەی خۆتدا؟

**ئەدۆنیس:** ئا، من زۆر حەزم لە جەستەی خۆمە و زۆر باشیش خزمەتی ئەکەم. بەڵام سەرباری ئەو حەزلێکردنەش لەجەستەی خۆم هەندێک شت هەن کە درەنگ پێیانگەیشتم. من هەمیشە هەستم بە ئازادی کردووە لەگەڵ جەستەی خۆمدا، بەڵام ئەم ئازادییەش هەندێک سنووربەندی پێویستە. من هەرگیز ئەم ئازادییەم لەگەڵ کەسی بەدکرداردا بەشنەکردووە. من زۆرکەسی وام ناسیوە کە بەهۆی ئەو بیرۆکەی ئازادییەوە خۆیان گومراکردووە و بێڕێزیان بە جەستەی خۆیان کردووە. من خۆم هەمیشە حورمەتی خۆمم گرتووە و پاراستوومە، بەڵام هەرچکاتێکیش ڕێم بەو ئازادییە دابێت ئەوا تا ئەوپەڕی چووم. ئەمەش بەپێی ئەو گونجاندنەی کە لەگەڵ تەمەن و جەستەمدا بگونجێت. (پێئەکەنێت) کاتێکیش هاوڕێکانم و براکانم ئەمبینن کە ئاوا ماومەتەوە سەریان ئەسوڕمێت.

**نینار:** ڕوونی بکەرەوە مەبەستت چییە لە "بەدکرداری" کردن بە جەستە. تۆ پێتوایە من جەستەی خۆم توشی بەدکاری ئەکەم ئەگەر لەگەڵ چەندان کەسی جیاوازدا سێکس بکەم؟ بێ ئەوەی ئەم حاڵەتانە بخرێنە ناو چوارچێوەی "خۆشەویستی بکە، نەک جەنگ"[2]، بۆیە من پێموایە گرنگە گەربێت و چەند پەیوەندییەکی سێکسیت هەبێت بۆ ئەوەی دواتر بتوانیت کەسێکی باش بۆ خۆت هەڵبژێریت، کەسێک کە بەتەواوەتی جەستەی خۆی بناسێت. ئەمەش جۆرێکە لە پەیوەندیکردن بۆ ناسینی ئەوەی بەرامبەر. فراوانکردنی مەیلی سێکسی وەک داهێنان وایە. گەشە بە ژیاندۆستیمان ئەدات. وامان لێ ئەکات بیرمان بکەوێتەوە کە ئێمە جەستەیەکی زیندووین و ویست و توانای لەزەتبردنمان هەیە. بەڵام من نامەویت پێ لەسەر ئەوە دابگرم کە ئینسان ئەبێت هەر لەزەت لە سێکسکردن وەرگرێت. چونکە ئەمە ئەکرێت ببێتە هۆی بێزاربوونێکی ترسناک. بەڵام هەرگیزیش ناتوانم بە کەسێک بڵێم ئەگەر ژن بێت یان پیاو کە جەستەی خۆی خراپ بەکارئەهێنێت چونکە چەندان کەسی هەن سێکسیان لەگەڵدا ئەکات. ئەگەرچی دیارە جیاوازییەکی زۆریش لەنێوان پیاو و ژندا هەیە کە پەیوەندی بەو شوێنەوە هەیە. زۆرینەی جار ئافرەت بە "قەحبە" ئەزانرێت گەربێت و چەند کەسێک یان چەند دۆستێکی هەبێت. بەڵام گەر پیاو ئەوەی هەبێت ئەوا خۆی بە "پلەی بۆی" یان دۆن ژوان یان بە لەبلەبان ئەزانێت و وەکو پاڵەوانێکیش سەیری ئەکرێت! ئەمەش زۆر

بە ئاسانی بەلای منەوە جێگای قبوڵ نییە. عەشق بەشێکە لە ژیان. سێکس کرد جۆرێکە لە حورمەتگرتنی ژیان، هەروەها حورمەتگرتنی جەستەش.

من بۆ خۆم فێرێ شتێکی بچکۆلەبووم ئەویش ئەوەیە کاتێک کە کێشەکان پەیوەندیان بەم لایەنەوە هەبێت، ئەوا تەنها هەر لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا جەستە و عەشق تابۆ نییە. من ساڵی ١٩٩٨ لەگەڵ سامیردا لە نیویۆرک بووم. زۆر عاشقی یەکتربووین. سامیر لە تەواوکردنی خوێندنەکەیدا بوو لە زانکۆی کۆلۆمبیا. من و ئەو پێکەوە چووین بۆ شار. دەستمان لەدەستی یەکتریدا بوو، کاتێکیش هەستمان بەو ساتە ئەکرد کە ئەبێت یەکتری ماچ بکەین ئەوەستاین و وەک دوو عاشق کە ئەوکاتە هێندە عەشقی یەکتربووبووین ماچی یەکتریمان ئەکرد، وەک هەموو دوو عاشقێکی دنیا ـ یان ڕەنگە وەک دوو عاشق کە لە کونجێکی ئەم دنیایەدا ماچی یەکتری بکەن. ئەوەی کە زۆر جێێ سەرسوڕمانی من بوو لەناو جەرگەی مانهاتنی نیویۆرک لە ئەمەریکا، لە ناو وڵاتی ئازادی و تاکگەراییدا، سەیارەکان لە پاڵماندا ئەوەستان و شۆفێرەکان بە شەڕانگێزانەوە هاواریان لێئەکردین: "ها ئێوە! ئەوە خەریکی چ بێحورمەتییەکن؟ بڕۆن! شوێنی گونجاوتر هەیە بۆ ئەم جۆرە کارانە!"

**ئەدۆنیس**: کە من باس لە «بەدکرداری» ئەکەم پەیوەندی بەوەوە هەیە، من پێموایە جەستەی ئینسان جوانترین شتێکە کە هەیە. بە سوک سەیرکردنی ئەم وێنەیە ئەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەمیش وەک هەر شتێکی تری لێبێت و تایبەتمەندی خۆی بدۆڕێنێت، ببێتە شتێکی ئاسایی و نەویستە. جەستەی ئینسان یەکێکە لە هەرە دەگمەندترینەکان و پێویستە لەسەر ئینسان ئەو دانسقەییەی جەستە بپارێزێت. سەرباری ئەوەشی کە من پێموایە جەستە، لەڕووی سێکسکردنەوە، پێویستی بە جەستەی ترە، بەڵام هەمیشە لە پەیوەندییەکدا کە گرەنگتی ئەو حورمەتگرتنە دوولایەنییەی تێدابێت، سەرباری هاویاری و عەشق. جەستە بۆ خۆی سروشتە و بەهەمانشێوەش لایەنی ئاژەڵیانەی تێدایە، بەڵام ئەو لایەنی ئاژەڵیانە ئەکرێت سنوری سروشتیانە ببەزێنێت و بگاتە جۆرێک لە ئازادی. ئازادیش هەمیشە شتێکی سادە و بێ بایەخ نییە بەڵکە ئەبێت هەمیشە ئینسان خۆی بە بەرپرسیاربزانێت لە بەرامبەریدا.

**نینار**: ئایە ژنان لە ژیانی تۆدا ڕۆڵێکی گرنگیان بینیوە؟

**ئەدۆنیس**: بێگومان! ژیانی من بێ مانایە بەبێ بوونی ژن. ڕۆڵی ئەوان لە ژیانی مندا هەم لایەنی باشە و هەم لایەنی خراپەشی هەبووە. بەڕوویەکی گشتیدا زیاتر من لایەنە خراپەکەی شتی فێرکردووم. ژنان فێری عەشقیان کردم، ڕاسترە بڵێم ئەوەی کە پێیئەوترێت عەشق، کە دیارە هەرگیزیش نابێتە چارەی کێشە ڕاستەقینەکانی ژیان. لای من شتێک نییە ناوی عەشق بێت گەربێت و لەو سەرەتایەوە دەستپێنەکات کە هاوڕێیەتی و متمانە بەیەکتری کردنە. ئەگەر ئینسان نەتوانێت هەموو ئەو شتانەی بۆ هاوڕێ خۆشەویستەکەی ئەگێڕێتەوە بۆ ژنەکەی یان پیاوەکەی بگێڕێتەوە، ئەوا ئەو ئینسانە ئەو کەسەی خۆشناوێت. پێویستە عەشقی ڕاستەقینە لەسەر بنەمای هاوڕێیەتی

بنیاتنرابێت.

منیش فێری ناسینەوەی درۆبووم، تا ئەوڕادەیەی کە هەستئەکەم درۆ ئەتوانێت ببێتە بەشێک لە دروستکردنی ژیانی خۆشەویستی. ئایا چۆن درۆ ئەتوانێت دزەبکاتە ناو ژیانی دوو عاشقەوە؟ ئەمە ئەو پرسیارەیە کە منی ناڕەحەت کردووە. ئەگەر عەشق پابەندبێت بە هاوڕێیەتییەوە ئەوا ئینسان چ پێویستی بە درۆ کردن هەیە.

**نینار:** وایە، بەڵام ئەو جۆرە درۆیانە پێویستناکات ببەسترێتەوە بە بوونی عەشقەوە.

**ئەدۆنیس:** ئەمە جۆرێکە لە بەرگریکردن.

**نینار:** نەخێر، ئەمە جۆرێکە لە پارێزگاریکردن.

**ئەدۆنیس:** درۆکردن بێ حورمەتییە بۆ ئینسانێک کە کەسێکی تری خۆشئەوێت. بۆچی ئەبێت دوو خۆشەویست کە عومرێکیان پێکەوە بەسەربردووە درۆ لەگەڵ یەکتریدا بکەن؟ ئەبێت کەسێک ئەو پرسیارانەیان لێبکات. چونکە هەبێ و نەبێ پەیوەندی ئەوان بە جۆرێک لە جۆرەکان ناڕێکییەکی تێدایە.

**نینار:** بەلای منەوە پێموایە کە هەندێک شت هەن کە پێویست ناکات کەسەکەی بەرامبەرتی لێ ئاگاداربکەیتەوە، شتانێک کە ئینسان باش ئەکات هەر لای خۆت بیانهێڵێتەوە. ڕاستی ووتن لای کەسی بەرامبەر هەندێک جار وەک ئەوە وایە کە «ڕۆحی خۆتی پێبفرۆشیت»، چونکە ڕاستییەک بوونی نییە بەو مانایەی کە هەستی دوو کەس وەک یەک لەسەری تەبابن.

ئەمەش مانای ئەوەیە کە جۆرێک لە مەرجی کۆیلەبوون بەسەر ئەو کەسەدا ئەسەپێنیت کە بەتەواوەتی ڕاستگۆ و سەرڕاستە. ئەمەش مانای جۆرێکە لە سوکایەتیکردن بە ئازادی و هەڕەشەی سانسۆرکردن لەلایەن هەردوولاوە بەرامبەر بە یەکتری. داواکردنی ڕاستگۆی لەلایەن هەردوولاوە جۆرێکە لە خۆکردن بە حاکم یان سانسۆرچی، دانانی خۆتە لەبەردەم ئەو باڵادەستییەی کە بەجۆرێک لە جۆرەکان حوکم بەسەر شتەکاندا ئەدات. بەڵام کێ چوزانێت کە کەسی بەرامبەر چ کاردانەوەیەکی ئەبێت لەبەردەم ئەو ڕاستییەی کە تۆ لەبەردەمیدا ئەیدرکێنیت؟ بەڵام ئەو کەسەی تر کە بەدرکاندنی ئەو ڕاستییە بریندار ئەبێت «ژن بێت یان پیاو» ئەتوانێت بەوە قەرەبووی بداتەوە کە ئەمە بۆ خۆی ڕاستییە و ئەبێت وازی لێبهێنێت و بڵێت: «من لە تۆ تێئەگەم». یاخود لەوە خراپتر، بڵێت: «من تۆ ئەبەخشم». من پێموایە ئینسان ئەبێت حورمەتی کەسی بەرامبەری بگرێت، هەر لەبەر خاتری ئەویش بەهیچ شێوەیەک پێویستناکات لە سات و ناساتدا «ڕاستی» بگێڕێتەوە. ئەبێت ئینسان ئەو بوارە بەخۆی بدات کە ژیان بەڕێبکات و پارێزگاری سەربەخۆیی خۆی بکات.

بۆ من ئەوە جۆرێکە لە ناچاری کە هەمیشە پێویستبکات ڕاستی بڵێیت، چونکە هەندێک شت هەن کە ئەمەوێت هەر لای خۆم بیانهێڵمەوە، شتانێک کە تاقەتم نییە لەگەڵ بەرامبەرەکەمدا

بەشیبکەم سەربارى پێکەوە ژیانیشم لەگەڵ ئەو کەسەدا. من پێکەوەژیانێکم ئەوێت کە ئازادی خۆمی تێدا بپارێزم. گەر ئینسان هەمیشە بەدوای پاکێتی و ڕاستییەوەبێت باشترە ڕووبکاتە دین و شوو بە خودا بکات! ئەوکات ئینسان دڵنیائەبێت لەوەی کە دەستخەڕۆناکرێت! ئەوکاتەش ئینسان ڕووبەڕووی ئەو بێخەوشییە ئەبێتەوە کە خودی ڕاستی خۆیەتی! بەڵام ئەوەی پەیوەندی بە منەوەهەبێت ئەوەیە کە من ئینسانی «خەوشدار»م پێباشترە. دەنا گەر ئینسانی بێخەوش «پێرفێکت» بوونی هەبوایە ئەوا بێگومان من هەرزوو تاقەتم لێیئەچوو.

سەربارى ئەم شتانەی کە ئێستا باسمکردن من بۆ خۆم باوەڕم بە عەشق هەیە، تەنانەت عەشقێک ئەگەر کەموکورتیشی تێدابێت، بە هەموو بەرزی و نزمییەکییەوە کە هەیەتی. من باوەڕم بە عەشق هەیە کە لە هەموو شتێک بەهێزترە، لە مردن و لە منداڵ و لە ژیانیش بەهێزترە. ڕاستە ئەمە خەونی هەرزەکارێکە، بەڵام من باوەڕم وایە و ئەشمەوێت بەردەوام باوەڕم بەوەهەبێت کە ئەتوانم ئینسانێکم شێتانە خۆشبوێت - سەربارى هەموو ئەو زەحمەتیانەی کە هەیەتی، من بۆخۆم لەم جۆرە شتانە ناترسم.

**ئەدۆنیس:** بەڵام ئەگەر دوو خۆشەویست درۆ لەگەڵ یەکتریدا بکەن، کەوایە بۆچی لەگەڵ یەکتریدا ئەژین؟ باشترە جیابنەوە. من پێموایە ئەوەی درۆ لەگەڵ هەستی خۆیدا بکات ئەتوانێت درۆ لەگەڵ جەستەشیدا بکات. تەنانەت تا ئەوڕادەیەی درۆ ئەتوانێت پەیوەندی جەستەیش دروستبکات. ئەوکات ئیتر سێکسیش دەبێتە شتێکی میکانیکی.

**نینار:** دووکەس بەهۆی کۆمەڵێک هۆوە ئەتوانن پێکەوە بژین. مەبەستم ئەوەیە کە بڵێم درۆ بەشێکە لە ژیان و ئینسانیش دەبێت ئەوە بزانێت و هەندێکجاریش قبوڵیبکات. ئەوە چییە کە تۆ ئەڵێیت «درۆ لەگەڵ جەستەی خۆشیا بکات» ئەمە ڕەنگە پەیوەندی بەو شتەوە هەبێت کە لای پیاوان زۆرتر هەستیارترە وەک لەلای ژنان. پیاوان لە ڕاستیدا کەمجار لە ژنەکانیان ئەپرسن کە ئایا لەزەتیان بینیوە لەگەڵیاندا یان نا. (پێئەکەنێت) بەڵام پرسیارە سەرەکییەکەی من ئەوەبوو کە ئایا ئافرەتان چ ڕۆڵێکیان لە ژیانی تۆدا بینیوە. دیارە تەنها مەبەستم پەیوەندی سێکسی نییە، بەڵکو مەبەستم شێوە گشتییەکەیەتی.

**ئەدۆنیس:** من پێموایە هاوڕێیەتی نێوان ژن و پیاو شتێکی تەواو ئالۆزە. ئەگەر هاوڕێیەتییەک لە نێوان دوو کەسدا گوڵبگرێت و ببێتە خۆشەویستی، ئەی ئەو خۆشەویستییە چۆن ئەتوانێت دواتر ببێتەوە بە هاوڕێیەتی؟ من هاوڕێم هەبوون کە یەکتریان خۆشویستووە دواتر جیابوونەتەوە، بەڵام دواتر هەر وەک هاوڕێ ماونەتەوە. من نازانم چۆن ئەتوانن وابن. ئەم جۆرە هەڵسوکەوتکردنە من تووشی سەرسوڕمان ئەکات. ئەگەربێت و ئەو پەیوەندییە لە نێوان ئەو ژن و پیاوەدا لەسەر بناغەیەکی قوڵ و هاوڕێیەتیەکی بەهێز بنیاتنرابێت، کاتێک کە ئەو عەشقەیان کۆتای دێت، مانایوایە کە هەموو شتێک کۆتایی هاتووە.

**نیشار:** وایە، منیش هەمان بڕوای تۆم هەیە.

**ئەدۆنیس:** من دێمەوە سەر ئەو خاڵەی کە چیم سەبارەت بە درۆ ئەوت. من پێموایە کە تۆ ڕاستئەکەیت کە هەندێک جار درۆ پێویستە. ئەوەش ئەوکاتەیە کە تۆ ڕووبەڕووی ڕاستی ئەبیتەوە هەروەک ئەوەی ڕووبەڕووی مردن ببیتەوە. ئەو جۆرە ڕاستییە حاشاهەڵنەگرانە جۆرێکن لە مردن.

**نیشار:** تۆ پێتوایە پیاوێک بتوانێت تا کۆتایی ژیانی لەگەڵ هەمان ئافرەتدا بمێنێتەوە؟ پێتوایە «مۆنۆگامی» یەکژنی ئینسان لە سروشتەوەیە؟

**ئەدۆنیس:** نەخێر، من پێموایە جەستەیەک پێویستی بەچەندان جەستەی ترە.

**نیشار:** بێگومان. پیاوان بەشێوەیەکی ڕەها «پولیگام»ین فرەژنین.

**ئەدۆنیس:** پیاو؟

**نیشار:** ئا مەبەستم جۆری ئینسانە کە پیاوە.

**ئەدۆنیس:** بەهەرحاڵێک پێویستە تۆ ئەمە باشتر بسەلمێنیت.

**نیشار:** ڕەنگە ئەمە دوای پەنجا تا سەد ساڵی تر بکرێت. چونکە ئێمە ئێستا لە قۆناغێکی گۆڕانداین. ماوەیەکی زۆر ئەبات بۆ حەرامکردنی فرەژنی و نەمانی. هەموو کەس ئەوە ئەزانێت کە ئێمە پێویستمان بەچەندان شەریک هەیە لە ماوەی ژیانماندا، بەڵام چەندان ڕێگری ئەخلاقی و دینییش لەبەردەمی ئەمەدا هەیە. بەتایبەتی بۆ ئافرەتان و بەگشتیش بۆ هەمووان. ئینسان هەمیشە ڕووبەڕووی هەمان ئەم نایەکسانییە ئەبێتەوە.

ئێستا ئینسانەکان کۆتاییان بەوەهێناوە و بەزەحمەت قبوڵی فرەژنی ئەکەن. هەمووان وا پیشان ئەدەن کە گوایە بەدوای «پیاوێکی نموونەیی» یان «ژنێکی نموونەیی»دا ئەگەڕێن.

**ئەدۆنیس:** ئاخر لەبەر ئەمەیە کە من ئەڵێم درۆکردن خراپترین شتێکە کە ئینسان ئەیکات.

**نیشار:** وەکو من ئەیبینم خیانەتکردن بەشێکە لە هەموو ئەو هاوسەرێتی و پێکەوەبوونانەی کە هەیە. ئەگەر ئینسان شوی کرد یان ژنی هێنا ئەوا ئەبێت حسابی ئەوە بکات و بیر لەوەشبکاتەوە کە ئەگەری ئەوە هەیە یەکێک لەو دووانە خیانەتبکات. هەر لەبەر ئەمەشە کە من هەرگیز شووم نەکردووە. ناشمەوێت بیر لەوە بکەمەوە کە بەدرێژایی ژیانم تەنها لەگەڵ یەک پیاودا بژیم. ئەگەرچی ئەوە خەونێکی ناو قوڵایی دەروونیشمە کە وابم بەڵام ئەزانم ئەمە شتێکە مەحاڵە.

**ئەدۆنیس:** تۆ خۆت ئەخەیتە بەردەمی خەتەری ئەوەی کە زەریبەیەکی گەورەبدەیت.

**نیشار:** بەهەرحاڵ ئیتر وایە. ڕەنگە ئینسان کەسێکی خۆشبوێت و دواتریش بکەوێتە داوی

عەشقی کەسێکی ترەوە . یان ڕەنگە خۆشەویستەکەت عاشقی کەسێکی تربێت. ئەمە ئەو شتانەن کە ڕوودەدەن. بۆ تۆ پێتوایە بەهەموو شێوەیەک ئەمە حاڵەتێکی نەگۆڕە و عەشقیش بەدرێژایی عومر ئەمێنێتەوە . خۆ ئەگەر ئێمە باسی خیانەتکردنیش نەکەین بەڵام هاوسەرانی واهەن کە دوای چەند ساڵێک پێکەوەبوون عەشقیان بۆ یەکتری نامینێت. ئەگەرێکی زۆر کەمیش هەیە کە بەهەمان تین و گەرمی سەرەتا بە درێژایی عومر یەکیان خۆشبوێت.

**ئەدۆنیس:** کەوایە چارە چییە؟

**نینار:** یان ئەبێت لەگەڵ هەموو خیانەتکردنێکدا جیابیتەوە یان ئیتر ئەو کەسەت خۆشنەوێت و دووبارە شووبکەیتەوە . یاخود ئەبێت ژیان لەگەڵ ئەو کەسەدا بەریتە سەر کە چیتر خۆشتناوێت. ئینسان ئەتوانێ ژیانی خۆی لەگەڵ ئەو کەسەدا هاوتەریب بەرێتە سەر، وەک ئەڵێن هەر یەکەو بۆ خۆی و لە ژێر پەردەی هاوسەریشدا. پێموانییە ئەگەری سێهەمیش بۆ ئەمە هەبێت. ئەمە ناخۆشە، بەڵام ئیتر من ئاوا تێیئەگەم. من ئەزانم کە زۆر ئازار بەخشە جیابیتەوە، ئازارێکە کە ئەبێت تەحەمولیبکەیت، کۆتاییەکی پڕ دەردی سەریی وایە کە هەرچی باوەڕبەخۆبوونێکتە لێت ئەستێنێتەوە . ئینسان ئەیەوێت بمرێت و هەرچی شتیەتی لەدوای خۆی بەجێبێڵێت.

من ئەم جۆرە عەزابانەم چەشتووە . ئەم جۆرە عەزابانەش زۆرینەی کات ئەو کاتانە ئەیچێژیت کە مێرد منداڵیت. ئەوەش بۆخۆی خراپترە، چونکە ئینسان هێشتا کاڵفامە و ئایدیایانە سەیری عەشق و عاشقبوون ئەکات. ئەگەر ئینسان بیرۆکەی هاوسەرێتی قبوڵبێت و شوو بکات یان ژنبهێنێت ئەبێت قبوڵی مەرجەکانی هاوسەرێتی و سنوورەکانیشی بکات.

**ئەدۆنیس:** من پێموایە ئینسان ئەبێت دەستبەرداری ئەوەبێت کە هاوسەرێتی وەک دامەزراوەیەک سەیر بکات.

**نینار:** ئاوها؟

**ئەدۆنیس:** زۆر بەئاسانی ئەبێت دەستبەرداری ئەوەبێت.

**نینار:** شتێک هەیە کە ئینسان زۆر ئاسان لەبیری ئەچێت و ئەویش ئەوەیە کە ئێمە لە ئەوروپا ئەژین. ئینسان ئەتوانێت لەگەڵ کەسێکدا بژی بەبێ ئەوەی هاوسەرگیری لەگەڵ کردبێت. تەنانەت ئەتوانن منداڵیان لەگەڵ یەکیشدا هەبێت بێ ئەوەی یەکتریان خواستبێت. بەڵام بیر لەوە بکەرەوە لە وڵاتێکدا بژیت کە ئافرەت هیچ پلەیەکی نییە لەوحاڵەدا ئەو ئافرەتە کچ بوونی خۆی لەدەست ئەدات بێ ئەوەی شووی کردبێت یا دایک بێت. تەنانەت وڵاتی وا هەیە کە ئافرەتان هیچ حەقێکیان نییە، بۆ نموونە لە وڵاتە عەرەبییە ئیسلامییەکاندا. لەوێ ئەبێت شووبکەیت، تەنها هەر ئەوەندەش بەس نییە کە بە ڕێگەی دەوڵەتی شووبکەیت!

**ئەدۆنیس:** بەڵام سەرباری هەموو ئەمانەش خەڵک هەن بە بێ پەیوەندی هاوسەرگیری لەگەڵ

یەکتریدا ئەژین.

**نینار:** باشتر، بەڵام گەر بیانەوێت منداڵ دروستبکەن ئەوا ئەبێت هاوسەرگیری بکەن. دەنا منداڵەکە هیچ مافێکی نابێت.

**ئەدۆنیس:** بەڵام ئەکرێت لە ڕێگەی «سیغە» کردنەوە بکرێت وەک لەلای شیعەکان هەیە.

**نینار:** بەڵام لەو حاڵەتەدا ئەبێت هەر شیعەبیت.

**ئەدۆنیس:** وایە یاخود لایەنی کەم بەشێوەیەکی سیمبولی ببیتە شیعە لەبەر خاتری ئەو کارە. بەهەرحاڵێک دەرفەتی ئەوە هەیە.

**نینار:** وایە، بەڵام تەنها لە چوارچێوەی دیندا.

**ئەدۆنیس:** وایە، بەڵام لەو حاڵەتەشدا سنوور بەزاندن هەیە.

**نینار:** سەبارەت بە ئافرەتان تۆ هەمیشە وتووتە کە ئافرەتی «ئاسایی» ئافرەتێکی: بێ سووراو، بێ مکیاژ، بێ عەتر و شتەکانی ترە. من هەرگیز لەم جۆرە زەوقەی تۆ تێناگەم. ئایا ئافرەتی پیشکەوتوو تۆ ئەترسێنێت؟ لە ڕاستیدا من بۆ خۆم ئەوەم پێباشترە کە ئافرەت خۆی هەڵیبژێرێت مکیاژ بکات یان نا، دەرپێی شەبەکەیی و پێڵاوی پاژنە بەرز و جلی سێکسی لەبەرابێت یان جینس و پێڵاوی وەرزشی. من ئەو ئافرەتانەم خۆشئەوێن کە جەستەی خۆیان ئەرازێننەوە و خاڵ ئەکوتن و کون لەجەستەیان ئەکەن.

**ئەدۆنیس:** ئەی حەزت لەو پیاوانەیە کە مکیاژ ئەکەن؟

**نینار:** من جارێ باسی ئافرەت ئەکەم. بەڵام لە ڕاستیشدا هەر زۆر زۆرم پێجوانە کە پیاو چاوی بە کل برێژێت، پێشمواپە سێکسیتر و جوانتر ئەبن کە ئەڵقە بکەنە گوێیان.

**ئەدۆنیس:** پێستی ئافرەت زۆر جوانترە گەر وازیلیبێنیت بژی و هەناسە بدات. بۆچی ئەبێت بە شتێک سواغیبدەیت کە جوانتر نییە لە پێستەکە خۆی؟

**نینار:** ئەگەر ئینسان بەجدی قسە بکات ئەبێت جیاوازی لە نێوان دوو شتدا بکات: لە حاڵەتێکدا ئەگەر ئینسان بیەوێت لەگەڵ ئافرەتێکدا سێکس بکات کە سەرتاپا سواغدرابێت بە مکیاژێکی زۆر و کرێمی پێست و هەروەها قژی پڕ لە جیل، لەم حاڵەتەدا من پێمواپە ئەمە هیچ سەرنجڕاکیشانێک و سێکسیبوونێکی تێدا نییە. (پێئەکەنێت) بەڵام پرسیارەکەی من لەسەر ئەو پەیوەندیانەی تۆیە لەگەڵ ئافرەتاندا جیا لە پەیوەندی سێکسی؟

**ئەدۆنیس:** من لەوە تێئەگەم گەر ئافرەتیک چاوێکی سەرنج ڕاکیشی پێوەبێت ئەتوانێت بە

کۆمەڵێک شێوە سەرنجمان بەلای خۆیدا رابکێشێت، هەر لەبەرئەوەشە کە پێویستە ئەو ئافرەتە زۆر وریاتربێت لەوەی کە زۆر مکیاژی خۆی نەکات.

**نینار:** ئاوها. من بۆ خۆم حەزم لە شتی ناسروشتییە. من پێموایە کە زۆر گرنگە لە حاڵەتی وادا سروشتی نەبیت.

**ئەدۆنیس:** من لەمەدا بەهیچ شێوەیەک لەگەڵ تۆدا نیم.

**نینار:** بۆچی؟

**ئەدۆنیس:** ئەمە پەیوەندی بەسەلیقەوە هەیە. من هیچ دژی ڕەنگی سووراونیم ئەگەربێت و بەگشتی هارمۆنییەتیکی هەبێت لەگەڵ سیمادا. من ئەزانم کە تۆ حساب بۆ ئەو «ناسروشتی»یە ئەکەیت کە تۆ گوزارشتت لێکرد، بەڵام من نایکەم. من حەزم لە ئافرەتە بەبێ مکیاژ. ئەمەش لەبەرئەوەی کە پێموایە پێست ئیروتیکترین جێیەکی ئافرەتە لەکاتی نزیکبوونەوەدا لێی. من هیچ شتێکی نائاساییم لە نێوان پێستی ئافرەت و دەورووبەری ئەودا ناوێت.

**نینار:** بەڵام ئاخر بوون بە جێگای سەرنجی کەسانی تر هەر بەو شێوەیەیە بۆ پەیوەندی بەستن لەگەڵ دەوروبەردا.

**ئەدۆنیس:** من بەو ئافرەتەی کە خۆشم ئەوێت ئەڵێم: «من تۆم خۆشئەوێت وەک ئەوەی کە هەیت، بێ هیچ مکیاژێک. تۆ بۆ کێ ئەتەوێت مکیاژبکەیت؟ ئەگەر بۆ منە ئەوا ئەبێت ئەوە بزانیت کە من حەزم لێی نییە!».

**نینار:** بەڵام ئاخر ڕەنگە ئەو مکیاژ بۆ خۆی بکات! ئەی ئەگەر ئەو کاتە ئەو حەزی لە خۆی بێت کە لێوەکانی سوور بکات، ئەوکاتە تۆ ئەڵێیت چی؟

**ئەدۆنیس:** هیچ ناکەم. هیچیش ناڵێم. گەر شتەکان وابن ئەوا منیش قبوڵیان ئەکەم.

**نینار:** هەر بەڕاست.

**ئەدۆنیس:** من ئەوە ئەڵێم کە حەزم لێیەتی.

**نینار:** کەواتە تۆ بەتەواوەتی دژی ئەوە نیت کە ئافرەت مکیاژ بکات؟

**ئەدۆنیس:** نەخێر، بەهیچ شێوەیەک.

**نینار:** لەناو هەموو ئەوانەدا کە حەزیان لەوەنییە ئافرەتان مکیاژ بکەن فێمەنستی باوەڕداری وایان تیایە کە حەز ئەکەن وەک کوڕ وابن. بێگومان خەڵکانی موحافزکار و پیاوانی دینێنیشی

تیایە، کە پێیانوایە ئەبێت ئافرەتان «پاک» و «سروشتی»بن. ئەوان پێیانوایە کە ئافرەتان «لە سروشتییەوە» پاکنین و نابێت هیچ فێڵێک بەکاربهێنن چونکە بەوە توانای سەرنجڕاکێشانیان زیاد ئەکات. بەڵام کاتێکیش ئافرەت ئەبێتە دایک و پایەی کۆمەڵایەتی ئەگۆڕێت ئەو کات پیاوان کەمێک ئازادی پێئەبەخشن.

## ڕۆژێکی تر...

**نینار:** کایەیەکی گەورەی تێکستی ئیرۆتیکی عەرەبی هەیە. زۆر لەو تێکستانە لە ڕووی شێوازی نووسینەوە هێندە گرنگ نین، بەتایبەت ئەوانەی کە بە زمانێکی میللی و سادە نووسراون. ناوەڕۆکی ئەو نووسینانە هەم جێی سەرسوڕمانن و هەمیش جێی زەوقهەستانیشن. ئەو تێکستانەی کە من خوێندومنەتەوە لە نۆسەدەکانەوە دەستپێئەکات تا ئەگاتە هەزار و حەوت سەدەکان و هەزار و هەشت سەدەکان. ئەم تێکستانە لەناو کلتوری عەرەبیدا چ مانایەک ئەبەخشن؟ ئایا چیان بەخشیوە بە کۆمەڵگە؟ چۆن لەم تێکستانە حاڵیبوون و چ کاریگەریەکیشیان لەوکاتەوە تا ڕۆژی ئەمڕۆ هەبووە؟

**ئەدۆنیس:** شاعیرە عەرەبەکان زۆر لەو ئەدەبە ئێروتیکیەیان بەرهەمهێناوە. ئەو تێکستانەی کە تۆ باسیان ئەکەیت بوون بە بەشێک لە ئەدەبی میللی و پەیوەندیان بە ڕشتەی کلتورەوە نییە، بە هۆی هۆکاری ئەخلاقی و زمان ناسییەوە جێێ گومانن لای پیاوانی ئاینی. سەرباری ئەوەی ئەم تێکستانە بەدزییەوە لەلای هەندێک لە خەڵکی زۆر خوێندراونەتەوە و بۆتە کلتوری ئیرۆتیکی و سێکسی ئەوان.

ئەمە لەڕابردوودا ڕوویداوە. بەڵام ئەمڕۆ ئەدەبی ئیروتیکی بێتام بووە و هەمووان دەستیان ئەیگاتێ، بەتایبەتی بەهۆی ئەو پەیوەندییە مۆدەرنانەوەی کە هەیە. وەک ئەوەی کە من بۆیئەچم ئەو کتێبانە زۆر گرنگترن، سەیریەکەشی ئەوەیە کە زۆرینەی نووسەرەکانی ئەو تێکستانە تیۆلۆگی و ئینسانی دینیین. ئەمەش کراوەیی لایەنی ڕۆحی و عەشقێکی زۆر بۆ ژیان دۆستی پیشان ئەدات. من زۆر تەقدیری ئەم کتێبانە ئەگرم ئەگەرچی ڕۆڵێکی زۆر گەورەشیان لە ژیانی کلتوریدا نەبینیووە.

**نینار:** ئەمە هەم سەیریشە و هەم ناخۆشیشە!

**ئەدۆنیس:** پەیوەندی بە دیین و فشاری ئەخلاقییەوە هەیە.

**نینار:** ئەو شتەی کە من تووشی سەرسوڕمان ئەکات ئەوەیە کە هەموو ئەم ئەدەبە ئیروتیکییە لەسەر جەستە و لەزەتبردن لە ژیان پێکهاتووە لەگەڵ هەموو ئەو چیرۆکانەی تر کە باسی سێکسکردنی پیاو لەگەڵ ژن، ژن لەگەڵ پیاو، پیاو لەگەڵ پیاو، ژن لەگەڵ ژن ئەکات. هەروەها لەگەڵ ئەوەشدا کە چەندان شیعری ئیرۆتیکی «اباحی» تیایە، بۆ نموونە بەرهەمەکانی «عمر بن الربیعە»[3] و چەندان بەرهەمی تر. ئەوانە چیان لێهاتووە؟ بۆچی تا ئێستاش کۆمەڵگەی عەرەبی بەو

ڕادەیە کۆنەخوازە سەرباری ئەو هەموو میراتە کلتورییە؟ بۆچی لەمڕۆدا زیاد لە هەموو سەردەمەکانی تر جەستە بەو شێوەیە «حەرامکراوە»؟ باشە بۆچی ئێمە بەردەوام دیدێکی کورتبینانەمان هەیە؟ خەڵکی فەنتازیا ئەکەن، خەون ئەبینن، تەمەنا ئەکەن. هەموو ئەمانە لەناو سەری ئینسانەکاندان، بەڵام تائێستاش پێیانوایە زەحمەتە ئەو شتانە پراکتیک بکرێت. ئەمەش پەیوەندی بەو نەریتە زارەکییەوە هەیە کە کەمجار تێکستی ئێرۆتیکی ئەکرێت بە کردار؟ هەمووان باسی ئەمە ئەکەن، بەڵام کەس خۆی بۆ ئەمە تەرخان ناکات. ڕەنگە عەرەب لەو هەموو «بارگە ئێروتیکی»یە زۆرەی خۆیان بترسن؟ هەموو ئەمانە ئەشارنەوە و پەردەپۆشی ئەکەن و بەشێوەیەکی «دەرونی» لە ڕێی ئایەتەکانی قورعان و عادەتی باوەوە نەشتەرگەری ئەکەن و توڕی ئەیەن، بۆئەوەی کەس باسی ئەو حەرەمە ـ دامەزراوە نەکات، کە یارمەتیدەرێک بووە بۆ بە«ئێرۆتیک کردن»ی دنیای عەرەبی ئیسلامی. توندڕەوەکانی وڵاتانی خۆرئاوا خەیاڵی خۆیان لەمەوە ئاوەدانکردەوە و وەک شتێک، کۆیلەیەک، کەسێک سەیری ئافرەتیانکرد کە خاوەنی ویستێک نەبێت و پیاو پێویستبکات چاوی لێیانبێت.

ئایا بۆ ئەبێت خەون و فەنتازیا باشترین کەرەستەیەکبن، لەکاتێکدا دەستبەرداری ئەو حەقیقەتە ڕۆژانەییەی ببیت کە لەلایەن نەریت و فەرمانە دینییەکانەوە بەیەکجاری سنووردارکراوە؟

**ئەدۆنیس:** وەک ئەوەی من ئەیبینم ئەو دواهەمین تیوریيەی کە تۆ باستکرد زیاتر ڕێی تێئەچێت. دین جەختێکی زۆر لەسەر ژیانی تاک دائەنێت. هەر لەبەر ئەوەشە کە ئینسان لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا دوو جۆر ئاستی ژیانی هەیە. لەیەکێکیاندا تاک ژیانێکی نهێنی ئەژی و لەویادا خۆی بۆ سێکس و لەزەتبردن لە هەموو شتێک تەرخان ئەکات ـ تا ئەو جێگەیەی کە من بزانم لەزەتبردن شتێکە لە زۆرینەی کۆمەڵگاکانی تردا بەو شێوەیە نییە ـ لە ئاستەکەی تریشەوە، کە ئاستێکی گشتییە ئینسان پێبەپێی یاساکانی دیین و نەریت ئەژی. ئەوەشی کە لە مێژووی عەرەبیدا ئەیخوێنیتەوە ئەوەبووە کە پەیوەندی نێوان ژن و پیاو زۆر چڕوپڕبووە. وە تا ئێستاش هەروان. ئەکرێت پیاوێک لە پێناوی عەشقی ژنێکدا بکوژرێت، ئەتوانن لەم وڵاتەوە بۆ ئەو وڵات دوایان بکەون، لەلایەن مێردەوە ژنە بکوژرێت چونکە ئەو خاوەنی راستەقینەیەتی، تا ئەو ڕادەیەی تاڵانی کات لە هەموو ئەو شتانەشی کە هەیەتی. خەڵکی هەموو جۆرە لەزەتێک تاقیئەکەنەوە، بەڵام بەدزی و بەنهێنی، بەتایبەتی بۆئەوەی دوچاری هیچ کێشەیەک لەگەڵ دین و بە گشتیش لەگەڵ کۆمەڵگەدا نەبنەوە.

کۆمەڵگەی عەرەبی ڕوویەکی تری هەیە کە ئەویش ئیمانداریی و کۆنەخوازیی و زاڵبوونی حورمەتگرتنی نەریت و تێکستی قورئانییە. تا ئەمڕۆش خەڵکی لە کۆمەڵگای عەرەبیدا بەو دوو ڕێگەیەدا ئەڕۆن: یەکەمیان لەزەتبردنێکی شەهوانیانەی نهێنی و ئەوی تریاشیان ڕێگایەکی خۆپیشاندانی دینییە. ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کە کەسایەتی ئینسانی عەرەبی کەسایەتییەکی دووفاق بێت و لەسەر درۆ و دەلەسە دروستبووبێت. بەس نییە ئەمە؟

**نینار:** پێتوایە باش باسی ئەم مەسەلەیەت کردبێت؟

**ئەدۆنیس:** سەعات وابووە بە نۆ و هێشتاش نەگەیشتوینەتە بەشێکی باش؟

**نینار:** بەشێکمان کردووە!

**ئەدۆنیس:** دەباشە ئەوەندە بەسە!

**نینار:** هیلاکیت؟

**ئەدۆنیس:** نەخێر، ئەتەوێت بەردەوام بین؟

**نینار:** ئا ئەگەر تۆ حەزبکەیت.

**ئەدۆنیس:** بەشی دووهەم؟

**نینار:** ئا.

**ئەدۆنیس:** بیرت لە چەند بەش کردۆتەوە؟

**نینار:** دە.

**ئەدۆنیس:** ئۆی.

**نینار:** نزیکەی سەد پرسیارە لەسەر هەموو شتێک.

**ئەدۆنیس:** ئێستا لە چوار یەکی تەواوبووین؟

**نینار:** نا، ئەوەندە نییە. بەڵام لەبەر ئەوەی کە تۆ خۆت گەرموگوڕ پێچاوەتەوە و بە قیافەتێکی جوانیشەوەیت پێم باشە کە بەردەوامبین و بچینە ناو کرۆکی پرسیارەکانەوە.

**ئەدۆنیس:** بەردەوام بە!

## پەراوێزەکان:

١ـ دۆقە سپی لاوازەکە: نازناویک بووە کە دەیڤید بویی لە گەشتێکی مۆسیقی خۆیدا لە ساڵی ١٩٧٦دا بەکاریهێناوە. پێرسۆنا (کاراکتەری) دۆقە سپی لاوازەکە وەک کەسایەتی ئەرستۆکراتێکی شێت وەسفکراوە.

2- make love not war

ئەم فرەیزە وەکو شیعاری ئەوانە بەکارهات کە دژی جەنگی ڤێتنام بوون دواتر گروپی دژە جەنگی تریش بەکاریانهێناوە واتە: خۆشەویستی بکە نەک جەنگ

٣ـ عمر بن الربیعە: ٦٤٤ ـ٧١٢ شاعیرێکی عەرەبە، بە شیعرە شەهوانییەکانی بەناوبانگە.

## سەرچاوە:

Samtal medmin far, Adonis
Ninar Esber
oversattning av carl G Liungman Alhambra 2007

# گفتوگۆیەك لەگەڵ "محەمەد شوکری"

سازدانی: یاسین عەدنان
لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

سەروەختێک لەگەڵ «محەمەد شوکری» دانیشتم بۆ سازدانی ئەم گفتوگۆیە، لێی پرسیم لە کوێوە دەست پێ بکەین؟ وتم: لە سەرەتاوە، بێگومان لە (نانی ڕوت)ەوە. «محەمەد شوکری» دەستی بە پێکەنین کرد و وتی: ئاخر (نانی ڕوت) بە تەنها هەر سەرەتا نییە، بەڵکو چارەنوسیشمە. ئەزانی من دەمەوێت ئەم کتێبە بکوژم و بۆ یەکجارەکی ڕزگارم بێت لە دەستی، بەڵام چی بکەم نایەوێت بمرێت. من بەرهەم گەلێکی دیکەم نوسیوە کە لە ڕوی ئەدەبیەوە لەو گرنگترن، کەچی هەرچی هەیە و نیە تەنها باسی (نانی ڕوت) دەکەن.

*بەڕای تۆ نهێنی ئەوە لە چیدایە؟

-نهێنیەکەی لەوەدایە کە لە ئەسڵدا (نانی ڕوت) دژ بە ئەدەب نوسراوە. ئەو کتێبەم نەنوسیایە، یان شێت دەبووم یاخود خۆم دەکوشت. کە دەستم بە نوسینی (نانی ڕوت) کرد، تازە لە ژیانێکی تاقەت پڕوکێن هاتبوومە دەرێ، ژیانی بەرەڵایی و حەشیشەکێشان و قاچاخچێتی کردن. پاشان ئەو برین و گرێیانەی لە ناخمدا دروستبوون، بەهۆی پەروەردەی چەوتی باوکمەوە کە بەشێوەیەکی زۆر دڕندانە دەکەوتە گیانی من و خوشک و براکانمان و بێڕەحمانە لێی دەداین. (نانی ڕوت) بۆ من شیفا و چارەسەر بوو. بەو کتێبە توانیم هاوسەنگی دەرونی خۆم بگێڕمەوە، بەڵام زۆرێک لە خوێنەران ئەوەیان بۆ قوت نەدەچوو. ئەوان پێیان وا بوو ژیاننامە و سەربوردەی ژیان دەبێت لە کۆتایی

ژیانێکی ئەدەبی پڕ کارو بەرهەمدا بنوسرێتەوەو دوا کاری کاروانێکی پڕ شکۆی ئەدەبی بێت، بەڵام من بێ شکۆمەندی سەربوردەی ژیانی خۆم نوسیەوە، ئەمەش بەلای ئەوانەوە شتێکی سەیر بوو.

***هەروەها سەرکۆنەش دەکرا لە بەرئەوەی سێکس لەو کتێبەدا پانتاییەکی گەورەی داگیر کردووە؟**

–بێگومان ئەوان لەبەدحاڵی بوون و تێنەگەشتنەوە سەرکۆنەی ئەوە دەکەن کە من نوسیومە. سێکس لە نوسینەکانمدا بۆ وروژاندنی حەز و ئارەزووەکان نییە. من دەزگایەکم نییە بۆ وروژاندنی سێکسی. من نوسەر و مرۆڤێکم ژیانم لەسەر شەقامەکاندا گوزەراندووە و دەیانەوێت پەپولەیان بۆ وێنە بکێشم؟ ئەمە زۆر ناماقوڵە. بۆ خۆم تا ئەوپەڕی پەیوەندی سێکسی بێ حەد و حسابم کردووە، بەڵام ژیانێکی وا بەرهەمی ناڕێکی و کەلێنێکی کۆمەڵایەتی گەورەیە کە مایەی سەرکۆنەکردنە، بۆ ئەمەش نابێت هەر بە تەنها سەرکۆنەی قوربانیەکانی ئەو حاڵەتە بکەین.

***بەڵام ئەوان تۆیان خستە لیستی قوربانیەکانەوە و کەوتنە سەرکۆنەکردنت و کتێبەکەشیان یاساغ کرد..**

–کتێبەکەم لەلایەن خەڵکانێکی کۆنسێرڤاتیڤ و دەمارگیرەوە قەدەغە کرا، هەر ئەوانیش تا ئەمڕۆ دژایەتیم دەکەن. لێرەدا هەر ئەوەندەت بۆ باس دەکەم کە لە دوای بڵاوبونەوەی (نانی ڕوت) لە ساڵی ١٩٨٣، ڕێکخراوی باوکان و بەخێوکارانی خوێندکاران لە دامودەزگاکانی پەروەردە و فێرکردندا، چەند داواکاریەکیان نوسی و بەرزیان کردەوە بۆ وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی و وەزیری ناوخۆ و وەزیری ڕاگەیاندن. بێگومان دەسەڵات بۆ ڕازیکردنی ئەو ئەقڵیەتانە دەستبەجێ بڕیاری قەدەغەکردنی کتێبەکەیاندا تا ئاژاوەیەک نەقەومێت.

بەداخەوە ئەمڕۆکە لە تەواوی وڵاتانی عەرەبیدا ئەو ئەقڵیەتە ئسوڵیە دۆگمایە، بۆتە هێزی باڵا دەست و تەنانەت پەلیشی کێشاوەتە ناو زانکۆی ئەمریکی لە قاهیرە و ئەو زانکۆیە، لە ژێر فشاری ئەواندا بێ سێ و دوو دەرگای بە ڕوی ئەو بەرهەمەی مندا داخست. من پێموایە کێشەی ڕاستەقینەی (نانی ڕوت) لە سێکسدا نییە، بەڵکو لەو بوێری و جەسارەتەدایە کە ڕەخنەم لە باوکم گرتووە. باوکم نمونەیەکە بۆ هەموو باوکە خراپەکانی ناو کۆمەڵگەی عەرەبی. باوک (لانی کەم باوکی من)، نەفام و توندوتیژ و خۆسەپێنەر بوو. سەرباز بوو لە ڕیزی سوپای ئیسپانیدا، نەیدەزانی ناوی خۆی بنوسێت، پیاوێکی سیاچارەبوو کە سەختی ژیان هاڕیبووی. ئەم کەسە زۆر دڕندانە لێی دەداین. شەوێکیان زۆر بە توندی و دڕندانە ملی براکەمی باداو بەیانیەکەشی بە خاکی سپارد. ئێمە سیانزە مندال بووین، تەنها چوارمان ماوین (دوو خوشک و برایەک و چوارەمیشیان منم). هەمووشمان برینی قوڵ و شەبەقی گەورە لە جەستە و ڕۆحماندایە.

***ئەم برینانە یە دواتر ناچارتدەکەن بچێتە نەخۆشخانەی دەرونی لە (تطوان). وەک نوسەرێک چۆن سودت لەم ئەزمونە بینی؟**

-لە بەشی دووەمی ژیاننامەکەمدا باسمکردووە. بە دوو بەش لە (زمن الاخطاء)دا، باسم لە ئەزمونی ئەو حاڵەتە دەرونیەی خۆم کردووە. نەسکی یەکەمیان لێرە لە نەخۆشخانەی دەرونی لە (تەنجە) و دووەمیشیان لە (تطوان).

***بابێینەوە سەر (نانی ڕوت)، کاتێک هیچ دەزگایەک ئامادە نەبوو بۆتی چاپ بکات، ناچار بوویت لە گیرفانی خۆت ئەو کارە بکەیت. کەمەکێک باسی چۆنیەتی بڵاوبوونەوەی ئەم کتێبەمان بۆ بکە؟**

-کتێبەکەم لەسەر حسابی خۆم چاپکرد، لەبەرئەوەی کەس نەیدەویست بۆمی چاپ بکات. پێشنیارم بۆ «سوهێل ئیدریس» کرد، بەڵام گەرموگوڕنەبوو. پێیوابوو کتێبێکی ئاست نزمە و داوای لێکردم تۆزێک بیفەلسەفێنم. لەبەرئەوەی ژیاننامەیەکی ئابڕوبەرانەی بێشەرمم نوسیووە. کەچی ئێستا خۆشی ژیاننامەی خۆی دەنوسێتەوەو تیایدا باس لەوە دەکات کە باوکی مەیلی نێربازی هەبووە. بەهەرحاڵ «سوهێل ئیدریس» لەو کاتەدا نا ئومێدی کردم و من ئەو هەڵوێستەشی بە ترسنۆکی بۆ حساب دەکەم، بەڵام تەنها هەر ئەو نەبوو. هەموو پشتیان تێکردم و هەرچی دەرگا هەبوو بە ڕوی (نانی ڕوت)دا داخرا. لەبەرئەوە ناچار بووم چاپی عەرەبییەکەی لە گیرفانی خۆم بدەم، ئەویش لە ڕێی داهاتی چاپی فەرەنسی کتێبەکەوە کە دەزگاکەی «فرانسوا ماسبیرۆ» پێی هەستابوو. لەو کاتەوە خۆم بووم بە بڵاوکەرەوەی کتێبەکانم بە زمانی عەرەبی، من ئامادەم هەرچی کتێبم هەیە بیسوتێنم، نەک بیدەمە دەست دەزگایەکی چاپ و بڵاوکردنەوەی عەربی. چونکە دەزگاکانی چاپ و بڵاوکردنەوەی لای ئێمە نەک هەر ترسنۆکن، بگرە دز و خوێن مژیشن. من لە ساڵی ١٩٨١ لەسەر پاداشت و فرۆشی کتێبەکانم دەژیم، ئەگەر پشتم بە دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەکانی عەرەب ببەستایە، ئێستا لە برسا مردبووم.

***ڕاستە یەکەمجار (نانی ڕووت) چاپە ئینگلیزیەکەی بڵاوبووەوە کە نوسەری ئەمریکی «پۆڵ پۆڵز» وەریگێڕابوو، دوای ئەوە چاپە فەرەنسیەکەی کەوتە بەردەستی خوێنەران و «تاهیر بن جەلۆن» بەکاری وەرگێڕانەکەی هەستا بوو، بە فرۆشی ئەمە چاپی عەرەبییەکەت خستە بازاڕەوە، بەڵام لە سەرەتادا تۆ لە هەلومەرجێکی زۆر سەیر و سەمەرەدا ئەم تێکستەت نوسی، حەزدەکەم ئەمە بۆ خوێنەران باس بکەی؟**

-سەرەتا کە چاوم بە «پۆڵ پۆڵز» کەوت (پۆڵ پۆڵز کەسێکی دەست بڕو تەڵەکەباز بوو)، لە نێچیرێک دەگەڕا سەربوردەی ژیانی خۆی بۆ باس بکات و ئەویش بیکاتە ئینگلیزی و بڵاوی بکاتەوە. پێشتر ئەمەی لەگەڵ دوو نوسەری مەراکیشی دیکەدا کردبوو «المرابط» و «الشرادی» و دەیویست قوربانیەکانی بن بەسیان. کە بینیم لێی پرسیم: (دەتوانی ژیاننامەی خۆتمان بۆ بنوسیتەوە؟). لە وەڵامدا وتم: (بەڵێ نوسیومەتەوە، بەڵام لە ماڵەوەیە). دواتر پەنجا درهەمم بە قەرز لێوەرگرت، لەبەرئەوەی نوسین پێویستی بە خواردنەوە هەیە. بەمجۆرە ڕومکردە قاوەخانەی (ڕۆکسی) و دەستم بە نوسین کرد تا «پۆڵ پۆڵز» دواتر وەریگێڕێتە سەر زمانی ئینگلیزی. دواتر بۆم دەرکەوت «پۆڵ پۆڵز» قۆڵبڕە و کەوتە خواردنی مافەکانم وەک نوسەرێک.

***لە (نانی ڕوت) و (ڕۆژگاری هەڵەکان) و (سیماکان)دا، هەر بە تەنها ژیاننامەی خۆت نەنوسیوەتەوە، بەڵکو سەربوردەی شاری (تەنجە)شت نوسیوەتەوە. سەربوردەی شەوە ئەفسانەییەکانت باسکردووە. ئایا تا ئێستاش شەوانی شاردنەت دەدات تا بنوسیت؟**

-شەوانی کۆنی (تەنجە) زیاتر سەرسامی دەکردم. سەربارى هەموو کێشە و توندوتیژیەکانی، بەڵام هەر جوان بوو. لە ئێستادا شەوانی تەنجە بۆتە شەوی تاوانکاری و توندوتیژیەکی بێ حەد و حیساب.

***واتە ئەفسانەی (تەنجە) تەواو بوو؟**

-بۆچی ئەفسانەی فیرعەونەکان و ئەفسانەی مۆمیاکراوەکان تەواو بووە؟

***نەخێر، بەڵام ئێستا تۆ بەجۆرێک باس لە «تەنجە» دەکەیت، وەک چۆن هەندێ نوسەری بیانی باسی دەکەن و مەیلی (تەنجە)ی نێو دەوڵەتی دەکەن و ئاهی بۆ هەڵدەکێشن؟**

-جیاوازی نێوان من و ئەوانە ئەوەیە کە ئەوان لە ئێستادا بۆ سەردەمی عەیش و نۆشی جاران دەگرین و شیوەن بۆ ئەو شوێنی چێژ و ئارەزوانە دەکەن کە (تەنجە)ی نێو دەوڵەتی بۆی فەراهەم دەکردن، هەر لە سێکس و تلیاک کێشانەوە بۆ نێربازی و شتی تریش. ئەوانە بۆ (تەنجە)ی ئەفسانە ناگرین و حەسرەت کێش نین، بەڵکو بەداخن بۆ ئەو هەلومەرجەی ڕەوشی نێو دەوڵەتی لە شارەکەدا خوڵقاندبووی. ئەڵبەتە من بۆ خۆم زۆر تامەزرۆی ئەو قۆناغەنیم، لەبەر ئەوەی لەو کاتەدا من لە بەرەیەکی تر دەژیام، بەرەی ئەو کەسانەی لە ڕوی کۆمەڵایەتیەوە لە خراپترین ئاستی گوزەراندا بوون. (تەنجە)ی نێو دەوڵەتی بە هەموو خۆشی و باق و بریق و کەیف و سەفایەوە، ئەوەی لێی بەهرەمەندبوو، خەڵکانی بیانی و خواپێداوەکان بوون. بۆ نمونە کەسێکی وەک: «پۆڵ پۆڵز» چێژی لە (تەنجە) دەبینی و ئاواتەخوازی ئەوەبوو، ئەو دۆخە کۆنە هەر بەردەوام بێت و وەک ساڵانی سی و چلەکان بمێنێتەوە. لێرەوە کاتێک من ڕەخنە لە (تەنجە) دەگرم، بە باگراوندی نوسەرانی بیانیەوە ئەو کارە ناکەم، بەڵام زۆر دڵم بەم شارە دەسوتێت. من لەگەڵ ئەم شارەدا گرێبەستی هاوسەرگیریەکی کاتۆلیکی لە نێوانماندا هەیە. ڕەنگە لێک دوورکەوینەوە، بەڵام هەرگیز دەست بەرداری یەکتر نابین هەر بۆیە بەردەوام دەڵێم: (من خۆم بە نوسەرێکی مەغریبی نازانم، بەڵکو بە نوسەرێکی تەنجاوی خۆم حساب دەکەم). من نوسەرێکی گەڕۆکی مێژوی ئەم شارە و مێژونوسی هەراوزەناکانی شەوەکانیم.

***ئیتر ماندوو نەبویت لە (تەنجە) و لە شەوەکانی کە تا بێت پڕ توندوتیژی تر دەبێت؟**

-نەخێر، ئەو لە من ماندوو بووەو تاقەتی منی نەماوە، ئەگەرچی تا ئێستاش پێویستی بە منە، بەڵام من هەر پەیوەندیم گەرموگوڕ و بەتینە لەگەڵ شوێن و کارەکتەرەکانیدا. بە گشتی من بە

دەگمەن نەبێت لە (تەنجە) ناچمە دەرەوە. تەنانەت گەر سەفەریشکەم، چەند ڕۆژێکە و خێرا دێمەوە. هەستەکەم (تەنجە) دنیای منەو لە دەرەوەی ئەو ناتوانم هەناسەبدەم، ئەو ئاوەو من ماسی.

***ئەو کاتەی (تەنجە) شارێکی نێودەوڵەتی بوو، لەوێدا ئاشنایەتیت لەگەڵ هەریەک لە: «جان جێنێ، تینیسی ولیامز، «پۆڵ پۆڵز»دا پەیداکرد و یادەوەریەکاندا لەگەڵیاندا، لە کتێبێکی ئەدەبی ئاست بەرزدا بە چاپ گەیاند..**

-بیرەوەری نوسینەوە ترادسیۆنێکی باوی خۆرئاواییە. منیش بۆ خۆم دوای ئەوەی بیرەوەریەکانی «بۆرخیس و ئەلبرتۆ مۆرافیام» خوێندەوە، ئەمجۆرە ستایلەم لە نوسین دەست پێکرد. ئەو بیرەوەریانەی نوسیم، لەمڕۆدا بۆتە سەرچاوە بۆ هەموو ئەوانەی دەیانەوێت لە بارەی «تینیسی ولیامز» و «پۆڵ پۆڵز»ەوە بنوسن. ئەڵبەتە نوسینەوەی یادەوەری ئەوانە لە (تەنجە) بەردەوامێتی نوسینەوەی مێژوی (تەنجە)یە لە هەمان کاتدا. (تەنجە) هەنوکە لە ڕوی ڕۆشنبیریەوە خەفە بووەو ئەو ژیانە ئەدەبیەی سالآنی پەنجا و شەستەکانی نەماوە کە ڕاستەوخۆ بەسەرکایەی ئەدەبی شارەکانی وەک: (پاریس و نیویۆرک)دا کراوەبوو. ئەمڕۆ شتەکان زۆر گۆڕاون.

***سەربارى ئەو یادەوەریانە، لەگەڵ «محەمەد بەڕادە»ی نوسەریشدا، بڕیاری بڵاوکردنەوەی نامە گۆڕینەوەکانی نێوانتان دا کە لە ساڵی 1975 دەست پێدەکات بۆ 1994 لە دوتوێی کتێبێکدا بە ناوی (گوڵ و خۆڵەمێش). ئایا نامەکانی ناو ئەم کتێبەش هەر درێژە دان نیە بە نوسینەوەی ژیاننامەی خۆت؟**

-ڕەنگە ئەوە ڕاست بێت. ئەو نامانەم بە ڕاستگۆی و گەرموگوڕیەکی زۆرەوە نوسی. هاوکات خۆبەخۆ و بێ هیچ بەرنامەیەک دەستم دایە نوسینیان، بیرم لەوە نەدەکردەوە کە ئەم نامانە دەبنە کتێبێک و چاپدەکرێن. ڕەنگە «محەمەد بەڕادە» کاتێک هەر لە سەرەتاوە نامەکانی بۆ دەناردم، بیری لە بڵاوکردنەوەیان کردبێتەوە، بەڵام من وانەبووم. «محەمەد بەڕادە» لەو کاتەدا وەزعی باشتر و دامەزراوتر بوو، مامۆستای زانکۆ بوو، لە کاتێکدا من لە (تطوان) لە نەخۆشخانەی دەرونی کەوتبووم، لەبەرئەوە جیاوازیەکی زۆر لە نێوان نامەکانی ئەوو نامەکانی من لەم کتێبەدا هەیە. ئەوە ڕاستی بێت من پەشیمان نیم لە بڵاوکردنەوەی ئەم نامانە کە بەڵگەیە بۆ پەیوەندی هاوڕێیەتیەکی قوڵ کە ماوەی سی ساڵی خایاند.

***لە یەکێک لە نامە کۆنەکانتدا باسی ئەوە بۆ «محەمەد بەڕادە» دەکەیت کە لە ماوەی یەک هەفتەدا چەند جارێک بیرت لە خۆکوشتن کردۆتەوە، ئایا تا ئێستاش هەر لە بیر لەو مەسەلەیە دەکەیتەوە؟**

-نەخێر، بێگومان نەخێر. ڕەنگە هەندێ جار کە زیادەڕۆیی لە خواردنەوەدا دەکەم و بە باشی نانوم و توانای خواردنم نامێنێت، زۆر بە کەمی مەسەلەی خۆکوشتنم بە خەیاڵدا بێت. ساڵی ١٩٧٣ ئەو کاتەی سەرەتای وێرانبونی مێشک و دەرونم بوو، ماوەی سێ تا چوار مانگێک کە لە نەخۆشخانە مامەوە، مەسەلەی خۆکوشتن بە زۆری بە مێشکمدا دەهات. لەوێدا تراژیدیایەکی ڕاستەقینە ژیام.

یەکێک لە نەخۆشەکان لەبەرچاوما هاوڕێیەکی خۆی کوشت. من بۆیە ڕومکردە ئەو نەخۆشخانەیە، چونکە کێشەم لەگەڵ خێزان و هاوڕێ و جیهاندا هەبوو، بەڵام کاتێک بەدبەختی و چارەڕەشی کەسانی ترم بینی، مەرگەساتەکانی خۆمم بیر چووەوە. بە گشتی بەدبەختی ڕاستەقینە، لە دەستدانی هەموو هیواو و ئومێدێکە بە دنیا. خۆشبەختی من لەوەدایە کە لە ناخەوە کەسێکی گەش بینم، لەبەرئەوە بڕواناکەم من لەو کەسانەبم کە ڕۆژێک لە ڕۆژان خۆم بکوژم.

***بەڵام خۆکوشتن چییە جگە لە پەلە کردن نەبێت لە هاتنی مردن. بێگومان مردن هەردێت، شتێکی ئاساییشە کە تا بە عومر دا بچین زیاتر بیری لێ بکەینەوە؟**

–سەیر کە، من هەمیشە لەگەڵ «ئەبیکۆر» دا ئەوە دەڵێمەوە: (مادامەکی ئەژیم، باکم لە مردن نییە)، گەر مردیشم، ئەوا هەست بە هیچ ناکەم. لە ڕاستیدا ئەوەی من زەندەقم لێی چووە مەرگ نییە، بەڵکو نەخۆشکەوتنە. من مردنم لە نەخۆشکەوتن پێ چاترە. مەرگی کتوپڕ و لە ناکاویشم لە مەرگی لەسەرخۆ پێ چاترە. مرۆڤ لێرەو لە مەیخانەیەکی ئاوادا کە پێکی ڤۆدگایەکی لەبەردەمدا بێت بمرێت، بۆ خۆی و بۆ ئەوانی دیکەش چاکتر نیە؟! پاشان من تەنهام و هەر خۆمم، خێزانم نییە تا ئاگایان لێم بێت و نەخۆشکەوم. تەنانەت گەر دوچاری نەخۆشیەکی کوشندەش بوم و تەواو لە پەلوپۆکەوتم، ئەوا لەو حاڵەتەدا هیوادارم دەرزیەکم لێدەن و هەموو شتێ کۆتایی بێت، بەڵام ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنێ کە من دڵگرانم لەوەی دوای ئەم هەموو تەمەنە بێ خێزانم. زۆرێک لە هاوڕێکانم ژنەکانیان ڕەوانەی شێتخانەکانیان کردن، لانی کەم من ژیانم لە ئارامی و هێمنیەکی تەواودا دەگوزەرێنم.

***بەڵام خۆ هاوسەرگیری هەر بە تەنها ژن نییە، بەڵکو منداڵیشە. هەست بە پەشیمانی ناکەیت کە منداڵت نییە؟**

–"ماجیدە»ی کچی دراوسێکەم لەم باڵەخانەیەدا کچمە، منداڵانی دراوسێکانم هەموویان بە منداڵی خۆم دەزانم.

***ئەی خوشکەزاو برازاکانت؟**

–ئەوانە پەیوەندیم پێیانەوە نییە. هەموویان دوای بڵاوبونەوەی (نانی ڕوت) پەیوەندیان لەگەڵ بڕیم. دایکم تەنها کەسێک بوو پەیوەندی لەگەڵ نەبڕیم. کاتێک هەواڵی کتێبەکەیان دایێ، پێی وتن: (ئەوە شتی خۆیەتی، محەمەدی کوڕم باش ئەزانێت چی دەکات)، بەڵام خوشک و براکانم هەموویان پەیوەندیان لەگەڵ بڕیم. ئەوان ئێستا بۆم لە کەمیندان، چاوەڕێ مردنم دەکەن تا میراتیەکەم بەرن، سەلاجە و شتە هیچ و بێنرخەکانی دیکە بەرن، بەڵام دەزانم چۆن سەروەتەکەم دەپارێزم و ناهێڵم دەستیان پێی بگات. بەر لەوە بمرم، دوژمنەکانم دەکوژم.

***بۆچی دوژمنی زۆرت هەیە؟**

-پێشتر خەڵک لە هاورێ دەگرا و نەیدەدۆزیەوە، منیش بۆ خۆم لە دوژمن دەگەڕام و چنگم نەدەکەوت. بەڵام ئێستا و دوای ئەوەی سەرکەوتنم بە دەست هێنا و بارودۆخی ئابوریشم باشتر بوو، خەریکە دوژمنان سەرەردێنن، دواهەمینیان «ئیدریس خوری»یە کە بۆم دەرکەوت هەرگیز هاورێم نەبووە. گرێی سەرەکی ئەو پیاوە نێوبانگ و شۆرەتە، بەڵام من چی بۆ بکەم تا ناوبانگ دەر بکات؟ ئەو کەسێکی بوغزن و خوێڕیە و بەم دواییانەش ئەوەندە توندە لەگەڵمدا تێی ناگەم. من بەو و بە نمونە گەلێکی وەک ئەو هەڵخەڵەتام. بە دۆست و هاورێی ڕاستەقینەم دەزانین، بەڵام بەو ڕک و بوغزەیان توشی شۆکیان کردم. من لە حەسودی و ئیرەی بردن تێدەگەم و قبوڵیشی دەکەم، بەڵام ڕک و کینەم پێ قبوڵ ناکرێت.

***ئەی بۆ خۆت قەد ڕقت لە کەس هەڵگرتووە؟ بۆ نمونە لە کەسێکی وەک باوکت؟**

-باوکم لەبەرچاوی خۆمدا بە زەبر و توندوتیژیەکی زۆر نا مرۆڤانە ملی براکەمی شکاند و کوشتی، بەیانی ئەو ڕۆژەش بە خاکی سپارد. ڕەنگە لە کاتی خۆیدا ڕقم لێی هەڵگرتبێ، بەڵام دواتر حاڵی بووم کەسێکی وەک ئەو بەدبەخت و نیوەشێت، کە ئەقڵی مشکێکی هەبوو، چی لێ چاوەڕوان دەکەیت؟

لە حاڵی تێگەیشتم، بەڵام لێی نەبورام. ئەبێت ببمە خوا تا لێی ببورم. لە دوا ڕۆژەکانی ژیانیدا و چەند ڕۆژێک بەر لە مردنی، چوم سەرێکی دایکم بدەم، نەک بۆ لای ئەو بچم، هەر چەند نەخۆشی سەر جێگاش بوو. لەو کاتەدا سەرنجمدا دەگری، لەگەڵ ئەوەشدا کاتێک مرد هەستم بە هیچ نەکرد، وەک ئەوەی ئەوەی مرد باوکی من نەبوو بێت.

***ڕەنگە مەرگ هاوتای لە دەستدان و بیرکردن بێت، بەڵام خۆشەویستیش هەستێکی وامان پێدەبەخشێت. تۆ قەد بیری هیچ ژنێکت نەکردووە و تاسەی بکەیت؟**

-من کاتی خۆی دامەزراونەبووم، ئەو ژنانەشی ناسیمن وەک خۆم وا بوون، لەبەرئەوە هیچ لایەکمان لایەقی ئەوە نەبوین خۆشەویستی بکەین و بە تاسەی یەکتریەوە بین.

***من مەبەستم ئەوەیە، ڕویداوە کەسێکت خۆش ویستبێت؟**

-من ئیرۆتیزم دەزانم، هەرچی خۆشەویستی ئەفلاتۆنیشە ئەوا من بێئاگام لێی. من بە خۆشەویستی ئاشنانیم و نایزانم.

***لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەندی تایبەتی و گەرموگوڕت لەگەڵ چەند ژنێکدا هەبووە؟**

-هەندێ ژن هەبوون زیاتر ئارەزووم دەکردن. حەزمدەکرد بەردەوام لە پەیوەندی سێکسیدا بم لەگەڵیاندا، بەڵام پەیوەندیەکان بڕیان نە دەکرد، یان لەبەر ئەوەی خیانەتیان دەکرد یاخود

کەسوکارەکانیان ڕازی نەدەبوون. جارێکیان خەریک بوو مامۆستایەک بێنم، هیچ پەیوەندیەکی جەستەیم لەگەڵیدا نەبوو. چومە داوای، بەڵام باوکی کە پرسیاری کردبوو ڕازی نەبوو بە بیانوی ئەوەی من تەنها کەسێکی ویڵگەرد و تلیاک خۆرم. سەیر ئەوەیە دواتر شەوێکیان من کچەکەیم لە (نایت — کڵەپێکدا) بینیەوە و لەگەڵمدا دەستی کرد بە تلیاک کێشان. کچێکی تر هەبوو دەمویست بیهێنم، بەڵام خیانەتی لەگەڵ کردم، ناوی «ڕەشیدە» بوو. ماوەی پانزە ساڵ لەگەڵمدا دەنوست و پەیوەندی سێکسیمان هەبوو. دواتر لە شاری (الرباط) و لە وێستگەیەکی شەمەندۆفێردا بینیمەوە، لەوپەڕی پیسی و چڵکنیدا بوو. کە بینیمی وتی: (ئەبینی چیم لێهاتووە؟ ئەگەر کاتی خۆی شوم بە تۆ بکردایە، حاڵم بەم ڕۆژە نەدەگەیشت). منیش پێم وت: (گەر بمهێنایتایە، ئێستا هەردووکمان ئاوا بووین)، بیست درهەمم کردە دەستی و ڕۆشتم. هەندێکی تر هەبوون خیانەتیان لێکردم و دوای بیست ساڵ هاتنەوەو داوایان دەکرد لەگەڵم بژین، بەڵام دەرمکردن تا ئیعتیبار بۆ خۆم بهێنمەوە کە کاتی خۆی بریندار کرابووم. ئەوانە زۆر بەیان سۆزانی بون و قیتارەکە جێی هێشتبون و گەیشتبونە حاڵەتی نا ئومێدی. دواجار کچێکی تر هەبوو ناوی «ڤێرجینی» بوو، خەڵکی بەلجیکا بوو، پانزە ساڵ بەر لە ئێستا ناسیم. خوێندکارێکی تەمەن هەژدە ساڵ بوو. ئەم کچە عاشقم بوو، دەیویست شوم پێبکات، بەڵام من ڕازی نەبووم. لێرە (مەبەستی شاری تەنجەیە)، هەندێ هیچ و پوچ بە کەسێکی بێئەخلاقم دەزانن، بەڵام من ڕێم بە خۆم نەدا ئەو کچە جوان و زیرەکە هەڵخەڵەتێنم کە خۆشی دەویستم. من داوام لێکرد وازم لێبێنێت و بگەڕێتەوە ماڵەوە.

***ئەمێستا کاک «محەمەد» دەتوانیت لەگەڵ «پاپلۆ نیرۆدا»دا بڵێت: (ئەشهەد و ژیانی خۆم ژیام). تۆ وەکی تێکۆشەر و شۆڕشگێڕێک ژیای کە ژیانی بەسەر زیاد لە بەرەیەکدا و بەسەر زیاد لە نادیارێکدا کردبووەوە؟**

—من شۆڕشگێڕ نیم و هەرگیز شۆڕشگێڕیش نەبووم (چ وەک مرۆڤ و چ وەک نوسەر)، من کەسێکی یاخیم. لە نێوان ئەم دوانەشدا جیاوازیەکی گەورە هەیە. شۆڕشگێڕ سەروەختێک ئامانجەکانی بەدی دێنێت، ئەوا دەگاتە ئەو لوتکە سارد و سڕە، بەڵام کەسی یاخی بوو بەبێ وەستان لە شۆڕشی بەردەوامدا دەژی و شۆڕشی بەردەوام ئەزمون دەکات. من بۆ خۆم تا ئەمڕۆش لەسەر شۆڕشگێڕێتی بەردەوامم.

**سەرچاوە:**

ماڵپەڕ (جهە الشعر) . ٢٠٠٥/١٠/١٤.

**-پانۆرامای ژیانی فرانز کافکا**

له عەرەبییەوە: لاس

**-کافکا و پۆست مۆدێرنە**

جۆن لیشته

له عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد

**-کافکا له بەستێندا**

محمد قاسم زاده

له فارسییەوە: کاوه گوڵکار

**-میلان کۆندێرا له بارەی کافکاوه دەنووسێت**

له عەرەبییەوە: ڕەووف بێگەرد

**- ك وەکو کافکا**

له فارسییەوە: ئیسماعیل ئیسماعیل زادە

**-بلۆم فیلدی ڕەبەن**

له فارسییەوە:

ڕەووف بێگەرد و مەنسوور تەیفوری

**-کافکا.. ئەو یەهودییەی دونیا بە ڕەش ڕەنگ ئەکا!!**

وسام الدويك

له عەرەبییەوە: سەروەر عومەر

**-نامه بۆ میلنا**

له فارسییەوە: ڕەووف بێگەرد

**-کافکا و هاوڕێکانی**

ڕەبیع جابر

له عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

# پانۆرامای ژیانی فرانز کافکا

## -کرۆنۆلۆژیا-

لە عەرەبییەوە: لاس

- ١٨٨٣/ ٣ تەموز: لەدایک بوونی فرانز کافکا لە پراگ. باوکی هێرمان کافکای بازرگانە. یولی لوڤی دایکیەتی. خوشکەکانی ئیلی ١٨٨٩ فالی ١٨٩٠ ئۆتلا ١٨٩٢.
- ١٨٨٩-١٨٩٣/ خوێندنی سەرەتایی لە خوێندنگەیەکی ئەڵەمانیدا.
- ١٨٩٣-١٩٠١/ قۆناغی ئامادەیی لە خوێندنگەیەکی ئەڵمانی زمان لە پراگ.
- ١٨٩٧/ مشتومڕ لەسەر سوسیالیزم لەگەڵ هاوڕێکانیدا.
- ١٩٠١-١٩٠٦/ لە زانکۆیەکی ئەڵەمانی لە پراگ دەخوێنێت. ماوەی ساڵێک ئەدەبی ئەڵەمانی و پاشان یاسا دەخوێنێت.
- ١٩٠٠-١٩٠٢/ بەسەربردنی پشوی هاویندان لای سیگفرید لوفی خاڵی کە لە گوند پزیشک بوو. یەکەمین یەکتربینین لەگەڵ ماکس برود لە ساڵی ١٩٠٢.
- ١٩٠٤-١٩٠٥/ وەسفی خەبات و تێکۆشان دەنوسێت (پەنجا لاپەڕەیەک دەبێت).
- ١٩٠٥/ یەکەمین پەیوەندی خۆشەویستی لە زستانی ئەو ساڵەدا، دیدار و یەکتر بینینی بەردەوام لەگەڵ ئۆسکار باوم، فلیکس فلتش و ماکس برود.
- ١٩٠٦/ لە مانگی حوزەیراندا بڕوانامەی دکتۆرا لە یاسادا وەردەگرێت. لە ١٩٠٦/١٠/١ تا ١٩٠٧/١٠/١ خەریکی مەشقی کاروباری یاسایی دەبێت، سەرەتا لە دادگای کەتن و پاشان لە دادگای مەدەنی لە پراگ.



- ١٩٠٧/ ئامادەکاریەکانی زەماوەند لە گوند دەنوسێت (نزیکەی سی لاپەڕەیەک دەبێت). لە تشرینی یەکەمی ئەو ساڵەدا لە دەزگایەکی گشتیدا دەست بەکار دەبێت.
- ١٩٠٨/ بۆ یەکەمجار هەشت پارچە پەخشان لە گۆڤارێکدا بڵاودەکاتەوە. لە تەموزدا لە دەزگای (بیمەی سەلامەتی کرێکاراندا) کار دەکات و بەرپرس بوو لە مەزەندەکردنی قەرەبوکردنەوەی ئەو کرێکارانەی لە کاتی کارکردندا برینداریان دوچاری ڕوداوێک دەبن.. دواتر ماکس برود لە نوسینێکیدا باس لەوە دەکات کە جارێکیان کافکا بە سەرسامیەوە پێی وتووە: (ئەو خەڵکانە چەند سادە و خاکین! دێن بۆ لامان و دەپاڕێنەوە. لە بری ئەوەی پەلاماری دەزگاکە بدەن و هەموو شتێک تێک و پێک بدەن، دێن و دەپاڕێنەوە). ئەم دەزگایە ناو بە ناو کافکای دەنارده کارگەکان بۆ پشکنینیان. لە ناو نوسەرانی ئەڵمانی سەردەمی خۆیدا، کافکا تەنها نوسەرێک بوو، دیدگایەکی تایبەت و دیاریکراوی دەرهەق بە هەلومەرجی کارگەکان و بارودۆخی ئەو کرێکارانە هەبوو کە کاریان تێدا دەکرد. کافکا سەروەختی خانەنشین بونی لە تەموزی ساڵی ١٩٢٢، لەو دەزگایەدا کاری کردووە.
- ١٩٠٩/ لە سەرەتای هاویندا دەست بە نوسینی ڕۆژانەی ژیانی دەکات، لە ئەیلولدا بۆ پشو دەچێتە باکوری ئیتاڵیا.
- ١٩١٠/ سەردانی کۆڕو کۆبوونەوە جەماوەریەکانی پارتە سۆسیالیستیەکان دەکات لە پراگ. لە تشرینی یەکەمدا دەچێتە پاریس و لە کانونی یەکەمدا سەردانی بەرلین دەکات.

- ١٩١١/ بۆ پشوو دەچێتە باکوری ئیتاڵیا. سەردانی زیوریخ و پاریس دەکات. ماوەیەک لە نەخۆشخانەیەکی نزیک شاری زیوریخ دەمێنێتەوە. لە موڵکداری کارگەیەکدا دەبێتە شەریکی زاواکەی.

- ١٩١٢/ سەرەتای ئەمساڵە یەکەمین ڕەشنوسی ڕۆمانی ئەمریکا دەنوسێت. لە مانگی تەموزدا سەردانی ڤایمارو لایبزیک دەکات. یەکەمین کتێبی تێڕامانەکان ئامادە دەکات بۆ چاپ کە لە کانونی یەکەمی ئەو ساڵەدا بڵاودەبێتەوە. یەکەمین دیدار لەگەڵ فیلیس باوەر. لە ئەیلولدا چیرۆکی حوکم دەنوسێت. لە ئەیلولەوە تا کانونی دووەمی ١٩١٣، حەوت نەسکی یەکەم لە ڕۆمانی ئەمریکا دەنوسێت. لە تشرینی دووەم تا کانونی یەکەمی ١٩١٢، چیرۆکی بەدگۆڕان تەواو دەکات. لە کانونی یەکەمدا بۆ یەکەمجار لە ئێوارە کۆڕێکی ئەدەبیدا لە پراگ بەشداری دەکات و چیرۆکی حوکم دەخوێنێتەوە. سەرقاڵی بەهۆی کاروباری ڕۆژانەی کارگەوە.

- ١٩١٣/ سێ جار دەچێتە بەرلین بۆ سەردانی فیلیس پاوەر. لە نیساندا لە نزیک پراگ بەکاری باخ و باخاتەوە خەریک دەبێت. لە ئایاردا نەسکی یەکەمی ڕۆمانی ئەمریکا بڵاودەکاتەوە، بە ناوی (الوقاد). لە مانگی حوزەیراندا چیرۆکی حوکم لە گۆڤارێکدا بڵاودەکاتەوە. لە ئەیلول سەردانی ڤییەنناو بوندوقیە و ڕیڤا دەکات. لەگەڵ کچێکی سویسریدا پەیوەندی دەبەستێت. نامە گۆڕینەوەیەکی چڕ و پڕ لەگەڵ فیلیس پاوەر.

- ١٩١٤/ لە یەکی حوزەیراندا فیلیس پاوەر مارە دەکات. دوانزەی تەموز جیادەبنەوە. بۆ پشوو دەچێتە کەنارەکانی ڕوباری بەلتیق. لە ئابدا بۆ یەکەمجار ژورێکی تایبەت بەخۆی لە پراگ بەکرێ دەگرێت. دەست پێکردنی جەنگی جیهانی یەکەم. لە سەرەتای مانگی ئابەوە تا کۆتایی ساڵ، بەشی زۆری ڕۆمانی دادگا دەنوسێت. تشرینی یەکەم چیرۆکی ئۆردوگای سزا دەنوسێت. دوانەسکی ڕۆمانی ئەمریکا تەواو دەکات. چیرۆکی خۆشەویستی لەگەڵ گریتی بلۆخ.

- ١٩١٥/ کانونی دووەم، دیدار لەگەڵ فیلیس پاوەر. سەردانی هەنگاریا دەکات. تشرینی دووەم، چاپکردنی چیرۆکی بەدگۆڕان.

- ١٩١٦/ سەرلەنوێ پەیوەندیەکی کۆنکرێتی لەگەڵ فیلیس پاوەر. لە تەموزدا دە ڕۆژ پێکەوە دەچنە شوێنێک بۆ پشوو. چیرۆکی حوکم لە کتێبێکی سەربەخۆدا چاپ دەکرێت. تشرینی دووەم، دووەم ئێوارە کۆڕی ئەدەبی لە منشن و خوێندنەوەی ئۆردوگای سزا. نوسینی چەند چیرۆکێک لەوانە: پزیشکی لادێ.

- ١٩١٧/ تەواوکردنی چیرۆکی پزیشکی لادێ. تەموز، بۆ دووەمجار فیلیس پاوەر نیشانە دەکات. ئەیلول، دڵنیابوون لەوەی دوچاری نەخۆشی سیل بووە. مۆڵەت لە شوێنی کارەکەی وەردەگرێت و لای ئۆتلای خۆشکی لە لادێ دەمێنێتەوە. کانونی یەکەم، بۆ دووەم جار لە فیلیس پاوەر جیا دەبێتەوە.

- ١٩١٨ لە لادێ دەست بە خوێندنەوەی کیرکەگۆرد دەکات. لە هاویندا دەگەڕێتەوە پراگ. تشرینی دووەم، لە گوندی شیلیزن ئاشنایەتی لەگەڵ کچێکدا پەیدا دەکات، بە ناوی یولی فۆرتیسک.

– ۱۹۱۹/ هەر لە لادێیە. لە بەهاردا دێتەوە بۆ پراگ. بڵاوبونەوەی چیرۆکی ئۆردوگای سزا. یولی فورتیسک نیشانە دەکات. تشرینی دووەم، نامەیەک بۆ باوک دەنوسێت.

– ۱۹۲۰/ نیسان، بە هۆی نەخۆشیەوە مۆڵەت وەردەگرێت و لە میران پشودەدات. لەگەڵ میلینیا دەست بە نامە گۆڕینەوە دەکات. ئایار، کۆمەڵە چیرۆکی پزیشکی لادێ بڵاودەکاتەوە. لە هاوین و پایزدا دەگەڕێتەوە سەر کار لە پراگ. چەندین چیرۆک دەنوسێت، لەوانە: (بوزایدۆن، لە شەودا، دەربارەی پرسی یاساکان). لە کانونی یەکەمەوە دەچێتەوە لادێ.

– ۱۹۲۱/ لە پایزدا دەگەڕێتەوە پراگ. چیرۆکی ئێش و ئازارەکانی دەنوسێت. ڕۆژانەکانی ژیانی دەداتە دەست میلینا.

– ۱۹۲۲/ شوبات، لەلادێ دەبێت و پاشان دەچێتە پراگ. لە کۆتایی مانگی حوزەیرانەوە تا ناوەڕاستی ئەیلول لە لادێ لای خوشکێکی دەبێت. کانونی دووەم تا ئەیلول ڕۆمانی کۆشک دەنوسێت. لە بەهاردا چیرۆکی هونەرمەندی برسێتی دەنوسێ. لە هاویندا سووسەی سەگێک دەنوسێت. لە یەکی تەموزی ئەو ساڵەدا خانەنشین دەبێت.

– ۱۹۲۳/ پراگ. تەموز، لە کەنارەکانی دەریای بەڵتیقدا ئاشنایەتی لەگەڵ خاتوو دورا دیامانتدا پەیدا دەکات و لە ئەیلولی ئەو ساڵەوە لە بەرلین لەگەڵیدا دەژی. تشرینی یەکەم، چیرۆکی ژنێکی گچکە دەنوسێت. لە زستان، چیرۆکی بینا دەنوسێت. کۆمەڵە چیرۆکی هونەرمەندی برسێتی دەداتە چاپخانە.

– ۱۹۲٤/ بەرلین. مارت، گەڕانەوە بۆ پراگ. چیرۆکی جۆزفین دەنوسێت. سەرەتای نیسان لە پراگ دەڕوات. لەگەڵ دورا دیامانت لە نەخۆشخانەیەکی نزیک شاری ڤییەننا، لە سێی حوزەیرانی ئەو ساڵە و لە تەمەنی چل ساڵیدا کۆچی دوایی دەکات. ڕۆژی یانزەی حوزەیران لە پراگ بەخاک دەسپێردرێت. هاوینی ئەو ساڵە کۆمەڵە چیرۆکی هونەرمەندی برسێتی چاپ و بڵاودەکرێتەوە.

## سەرچاوە:

فرانز كافكا: الاثار الكاملة، المجلد السادس (الرسائل)، الجزء الاول – رسالة الى الوالد – ترجمها عن الالمان: ابراهيم وطفي، الطبعه الاولى، ١٩٩٥.

# کافکا و پۆست مۆدێرنە

جۆن لیشتە
لە عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد

جیاوازی و دەگمەنیی کافکا، لەوێوە هەڵقوڵاوە کە نووسینەکانی و ئەزموونی ژیانی، تا رادەیەکی زۆر، بەنێویەکداچوون. کافکا لە ساڵی ١٨٨٣ لە خێزانێکی جوولەکە لە پراگ لەدایک بووە، کوڕی پیاوێکی خاوەنکاری سەرکەوتوو بووە . ئەگەرچی دایک و باوکی کافکا لە گوندە ڕەسەنەکەی خۆیاندا بەزمانی چیکی قسەیان دەکرد، بەڵام کۆششێکی زۆریان کرد تا خوێندنێکی چاک بۆ کوڕەکەیان دەستەبەر بکەن و بەشێوەیەکی تایبەتیش بەباشی فێری زمانی ئەڵمانی بێت و بتوانێت بەجوانی قسەی پێبکات و بەڕەوانی پێی بنووسێت. هەروەها باوکی دەیویست کوڕەکەی لە یەهودییەتی مێژووی خێزانەکەیان ئاگادار بێت و لەبەرچاوی بگرێت، بەڵام دواتر ئەمە بوو بە فاکتەری ناکۆکیی نێوان کافکا و باوکی، چونکە کافکا تێڕوانینێکی تەواو جیاوازی هەبوو دەربارەی یەهودیەت، ئەمە بەتایبەتی لەو نامەیەدا دەردەکەوێت کە کافکا لە نۆڤەمبەری ساڵی ١٩١٩دا بۆ باوکی نووسیوە .

کافکا لە ساڵی ١٨٩٣ تا ساڵی ١٩٠١ لە قوتابخانەی ناوەندیی ئەڵمانی خوێندوویەتی و پاشان لە زانکۆی کارل فردیناند یاساو فەلسەفەی تەشریعی خوێندووە، لە ساڵی ١٩٠٦یشدا بڕوانامەی دکتۆرای لە یاسادا بەدەست هێناوە . لەساڵی ١٩٠٢ بۆ یەکەمجار چاوی کەوت بە ڕەخنەگرو ڕۆماننوس (ماکس برۆد) کە رۆڵێکی زۆری هەبوو لە ناساندنی کافکا بەناوەندی ئەدەبیی پراگ. لە ساڵی ١٩٠٧ لە کۆمپانیای تەئمینی ئیتالی کاری کردووەو لە ساڵی ١٩٠٨ لە کۆمپانیای تەئمینی رووداوەکانی کرێکاران کاری کرد، تا ساڵی ١٩٢٢ لەم کارەیدا بەردەوام بوو کە هەر لەو ساڵەدا خانەنشین کرا

بەهۆی تێکچوونی باری تەندروستیی، کۆمپانیاکە مۆڵەتی کراوەی نەخۆشیی پێبەخشی تا کاتێکی زیاتری بۆ بڕەخسێت بۆ نووسین.

لە ساڵی ١٩٠٩دا یەکەم چیرۆکی کافکا لەرۆژنامەیەکی پراگدا بڵاوکرایەوە، دواتر ماکس برۆد چەند بەشێکی لە رۆمانی (خۆئامادەکردنی ئاهەنگی هاوسەرگیری لە لادێدا)ی خوێندەوە. لە ساڵی ١٩١٠ەوە دەستی کردووە بەنووسینی یاداشتەکانی. لە ساڵی ١٩١٢ پەیوەندی لەگەڵ خاتوو فیلیس پاوەر دەبەستێت کە دووجار مارەی دەبڕێت و چەندین نامەی درێژی بۆ دەنووسێت. هەروەها چەندین نامەی بۆ وەرگێڕی چیرۆکەکانی، خاتوو ملینا جیسنکای چیکی، نووسیوە. لە ساڵی ١٩١٤دا بەشێکی لە رۆمانی (دادگاییکردن)ی بۆ ماکس برۆد خوێندەوە. لە ساڵی ١٩١٨ دوای ساڵێک لە دەستنیشانکردنی تووشبوونی بەنەخۆشیی سیل، جۆلیا ۆوریسکی خواست. لە زستانی ساڵی ١٩٢٠-١٩٢١ کافکا ماکس برۆدی ئاگادار کردەوە کە لەپاش مردنی هەموو بەرهەمەکانی بسووتێنێت، پاشان لە نامەیەکدا بۆ جاری دووەم ئەو داوایەی رووبەڕووی ماکس برۆد کردەوە. کافکا لە ساڵی ١٩٢٤دا بە نەخۆشیی سیل کۆچی دوایی کرد پاش ئەوەی لە بەرلین لەگەڵ کچە خوێندکارێکی یەهودیی پۆڵەندیدا بەناوی دۆرا دایمانت ماوەیەکی ژیانی بەسەر برد.

کاریگەریی کافکا، لانیکەم لە دوو گۆشەوە، کاریگەرییەکی قووڵ بوو. یەکەم: نووسینەکانی لە ژێیەکی هەستیاری ژیان دەدات، ئەو ژیانەی کە خەڵکی لە کۆمەڵگاکانی پیشەسازیی نوێدا بەسەری دەبەن. نەبوونگەرایی یان نەهلیزم (العدمیة) لە کۆمەڵگایەکدا باوەڕی بە خوا نییە، ئەقڵانییەتێکی لەرادەبەدەر بۆ هەژموونی بیرۆکراتی کە هەموو بێتاوانێک دەخاتە داوەوەو دەیخنکێنێت، کۆتایی هەموو نەزعە ئایدیالیزمەکان، ئەمانە ئەو بابەتانە بوون کە کافکا بۆ کارەکانی نەخشەی بۆ کێشابوون، لە کارەکانی کافکادا مانایەکی مەجازی دەبینین دەربارەی کۆمەڵگایەک بەبێ هیچ ئامانجێک ژیان دەگوزەرێنێت. بەمجۆرە (جۆزێف.ک) لە رۆمانی (دادگاییکردن)دا نازانێت بەچ تاوانێک گیراوە، کەسێتیی (ک) لە رۆمانی (قەڵا)دا ناتوانێت بچێتە نێو قەڵاکەوەو ناشزانێت بۆچی. لەیەکێک لە ئاستەکاندا دەتوانین کافکا بە دۆزەرەوەی مەترسیی پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و دەروونیەکان بژمێرین. کافکا سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەستهێنا لە خولقاندنی جیهانێک هەرگیز وەسفی ناکات و سیما جیاوازەکانی دەرناخات، بەڵکو تەنها دەیخاتە بەرچاو. ئەو خوێنەرانەی لە بەرهەمەکانی کافکادا بۆ پەیامێک دەربارەی مۆدێرنە دەگەڕێن، دەیدۆزنەوە، چونکە ئیحای بوونی پەیام یەکێکە لە سیما بنچینەییەکانی ستراتیژیەتی نووسینی کافکا.

نامۆیی و لوغزو تەمومژ لە سیما دیارەکانی کارەکانی کافکان، لە نامۆگەرایی کافکادا هەر خوێنەرێک شتێک لەخۆیدا دەبینێت، دنیای کافکایی واتە تاریکی و لوغزو تەمەمژو لێڵی، لە رۆمانی (دادگاییکردن)دا یاسا لەبری ئەوەی کێشەکان روون و چارەسەر بکات، لێڵترو تەمەمژتری دەکات، لەناو یاسادا خاڵێکی نابینا و نادیدە هەیە، کافکا ئەو خاڵە بەرجەستە دەکات، چونکە یاسا ناتوانێت بەتەواوی وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە کێ لەناو یاسادایەو کێ لە دەرەوەی یاسادایە.

یاسا ناتوانێت دان بە سنوورەکانی خۆیدا بنێت و خۆی وانیشان دەدات کە خاوەنی هێزو نفوزێکی رەهایە.

گۆشەی دووەم (سەبارەت بە کاریگەریی کافکا) بریتییە لەوەی کافکاو کارەکانی دیدێکی تیژبین پێشکەش دەکەن بۆ ئەو فۆرمەی کە نووسەر لەسەدەی بیستەمدا دەیبێت. ژیانی کافکا لە نووسین و لەپێناوی نووسیندا —ئەو ژیانەی لە یاداشتەکانیدا ئاشکرای دەکات- پرسیارێک دەوروژێنێت دەربارەی ئەو مانایەی کە مرۆڤ ژیانی خۆی بۆ هونەر تەرخان بکات یان بەشێوەیەکی تایبەتی خۆی بۆ نووسین لەسەدەی بیستەمدا تەرخان بکات. بۆچی زەحمەتە وەڵامی ئەم پرسیارە بدرێتەوە؟ بۆچی ناکرێت بەسادەیی هەندێ کەس پیشەی نووسین و «نووسەر» بۆ خۆیان هەڵبژێرن؟ وەک چۆن هەندێ کەس بۆ دادوەر یان بۆ پزیشک باشن و ئەو کارە لەژیانی خۆیاندا هەڵدەبژێرن؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە ئەو بابەتە دەگرێتەوە کە نووسەر هەست بەچی دەکات بەحوکمی ئەوەی بووە بەنووسەر لەسەدەی بیستەمدا؟ ئەگەر ئەو نوسەرە بەشێوە تەقلیدییەکانی ئەمڕۆی نووسینی ئەدەبیی، بۆ نموونە رۆمانی پۆلیسی، رازی بێت، ئەوا لێرەدا هیچ گرفتێک نییە، دەرگاکانی رۆژنامەگەری و نووسین هەمیشە کراوەن بۆی. بەڵام سەبارەت بە کافکا ئەمە بەجۆرێکی ترە، ئەو توانا ناوەکییەکانی خۆی دەخاتە کار، لای کافکا ئەگەر نووسین شتێکی ئەدەبی بێت، ئەوسا دەبێ شڵەژان و پشێوییەکی قووڵ بخولقێنێت. لێرەدا نووسەر تەنها لەپێناوی نووسینەکانیدا ناژی، بەڵکو بەپلەیەکی قووڵتر لەنێو نووسینەکانیشیدا دەژی، تەنانەت بەمانا ماتریاڵەکەی ئاوێزانی نووسین دەبێت، ئەمەیە ئەو چەشنە نووسینەی کە نووسەر وزەیەکی دیاریکراو سەرف دەکات بێئەوەی چاوەڕێی هیچ دەستکەوت و پاداشتێک بکات.

هەندێ لە سیماکانی بیۆگرافیای ژیانی کافکا ئەم مەسەلەیە دەردەخەن، بۆ نموونە، لەجیاتی ئەوەی کافکا ببێت بە نووسەرێکی لێهاتوو و لەبەری رەنجەکەی بخوات، کەچی بە رۆژ لە نووسینگەی تەئمینی حکومیدا کاری دەکرد، تەنها بە شەو یان ئێواران دەینووسی. پاشان وەک دەزانین کافکا داوای لە ماکس برۆد کردووە سەرجەمی بەرهەمەکانی بسوتێنێت، باشە بۆچی کافکا ئەم تکایەی لە هاوڕێکەی کردووە، لەکاتێکدا لەنەخۆشخانە لەسەر تەختەی مردندا بووەو خەریکی دەسکاری و پیاچوونەوەی دوا کاری خۆی بوو؟ بەڵام ماکس برۆد داواکەی رەتکردەوە، لەبری ئەوە، سەرجەمی بەرهەمەکانی کافکای لە پێنج بەرگدا چاپ کرد. بەمجۆرە کافکا بوو بە کەسێکی نەمر، نووسینەکانی لە پلەیەکی بەرزدا بوون بە ئەدەب ، دواجار بەپێی مەرجە تایبەتییەکانی خۆی، دان بە کافکادا نرا وەک نووسەرێکی داهێنەر، بەڵام تراژیدیاکە ئەوەیە کە خۆی لەژیاندا نەمابوو تا ئەو راستییە ببینێت.

لە رۆمانەکانی کافکادا چەند توخمێک هەن مومکینە بەشێوەیەکی مەجازی یان رەمزی ئە رۆمانانە بخوێنرێنەوە، دیسان مومکینە بەکارهێنانێکی سیاسییانە لەو رۆمانانەدا هەبێت بەڵام بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ، نووسینی کافکا ئیلتیزامی بەلایەنێکی سیاسییەوە نییە، وەک ئەوەی لەلای سارتەردا هەیە، چونکە هەڵوێستی سیاسی لە رۆمانەکانی کافکادا ونە، لەڕاستیدا نەبوونی

ئە جۆرە ئیلتیزامە لەگەڵ بۆچوونەکانی کافکادا زۆر بەجوانی دەگونجێت. پرۆسەی نووسین، نووسینێکە، سەرەڕای نیگەرانی و تەمومژ لەجیهاندا، بەرهەم دەهێنرێت، بەم مانایە نووسینی کافکا نووسینی قوربانییە.

ئەگەرچی دۆلۆز و گاتاری ئاسەواری سیاسی لە نوسینی کافکادا نابینن و ئەو بەمانا سارتەرییەکەی کەسێکی مولتەزیم نییە، بەڵام گفتوگۆو مشتومڕی ئەوەش دەکەن کە رۆمانەکانی کافکا رۆمانی سیاسین، بەو مانایەی رۆمانی کافکا نووسینێکی «بچوک» پێکدەهێنێت (کە سەر بە کەمایەتییەکی سیاسییە) لەنێو پێکهاتەیەکی زمانەوانیی گەورەدا (کە سەر بە زۆرینەیە)، واتە بەو پێیەی ئەو کەسێکی جوولەکەی چیکییە (ئەندامێکە لە گروپێک سەر بە کەمینەیە) و بە زمانی ئەڵمانی دەنووسێت (کە زمانی زۆرینەیە)، کافکا دەتوانێت لەنێو ئەو زمانە باوەدا رێگەیەکی تایبەتی بۆخۆی خۆش بکات، ئەمەش بە بنیاتنانی چەند دەستەواژەو چەند دیالێکتێک کە سەر بە کەمینەیە، ئەو یاری بە ریتمی زمانی ئەڵمانی دەکات، خوازەکانی ئەو زمانە و پەیوەندییە جینیالۆجیەکانی رەتدەکاتەوە، بەشێوازێک دەنووسێت زمانەکەی نائاسایی و نامەئلوف بێت، لەبری ئەوەی روانینێکی گشتی پێشکەش بکات، لێشاوێک لە پەیام بەرهەم دەهێنێت، ئەو لەراستیدا سروشتی زمانی ئەڵمانی دەگۆڕێت.

دەتوانین بڵێین ژیانی کافکا شێوازێکی نوێی لە تێگەیشتنی پەیوەستی نێوان نووسین و ژیان هێنایە ئاراوە. دەشێت ئەمە بەم شێوەیە کورت بکەینەوە: کافکا لە پرۆسەی نووسینیدا دەریخست کە نووسین بریتییە لە شێوازێک بۆ ژیان کە پێویستیی بە چڕکردنەوەی کۆشش هەیە، هەروەها لە میانی بەکارهێنانی لوغزو تەمومژدا توانی نووسین لە حەتمیەتی کۆمەڵایەتی (سۆسیۆلۆژی) و دەروونی (سایکۆلۆژی) رزگار بکات، ئەو دوو تێڕوانینەی دەیانەوێت نووسینی ئەدەبی لەرێگەی هەلەمەرجی ماتریالی و بیۆگرافیای نووسەرەوە راڤە بکەن. لەپاش کافکا چیتر نووسین (یان ئەدەب) بەرهەمی بارودۆخی کۆمەڵایەتی نییە بەتەنها، بەڵکو پێکهێنەری ئەو بارودۆخەیشە.

بەپێی شیکردنەوەی رەخنەگری فەرەنسی مارت رۆبێر، کافکا لە رۆمانەکانیدا کەسایەتیی سەرەکیی نادیار یان نەناسراو دەخوڵقێنێت، وەک کەسایەتی (ک) لە رۆمانی (قەڵا)دا، ئەمە بۆ ئەوەی جۆری ترانسندێنتالیی (متسامی)ی ئە کەسایەتییە بەرجەستە بکات، بەدەربڕینێکی تر کافکا ئەو کەسایەتییە بێناو و نادیارانە لەو ژینگەیە رزگار دەکات کە دەشێت تیایدا ژیابن، ئیدی دەتوانن ریشەی خۆیان لەچەندین ژینگەی دیکەی جیاوازدا درێژ بکەنەوە. بەمجۆرە ئەو کەسایەتییانە —بۆ نموونە جولەکە- دەتوانن لە تاراوگەدا هەموو جۆرە سنوورەکان تێپەڕێنن (لەگەڵ ئەوەی کافکا لە رۆمانەکانیدا هەرگیز ئەمە نالێت)، واتە دەتوانن سنوورە ئەخلاقی و یاسایی و کولتووری و سایکۆلۆژییەکان تێپەڕێنن. کەسایەتی (لە رۆماندا) کەسی نادیارو نەناسراوە، هەڵگری ناوێکی دیاریکراو نییەو رەگوڕیشەی نییە، هەمیشە هەوڵ دەدات و بەدوای کۆمەڵگایەکی ئەهلیدا دەگەڕێت، رێک وەک ئەو کۆچبەرانەی ئەمڕۆ لەئەوروپادا هەن. ژیانی تایبەتیی کافکا، وەک ئەوەی نیوە

جولەکەو نیوە ئەڵمانییە، بابەتی نەفی و تاراوگەو ئەودیوی هەرێمگەرایی بەرجەستە دەکات.

نەبوونی سنووری جێگیر دەشێت یەکێک بێت لە سیماکانی رۆمانی کافکا، ئەمجارە نەمانی سنوور نەمانی ترانسندێنتاڵ دەهێنێتە پێشەوە. سەرچاوە یان ئەسڵ و بنەما لەنێوبراوە: بنەمای یاسا، بنەمای گۆڕانکاری، بنەمای کاروباری سێکسی، بنەمای هۆکار لەپەیوەندیی نێوان هۆکار و ئەنجام، هەموو ئەمانە نامێنن و دەبن بە لوغز، پرسیاری «بۆچی؟»، وەڵامێک نادۆزێتەوە، بەم مانایە کافکا دەبێت بە کەسێکی نیچەوی. هەروەک جۆرج باتای دەڵێ: لەلای کافکا موژدەو بەهەشت بوونیان نییە. گومانی تیا نییە کافکا زۆر لەو وەسفەوە نزیکە کە پێی بڵێین «پۆست مۆدێرنە»، لە کۆشش و هەوڵدانیدا بۆ ئەوەی هەموو سنوورەکان و هەموو شوناسەکان ببن بە سنورو شوناسی خۆشرەو و نەرم.

تارمایی مەرگ و نیگەرانی، شوێنی خۆیان لە رۆمانەکانی کافکادا دەدۆزنەوە، دەشێت ئیمان دوور بخرێتەوە، لێرەدا شتێک نییە پێی بوترێت گەڕان بەدوای ئیماندا. وەک مۆریس بلانشۆ دەڵێ: دەربارەی مانا لێرەدا حاڵەتێک لە نایەقین هەیە، چونکە نیگەرانی و بێزاری و دڵەڕاوکێ و تەنگژەی دەروونی، لەرووی ئەدەبییەوە، واتە مردن لەناو ژیاندا، لێرە نیگەرانی سەرهەڵدەدات چونکە بوون بریتییە لە حاڵەتی نەفی و تاراوگە، لێرەدا نیشتمانێکی راستەقینە نییە تا مرۆڤ پەنای بۆ بەرێت و خۆی لە دڵەڕاوکێی ژیانی هاوچەرخ بەدوور بگرێت.

## سەرچاوە:

جون لیشتە، خمسون مفکرا اساسیا معاصرا من البنیویە الی مابعد الحداثە، ترجمە: د.فاتن البستانی، مرکز دراسات الوحدة العربیة و المنظمة العربیة للترجمة، بیروت، ٢٠٠٨.

# کافکا لە بەستێندا

محمد قاسم زادە
لە فارسییەوە: کاوە گوڵکار

(پاش «کاواباتا» و «میشیما» و «ئێڤە» سێ نووسەری بەناوبانگی ژاپۆنی کە دووانیان خەڵاتی ئەدەبی نۆبڵیان بەدەست هێناوە، ئێستا ناوی «هارۆکی مۆراکامی» جێگەی باسە و لەسەر زارە. هەرچەند سۆز و خۆشەویستی ئێمە بۆ ئەدەبی ئەمریکای لاتین و هەندێک وڵاتی ئەوروپی بۆتە لەمپەر و تاسەیەک لەسەر ڕێی ئاسیایەکان بە عام و بەتایبەتیش ژاپۆنیەکان گۆیا ئێمە لەم وڵاتە تەنیا چاوەڕێی کەرەستە و وەسیلەی ناوماڵ و شتی لەو بابەتانە ئەکەین و بڕوامان نیە ئەدەبێکی بەپێز لەم وڵاتە سەرهەڵبێنێت).

کافکا لە بەستێندا، ڕووداوێکە لە ئەدەبی ئاسیادا و مۆراکامی توانای ئەوەی هەیە سەرنجەکان بەرەو ڕۆژهەڵات راکێشێنێتەوە. لەم ڕۆمانەدا ئێمە ژاپۆنێکی گۆردراو ئەبینین. ژاپۆنی سوننەتی لە ڕەوایەتی مۆراکامیدا بزروونە. مرۆڤەکان، هەر کام بە شێوەیەک لەو ناوەندە رادەکەن. کەسایەتی سەرەکی ڕۆمانەکە نادیارە و بە نازناوی «کافکا» وە ئەیناسین ڕەگ و ڕیشەی نەتەوەیی لە کەسایەتی فرانتز کافکای چەک ئەچێت. تایبەتمەندی سەرەکی ئەم کەسە، سڵکردن لە ماڵی باوکیەتی و گۆشەگیری، ئاماژەیە بەو ئوستورەو دێرۆکەیە کە لەسەردەمی «سۆفۆکڵس»ەوە تا هەنووکە، داڵغەی ئەسڵی بیرمەندانە.

کافکا، ناکاتا، ئۆشیما، ساکۆراو خاتو ساناکی کەسایەتیەکانی تەوەری ڕۆمانەکەن. هەروەها شاری تاکاماتسۆ و شێوەکارە بەناوبانگەکەی کە «تامۆرا» باوکی کافکایە و ناوی «جانی واکەر»ی

لەخۆ ناوەو شۆفێرێک بە ناوی «هۆشنیۆ» کە ملی رێگا ئەگرێت و لە نیوەی رێدا، دەچێتە پاڵ مرۆڤەکانی ترەوە، کەسایەتی دووهەمینی رۆمانەکەن. کافکا تەمەنی پازدە ساڵە و کوڕی شێوەکارێکی مۆدێرن و ناسراوە. لە سەرەتای ڕۆمانەکەدا هەندێ پارەو شتی پێویست هەڵدەگرێت و ئەڕواو ماڵەکە بۆ باوکی بەجێدێڵێت. ئەمەش دووهەم جارە کە دانیشتوانی ئەم خانووە، ماڵەکە بەجێدێڵن. جاری یەکەم دایکی کافکا دەستی کچەکەی دەگرێت و ئەڕوا. بەمەش بۆمان ئاشکرا ئەبێ کە تامۆرای شێت ناتوانێت لەگەڵ ماڵ و منداڵەکانی هەڵبکات. کافکای مێردمنداڵ خوێنەرێکی باشە و چاوی بڕیوەتە ئەدەب و هەروەها مۆسیقای ڕۆژئاوا. کافکا ناوی «قالاو» لە خۆی دەنێت و ئەم تایبەتمەندیە هۆکارێکە بۆ ئەوەی بە ئاسانی ببێتە ئاواڵی «ئۆشیما»ی بەرپرسی کتێبخانە و ئەم دۆستایەتیەش رێگە خۆشکەرە بۆ ڕووداوە سەرەکیەکانی ژیانی. بەڵام بۆ هەموان حەز ئەکەن بەرەو شاری «تاکاماتسۆ» بڕۆن. لە ڕواڵەتدا خاتوو «سائاکی» لەوێ لەدایک بووە و دەیان ڕووداوی بەسەرداهاتووە. رەنگە ئەمەش ئاماژەیەک بێت بۆ گەڕانەوە بۆ ڕەحم بەڵام ئەم گەڕانەوە گەڕانەوە بۆ مەعسوومی و پاکی سەرەتانیە و لەوێدا کافکا تاوانێکی گەورە ئەکات. ئەم تاوانەش لە کتێبخانە واتە ئەو شوێنەی کە زەینی کافکا و خاتوو سائاکی پێک دەگەن. سەرەڕای تەنزی ڕووداوەکە، بەو مانایە کە ئۆشیما هەموو ئاسانکاریەکی بۆ ئەکات، بابزانین ئۆشیما کێیە؟ ئۆشیما لە ڕواڵەتدا ئەو پیاوەیە کە هەموو داب و نەریتە سوننەتیەکانی لە مێشکیدا وەدەر ناوەو ڕووی کردۆتە عەقڵیەتی رۆژئاوا. بەڵام لە ناخیدا کەسایەتیەکی دیکە هەیە کە دواتر کاتێ دوژنی فێمینیست دێن بۆ کتێبخانەکە و بە بیانووی ئەوەی ئاوڕێک لە ژنان ناداتەوە لۆمەو سەرکۆنەی ئەکەن و ئەو لە وەڵامیاندا ئەڵێت کە لە جەستە و لەشدا لە ژن ئەکات، بۆمان دەرئەکەوێت و ئاشکرا ئەبێت.

ئۆشیمای نێرەمووک بە خۆشیەوە کافکا وەرئەگرێت و لە کتێبخانەکەدا شوێنێکی بۆ دابین ئەکات هەر ئەو شوێنەی کە لەوێدا کافکا ئەبێتە جێگری ئۆدیپ. بەڵام چۆن؟ خۆ کافکا دایکی خۆی ناناسێت.

خانمی سائاکی لە گەنجیدا حەز لە کوڕێک ئەکات و دواتر ئەبێت بە دەزگیرانی ئەو کوڕە کە لە بنەماڵەیەکی گەورەن. هەر ئەو بنەماڵەشن کە کتێبخانەکە دائەنێن. کوڕەکە کە بۆ خوێندنی باڵا شار بەجێدێڵێت لە خۆپیشاندانێکی خوێندکاراندا بە غەڵەت بە دەستی خوێندکارێک ئەکوژرێت. کچە گۆرانیەک لە ژێر ناوی «کافکا لە بەستێندا» ئەخوێنێت و بەناوبانگ ئەگات. بەڵام پاشان واز لە گۆرانی گوتن دەهێنێت و توێژینەوەیەک ئەکات دەربارەی ئەو کەسانەی هەورە تریشقە لێی داون و یەکێک لەوانیش باوکی کافکا واتە «تامۆرا»یە. پاشان ئەگەڕێتەوە بۆ شاری «تاکاماتسۆ» و دەبێتە مودیری کتێبخانەکەی.

کافکا هەروا کە دەربارەی «ساکۆرا» هەست ئەکات کە خوشکی بێت هەروەهاش سەبارەت بە «سائاکی»ش هەست ئەکات کە دایکیەتی. چەند جارێکیش لەم بارەوە لە سائاکی پرسیار ئەکات بەڵام ئەو بە تەواوی دانی پێدانانێت.

لە ڕۆمانی «کافکا لە بەستێندا» ڕووداوی سەرسوڕهێنە زۆرە. لێ ئەم ڕووداوانە لە یەکێک لە

کەسایەتیەکان زێدەترە ئەقەومێت و ئەویش «ناکاتە»یە، کە بە هەندێ بەڵگەوە ئەکرێت بە نیوەی تەواوکەری کافکا تامۆرا یاخود بە لفی ئەوی «دوانەی ئەو» دابنێین.

لە سەرەتای ڕۆمانەکەدا، ئەو منداڵێکە کە لە تۆکیۆوە ئەیبەنێرن بۆ گوندێک تا لە شەڕ دوور بێت. لە ڕووداوێکدا، کە هیچ پاساوێکی بۆ ناهێننەوە، ئەو و هەندێ قوتابی لە گەشتێکی زانستیدا، ئەبوورێنەوە. پاش ماوەیەک بەبێ ئەوەی هیچ نیشانەیەک لەو ڕووداوەیان پێوە دیار بێت دێنەوە سەرخۆ جگە لە «ناکاتا». ئەو لەو وەزعەدا ئەمێنێتەوە و پاش چەند حەوتوو لە خەستەخانەیەک لە تۆکیۆ بەئاگادێتەوە بە چەشنێک کە زاکیرەی لەدەس چووە و چیدی نەئەتوانێت بنووسێت و نە ئەتوانێت بخوێنێتەوە. لەو سەردەمەدا کە کافکا ئەژی، ئەو پیرە پیاوێکی شەست ساڵەی پاک و بێ گوناحە. دەربارەی هۆکاری ئەو ڕووداوە ژاپۆنی و ئەمریکیەکان دەیان توێژینەوە ئەکەن کە پیشان ئەدات، ئۆپێراسیۆنی عەسکەری ئەمریکایەکان فرێ بەم ڕووداوەوە نیە و نابێت کەسانی بیانی لەم ڕووداوەدا بە تاوانبار دابنێین. ژاپۆنیەکانیش بێ تاوانن. لێ ڕووداوێکی بچووک هۆکارێکی گەورە بۆ ئەم ڕووداوە بووە، ئەویش ئەوەیە کە ئەو مامۆستایەی منداڵەکانی قوتابخانەی ئەو ڕۆژە بردوە بۆ گەشتی زانستی دووچاری پۆنی و بێ نوێژی ئەبێت و بەمەش زۆر پەست ئەبێت. حەز ناکات کەس لەم حاڵەدا بیبینێت و بەڕێکەوت «ناکاتا» دەسڕە خوێناویەکە ئەبینێتەوە و هەڵیدەگرێت و ئەیبات پیشانی مامۆستاکەی ئەدات، هەر بەم بۆنەشەوە مامۆستاکەی لە ناکاتا ئەدات. ئەبێ ئەوەش بزانین کە بێنوێژی ژن لە زۆربەی کەلتوورەکاندا بە شووم ناسراوەو نابێت لەو ماوەیەدا لە ژن نزیک بیتەوە. تەنانەت لە هەندێک کەلتووردا، ژن لە ماوەی بێ نوێژیەکەدا لە بنەماڵەکەی دوور ئەخرایەوە. لێرەوە یەکەمین تاوان ئەدرێتە پاڵ «ناکاتا»ی منداڵ و لەسەر ئەم تاوانەش مامۆستاکەی لێی ئەدات. ناکاتا پاش وەئاگاهاتنەوە ئەبێتە بوونەوەرێکی گەمژەی پاک و پوار. ئەوەش لەبیرنەکەین کە بەهەشت لە ڕوانگەی زۆرینەی دینەکان، جێگەی مرۆڤی ساویلکەو گەمژەیە. هەر بۆیە بە جۆرێک «ناکاتا» لە بەهەشتدا ئەژی.

ئەو ئەگەرچی عەقڵی تەواو نیە، لێ لەبری ئەو داهێزو تواناگەلێکی سەیر سەرهەڵدێنن. وەک ئەوەی ناکاتا ئەتوانێت لەگەڵ پشیلەکاندا قسە بکات هەر ئەم هێزەش پاڵی پێوە ئەنێت بۆ ئیشێکی ڕەچاو نەکراو کە ئەویش پەیوەندی لەگەڵ کافکادایە.

تامۆرای باوکی کافکا، لە ڕۆژانی کۆتایی تەمەنیدا پشیلەکان ئەڕفێنێت و پاش کوشتنیان دڵیان ئەخوات. ئەو بەنیازە لە ڕێگەی کوشتنی پشیلەکانەوە، ڕۆحیان کۆ بکاتەوە تا دواتر بلوێرێکی بێ هاوتای لە جیهاندا لێ دروست بکات. ناکاتا لە پشیلەیەکی ون بوو ئەگەڕێت کە هەنووکە لای تامۆرایە هەر بۆیە ناکاتا سەگەکەی «تۆنا» ئەبات بۆ ماڵی ئەوان و لە شێوە کارەکە داوا ئەکات هەر بەو چەقۆیەی کتکەکانی پێ کوشتووە، ئەویش بکوژێت.

ناکات بە ناچار دەستی بە خوێن سوور ئەبێت و لێرە بە دواوە، هێز و توانا سەیر و سەمەرەکانی جەستەی جێدێڵن. ئەو چیدی پاک و بێ تاوان نیە. ئەو گەمژە بەڵام هێشتا بە شێوەیەکی ئاڵۆزو مژاوی ئەتوانێت شتە سەیرەکان پێشبینی بکات. وەکو داکردنی ماسی و زارو لە ئاسمانەوە.

هەر لەو شەوەیدا کە «تومارا» لە تۆکیۆ ئەکوژرێت کافکاش لە شاری «تۆکا ماتۆ» لەسەرخۆ ئەچێت و پاشان لە شوێنێکدا کە نازانرێت کوێیە، بە ئاگادێتەوەو ئەبینێت پەڵەی خوێن لەسەر جل و بەرگەکەیدایە. ئەو تەلەفۆن بۆ «ساکۆرا» ئەکات و لە ماڵی ئەودا خوێنەکان ئەشوات. لێرەدا پەیوەندی کافکا و ناکاتا ئاشکرا ئەبێت. ئەو پەڵە خوێنانەی لەسەر جل و بەرگەکەی کافکا هەمان خوێنە کە ناکاتا بە دەستی خۆی ڕشتوویەتی. بەم جۆرە باوکێک بە دەستی منداڵەکەی ئەکوژرێت.

لە ڕۆمانی «کافکا لە بەستێندا» تەنیا کەسانێک ئەکوژرێن یاخود ئەمرن کە پێیەکیان لە رابردوودایە یاخود بۆ رابردوو نۆستالژیایەکیان هەیە. ئەمەش خاڵێکی گرنگ لەو کەلتوورەدایە کە کوڕ پاش کوشتنی باوکی نیشانەکانی ئەو بسڕێتەوە. کافکا هەموو شەوێک لە کتێبخانە خەون ئەبینێت کە کچێکی پازدە ساڵە هەموو شەوێک دێتە ناو هۆڵی کتێبخانەکە و لە بەرامبەری تابلۆی «کافکا لە بەستێندا» دائەنیشێت و چاو ئەبڕێتە وێنەکە، کافکاش لای وایە کە ئەمە هەر ئەو کچە پازدە ساڵەیە کە رۆژێک عاشقی کوڕی خاوەن کتێبخانەکە ئەبێت و پاشان ئەبێت بە خانمی «سائاکی». شەوانی دواتر، خانمی «سائاکی» ئەگەڕێتەوە بۆ کتێبخانە و لە ئاکامدا، لەوێ ئۆدیپی ژاپۆنی بە دایکی ئەگات.

ناکاتا پاش کوشتنی شێوەکارەکە ناگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە و هەستێکی نامۆ پاڵی پێوە ئەنێت بەرەو سەفەرێکی ئاڵۆز. نازانێت بۆ کوێ ئەچێت دواتر دێتە سەر ئەو باوەڕەی روو لە رۆژئاوا بکات و لە پردی گەورە بپەڕێتەوە.

لێرەوە رۆمانەکە رەنگێکی پۆلیسی لە خۆئەگرێت پۆلیسی تاوان لە کوڕی شێوەکارەکە ئەگەڕێن کە پێش کوژرانی باوکی بزر بووە. «ئۆشیما» ئەو ئەنێرێت بۆ کەپرێکی (کۆخێکی) کوێستانی کە پێشتریش جارێکی تریش ئەوی لەوێ حەشاردابوو.

کافکا نابێت لەو کوخەی ئۆشیما دوور بکەوێتەوە چۆن ئەگەری ئەوەی هەیە لە چڕی دارستاندا ون ببێت.

ناکاتا لەسەر رێگەی خۆیدا، ئەبێتە دۆستی شۆفێرێک بە ناوی «هۆشنیۆ» کە ئەبێتە هاوڕێی. ئەوان ئەچنە بازێڕی «تاکاماتسۆ». شوێنی سەرەکی رووداوەکە. لەوێ ئۆتۆمبیلێک بەکرێ ئەگرن و بێ مەبەست ئەسوورێنەوە. ناکاتا نازانێت ئەو شوێنە کوێیە یاخود چیە؟ پاش چەند ڕۆژ گەڕان، سێ شەممەیەکی ئەگەنە کتێبخانە، لەوێ دوای دیتنی خانمی «سائاکی» ئەو بیرەوەریەکانی خۆی ئەسپێرێت بە ناکاتاو وەسیەتیش ئەکات کە بیانسووتێنێت.

لە پاش ئەمانە دوو رووداوی سەیر ئەقەومێت. یەکەمیان رۆیشتنی کافکا بۆ ناو دارستان و بەزاندنی سنوورەکانی پێشوو. لە دارستاندا کافکا لەگەڵ دوو سەربازی سەردەمی شەڕی بەسەرچوو ئاشنا ئەبێت و ئەوانیش کافکا ئەبەن بۆ شارۆچکەیەک کە لەوێش هەمان کچی پانزدە ساڵە کە پێشتر لە شەوانی کتێبخانەدا لە خەونەکانیدا دیبووی، دێت بۆ لای و سەردانی ئەکات و خواردنی بۆ ئەهێنێت. پاشان خانمی «سائاکی» سەرهەڵئەدات و ئەو تێدەگات پێی ناوەتە ناو

جیهانی مردووەکانەوەو خانمی سائاکیش داوای لێدەکات پێش داخستنی دەرگای هاتنە ژوورەوە بگەڕێتەوە.

بەڵام ئەم دەرگای هاتنە ژوورەوە چیە؟ هۆشینۆ ویستی ناکاتا دێنیتە دی و لە مەعبەدێک بەردێکی بۆ ئەهێنێت. ناکاتا بۆ خۆی نازانێت کامە بەرد و کامە عیبادەتگە. لێرەدا ئەمریکایەک دێتە کایەوە، سەرهەنگ «ساندراس» ئەو پیرە پیاوەی کە نیشانەی «مریشکی کنتاکی» و هەنووکە لە شەقامەکانی تاکاماتسۆ خەریکی گەوادیە و ئەمەش بەشێکی تازە و سەیری رۆمانەکە پێک دێنێت.

بەردەکە ئەکرێتەوەو ناکاتا لەسەریا ئەمرێت. لێ ئاژەڵێک لە دەرونیدا پەپکەی خواردوەو بە نیازە لە دەمیەوە بێتە دەرەوە. هۆشینۆ ئەم ئاژەڵە ئەکوژێت و ناکاتا ملی رێگای دونیای مردووەکان ئەگرێتەبەر و کافکا ئەگەڕێتەوە بۆ ژیان و ئەڵێت کە ئەیەوێت بچێتەوە بۆ ماڵەوە، گۆیا سەرلەنوێ تەتهیر کراوە.

لە واقیعدا رۆمانی «کافکا لە بەستێندا» لە سێ بەش پێکهاتووە: ژیان لە تۆکیۆ (دۆزەخ) ژیان لە تاکاماتسۆ (بەرزەخ) و گەڕانەوە بۆ ماڵ (بەهەشت) و رۆیشتنی کافکا لە قوڵایی دارستانەوە بەرەو شاری مردووەکان ئەم واقعیەتە ئاشکرا ئەکات.

ئەم ڕۆمانە هەرچەند روانینێکە بۆ جیهانی کافکا و ئۆدیپ پاشا و هەروەها کۆمیدیای خودایی «دانتە» لێ کتێبێکی سەربەخۆشە کە بەڵگەیە بۆ سەلماندنی روانینی قووڵی مۆراکامی.

**سەرچاوە:**

لە ئینتەرنێتەوە وەرگیراوە

# میلان کۆندێرا لە بارەی کافکاوە دەنووسێت

## لە جێگایەک - لەو پشتەوە

لە عەرەبییەوە: ڕەووف بێگەرد

-1-

جۆزیف سکڤورسکی هاوڕێم لە کتێبێکیدا ئەم چیرۆکە ڕاستیە دەگێڕێتەوە:

ئەندازیارێکی خەڵکی پراگ بانگهێشتی کۆنفرانسێکی زانستی کرابوو لە لەندەن. دوای ئامادەبوونی لە هەموو دانیشتنەکاندا، بۆ پراگ گەڕایەوە. پاش چەند سەعاتێک لە گەڕانەوەی دەستی بە خوێندنەوەی «رودبراڤۆ» کرد کە ڕۆژنامەیەکی فەرمیی ئۆرگانی حیزبە. ئەم هەواڵەی تیا خوێندەوە: ئەندازیارێکی چیکی لە لەندەن بەشداری لە کۆنفرانسێکدا کرد. ڕاشکاوانە لێدوانێکی پڕ لە هێرشی داوە بە ڕۆژنامە خۆراواییەکان لەبارەی وڵاتە سوسیالیستەکەیەوە، بڕیاریشیدا هەر لە خۆراوا بمێنێتەوەو نەگەڕێتەوە وڵاتەکەی.

بێگومان کۆچ کردنێکی وا نایاسایی و لێدوانێکی لەو بابەتەیش کارێکی هەر ئاوا ئاسان نییە، بەڵکوو بیست ساڵ زیندانی کردنی بەدواوەیە.

ئەندازیارەکەمان بڕوای بە چاوی خۆی نەکرد، بەڵام گومانی تیا نیە و ئەو کەسەی ئاماژەی پێکراوە خۆیەتی، خانمە سکرتێرەکەی کاتێک چوە نووسینگەکەیەوە تووشی شۆک هات: خودایا، گەڕاویتەوە؟ تێناگەم! ئەوەی لەسەریان نووسیویت دیوتە؟

ئەندازیار ترسی لەناوچاوی سکرتێرەکەیدا بینی، ئەی دەتوانێت چی بکات؟ چوو بۆ نووسینگەی ڕۆژنامەی (رودبراڤۆ) بەر پرسی بەشی هەواڵی دۆزیەوە و پێی وت. ئەو داوای لێبوردنی لێ کرد

و وتی: بەڕاستیی بابەتێکی ترسناکە، بەڵام ئەو پەیوەندیی بە مەسەلەکەوە نیە، چونکە دەقی هەواڵەکەی ڕاستەوخۆ لە وەزارەتی ناوخۆ وەرگرتووە.

بەم جۆرە ئەندازیارەکە چوو بۆ وەزارەتی ناوخۆ، لەوێ پێیان وت: بەڵێ، ڕاست دەکەیت، هەڵەیەک ڕوویداوە، بەڵام وەزارەتی ناوخۆ پەیوەندی بە مەسەلەکەوە نیە، ئەوان ڕاپۆرتەکەیان لە هەواڵگری وەزارەتەوە وەرگرتووە لە لەندەن.

ئەو داوای لێ کردن هەواڵەکە بە درۆ بخەنەوە، ئەوان داواکەیان ڕەت کردەوە، چونکە بەدرۆخستنەوە مەحاڵە، بەڵام وتیان هیچ ڕوونادات و پێویست بە دوو دڵی ناکات. وەلێ ئەندازیارەکە تووشی دڵەڕاوکێ هات، زوو هەستی کرد کە لە ژێر چاودێریدایە و هەرچیەکی وتوە لای ئەوان تۆمار کراوەو لە شەقامەکاندا بەدوایەوەن، بەم جۆرە ئەندازیارەکە خەو لە چاوی ناکەوێت و هەمیشە مۆتەکەیەکی بەسەرەوەیە تا وای لێ دێت لەوە زیاتر بەرگەی فشار نەگرێت. گەلێک سەرکێشیی ڕاستەقینە دەکات بۆ ئەوەی بە ڕێگای قاچاخ وڵات بەجێ بێڵێت. تا لە دواییدا بە ڕاستیی بوو بە پەنابەر.

-2-

ئەو چیرۆکەی گێڕامەوە دەتوانین یەکسەر بە چیرۆکی «کافکاوی» ناودێری بکەین. ئەو زاراوەیە، لە کاری هونەرمەندێکەوە سەرچاوەی گرتووە، تەنیا خەیاڵی ڕۆماننووسێک بەرجەستەی کردووە، وەک شتێکی هاوبەش و تاک بۆ بارێکی (ئەدەبیی یان واقیعی) کە بواری وتنی هیچ وشەیەکی ترمان ناداتێ، هیچ تیۆرێکی سیاسی، کۆمەڵایەتی و دەروونیش ناتوانێت کلیلی تێگەیشتنمان بداتێ. بەڵام کافکاویەت چییە؟ با هەوڵی بەرجەستەکردنی هەندێک لە سیماکانی بدەین.

**یەکەم:**

ئەو ئەندازیارەی باسمان کرد ڕوو بەڕووی دەسەڵاتێک بوەتەوە تەواو خەسڵەتی «وێڵگەیەکی بێ سنوور»ی هەیە، ئەو هەرگیز ناتوانێت بگاتە تووناو توونە بێ کۆتاییەکانی و، نایشتوانێت ئەو کەسە بدۆزێتەوە کە ئەو فەرمانە شوومەی دەرکردووە. کەواتە ئەویش ڕوو بەڕووی هەمان ئەو هەلومەرجە دەبێتەوە کە جوزیف ک لە ڕۆمانی دادگاداو، ک زەوی پێو (مەساح) لە ڕۆمانی کۆشکدا تووشی بوون. هەرسێکیان لە دنیایەکدان بێجگە لە تاقە دەزگایەکی وێڵگەردیی گەورە هیچی تر نیە و ئەمانیش ناتوانن لێی دەرباز ببن.

ڕۆمان نووسەکانی پێش کافکا دەزگاکانیان بەوە داناوە کە گۆڕەپانێکی ململانێن لە نێوان بەرژەوەندی تایبەتی و گشتیدا. بەڵام لای کافکا دەزگا میکانزمێکە ملکەچی — یاسا تایبەتیەکانیەتی- کەس نازانێت کێ ئەم یاسایانەی داناوە، هیچ پەیوەندیشیان بە خەون و خەمەکانی مرۆڤایەتیەوە نیە و، وەک ئەنجامیش یاساگەلێکی تەم و مژاوین.

**دووەم:**

لە فەسڵی پێنجەمی ڕۆمانی کۆشکدا موختاری گوندەکە لەگەڵ «ک»دا بە دوور و درێژی باسی مێژووی فایلەکەی دەکات: بە کورتی: پێش چەند ساڵێک، لە کۆشکەکەوە فەرمان بە گوند درا کە زەوی پێوێک دامەزرێنن. موختار بە نەرێ وەڵامی دایەوە کە (کەس پێویستی بە زەوی پێو نییە) بەڵام وەڵامی ڕەتکردنەوەکە لە نووسینگەیەکی دی ون دەبێت، لە کاتێکدا ئەو نووووسینگەیەی فەرمانەکەی لێ دەرچوو بوو داوا کۆنەکەی هەڵوەشاندبووەوە و پشتگوێی خستبوو. بەم جۆرە دوای سەفەرێکی دوور و درێژ، ک بە هەڵە گەیشتە گوندەکە. زیاد لەمەیش، لەبەر ئەمەی ک بێجگە لە کۆشک و گوند هیچی تری نییە بوونی خودی ک تەنیا هەڵەیەکە و هیچی تر.

لە دنیای کافکاویدا فایلەکە ڕۆڵی بیرۆکەی ئەفلاتۆنی دەگێڕێت، ئەو نوێنەری واقیعی ڕاستەقینەیە لە کاتێکدا کە بوونە ماتەریاڵییەکەی مرۆڤ تەنیا سێبەرێکە و لەسەر شاشەی وەهم نمایش دەکرێت. لە ڕاستیدا «ک»ی زەوی پێو و ئەندازیارەکەی پراگ بێجگە لە دوو سێبەری فایلەکانیان هیچی تر نین و تەنانەت زۆر لەوەیش کەمترن. ئەو دوانە سێبەری هەڵەیەکی ناو فایلن. سێبەرێکی ناهەق، تەنانەت وەک دوو سێبەریش هەقی ژیانیان نیە.

جا ئەگەر ژیانی مرۆڤ لە سێبەرێک زیاتر نەبێت و واقیعە راستەقینەکە لە جێگایەکی تر بێت کە توانای دەستپێگەشتنی زەحمەت بێت، -لە نامرۆڤایەتی یان سەرووی مرۆڤایەتی- کەواتە ئێمە لە پرێکدا دەچینە ناو دنیای لاهووتەوە. بەڕاستیش ئەو نووسەرە بەراییانەی کافکایان هەڵدەسەنگاند، ڕۆمانەکانیان وا لێک دەدایەوە کە چیرۆکێکی ئاینی ڕەمزیین. لای من ئەم لێکدانەوەیە هەڵەیە، (چونکە ئەو کاتێک باس لە ڕەمز دەکات کە کافکا بارە هەست پێکراوەکەی ژیانی مرۆڤایەتی دۆزیوەتەوە) بەڵام روونکردنەوەی تێدایە: لە هەر جێگایەکدا دەسەڵات خۆی وەک خودا بنوێنێت، کافکا ئەو جێگایە دەدۆزێتەوە، ئەو لەو کاتەدا بە شێوەیەکی ئوتوماتیکی دەبێتە خاوەن تیولۆژیایەکی تایبەت بە خۆی. مرۆڤ لە هەر شوێنێکدا بە ئارەزووی خۆی هەڵسوکەوت بکات، ئەو هەستە ئاینیەکەی بەرانبەر ڕادەگرێت، دنیایەکی لەم جۆرە دەشێت بە دەربڕینی لاهوتی وەسف بکرێت.

کافکا رەمزی ئاینی نەنووسیوە، بەڵام کافکاویەت لە هەقیقەت و ئەدەبدا لە رەهەندە تیۆلۆژیەکەی جیاناکرێتەوە، یان با بڵێین (شێوە تیولۆژیەکەی)

**سێیەم:**

ڕاسکۆڵنیکۆف ناتوانێت قورسایی گوناهەکانی هەڵبگرێت، بۆ ئاسوودەکردنی خۆی، بە تەواوی ئازادیەوە حەز بە سزادانی خۆی دەکات. ئەمە ئەو پێگەیەیە کە پێی دەوترێت (تاوان بە دوای سزادا دەگەڕێت) لۆژێکی کافکا بە پێچەوانەی ئەمەوەیە. ئەو کەسەی سزا دراوە نازانێت هۆی سزادانەکەی چیە. بۆیە پووچی سزاکە لە تاقەت بەدەرە و تۆمەتبارکراوەکە بۆ ئاسوودەکردنی خۆی پێویستی بەوەیە پاساوێک بۆ سزادانەکەی بدۆزێتەوە. واتا (سزا بەدوای تاوانەکەدا دەگەڕێت). ئەندازیارەکەی پراگ بە چاودێری کردنێکی خەستی پۆلیسیی سزادراوە. ئەم سزایە بەدوای تاوانێکدا دەگەڕێت کە

نەکراوە. تا دواجار ئەندازیارە تاوانبارکراوەکە ناچار دەکرێت بە کۆچ کردن و دەیکات، وەک ئەنجام «سزاکە تاوانەکەی دۆزیوەتەوە».

لە بەشی حەوتەمی رۆمانی «دادگا»دا ک بڕیار دەدات بە هەموو ژیانی رابووردووی خۆیدا بچێتەوە، بەو حسابەی کە ئەو لە هەموو ڕابووردویدا بەرەو ڕووی تۆمەتێکی وا نەکراوەتەوەو شتی وایش نازانێت «تەنانەت بچووکترین شت» لێرەوەیە کە ئامێری «خۆسەرزەنشت کردن» دەکەوێتە کار و تۆمەتبار بە دوای تاواندا دەگەڕێت.

ڕۆژێک —ئامالیا– نامەیەکی بێ ئابڕوانەی لە کارمەندێکی کۆشکەوە پێ دەگات. زۆر تووڕە دەبێت و نامەکە دەدڕێنێت، کۆشک پێویستی بەوە نیە ئەو ڕەفتارە سەرکێشیەی ئامالیا سەرکۆنە بکات. ترس (هەمان ئەو ترسەی ئەندازیارەکەمان لە چاوی سکرتێرەکەیدا بینی) بەم جۆرەو بەبێ فەرمان کاری خۆی دەکات. بەبێ ئاماژەیەکی ئاشکرای کۆشک، هەموو لە خێزانەکەی ئامالیا دوور دەکەونەوە، وەک ئەوەی پەتا کەوتبێتە ناو خێزانەکەوە وایە. باوکی ئامالیا دەیەوێت داکۆکیی لە خێزانەکەی بکات. بەڵام تووشی گاشە دەبێت: چونکە نەک ئەوەی مەحاڵ نیە ئەسڵی فەرمانەکە بەدەست بهێنێت، بەڵکو خودی فەرمانەکە بوونی نیە! بۆ ئەوەی دووبارەی بکەیتەوە، یان داوای لێبوردن بکەیت، دەبێت یەکەمجار تۆ تاوانبار بیت: باوکی ئامالیا لە کۆشک دەپاڕێتەوە تاوانەکەی بۆ ئاشکرا بکات. کەواتە تەنیا ئەوە بەس نیە کە سزا بە دوای تاواندا بگەڕێت. لەم دنیا شێوە لاهوتیەدا سزادراوەکان دەپاڕێنەوە تاوانبار بکرێن!

ئەمڕۆ لە پراگدا زۆر ئەوە ڕوودەدات ئەوانەی دەوڵەت ڕقیان لێ هەڵدەگرێت، تەنانەت گەنترین کاریان وەگیرناکەوێت. ئەو بێ هوودە بەدوای ئەوەدا دەگەڕێت بزانێت چ تاوانێکی کردووە و بۆ کارکردنی لێ قەدەغە کراوە. بەڵام فەرمانێکی لەو جۆرە بوونی نیە، لەبەر ئەوەیش کە لە پراگدا کارکردن ئەرکە و یاسا سەپاندوویەتی، دواجار ئەو کەسە بەوە تاوانبار دەکرێت کە مشەخۆرە، ئەمەیش بەو مانایەیە ئەو تاوانبارە و نایەوێت کار بکات. لێرەدا (سزا تاوانەکەی خۆی دۆزیوەتەوە).

**چوارەم:**

چیرۆکی ئەندازیارەکەی پراگ چیرۆکێکی پێکەنین هێنەرە، گاڵتەیەکە دەتخاتە پێکەنین.

دوو پیاوی زۆر ئاسایی (نەک دوو «ڤەپرس» وەک لە وەرگێڕانە فەرەنسیەکەدا هەیە)، بەیانیەک لە ناوجێدا دەدەن بەسەر جوزیف ک و هەواڵی دەستگیرکردنی دەدەنێ، ناشتاکەیشی دەخۆن. ک کارمەندێکی زۆر ڕێک و پێکە، لەبری ئەوەی پیاوەکان لە ئاپارتمانەکەی خۆی بکاتە دەرەوە، هەر بە جلوبەرگی خەوەوە ڕادەوەستێ و بە درێژیی داکۆکی لە خۆی دەکات.

کاتێک کافکا فەسڵی یەکەمی دادگای بۆ هاوڕێکانی خوێندەوە هەموو دایانە قاقای پێکەنین، تەنانەت خودی نووسەرەکەیش. فیلیپ روس خەون بەوەوە دەبینێت ڕۆمانی کۆشک بکات بە فیلمی سینەما: کرو چۆمارکس ڕۆڵی —ک—ی زەوی پێو دەبینێت، چیکۆ و هارپۆ ڕۆڵی یارمەتیدەری دەبینن.

بەڵێ روس زۆر ڕاست دەكات: كۆمیدیا لە جەوهەری كافكاویەت جیانابێتەوە. بەڵام ئەمە دەردی ئەندازیارەكە چارە ناكات كە دەزانێت ئەوە كۆمیدیایە. لەو ژیانە گاڵتەجاڕیەدا لە ماسیەكی ناو حەوز دەچێت. ئەو ئەمە بە شتێكی پێكەنین هێنەر دانانێت. ئاسایی گاڵتەجاڕیی تا ئەوەندە گاڵتەجاڕیە كە لە دەرەوەی حەوزەكەیت. بەڵام كافكاویەت بەرەو ناخمان دەبات، بۆ ناو قوڵایی گاڵتەجاڕیەكە، بۆ ناو ترسناكیی كۆمیدیا.

لە دنیای كافكاویەتدا كۆمیدیا ناكۆك نیە لەگەڵ تراژیدیا (تراژكۆمێدی) بەڵام لای شەكسپیر وایە. بە جۆرێكی تر لە دنیای كافكادا كۆمیدیا لەبەرئەوە بوونی نیە كە بەهۆی ئاسانیی دەنگەوە زیاتر قبووڵی تراژیدیا بكرێت. ئەمە وا نیە و ئەو هەرگیز لەگەڵ تراژیدیادا نیە، بەڵكوو كۆمیدیا لەناو مندالدانیدا تراژیدیا دەخنكێنێت. بەمەیش قوربانیەكان لەو تەنیا دڵنەوایی كردنەی بەهیوای بوون بێبەش دەكات. دڵنەواییەك كە خۆی لە گەورەیی تراژیدیادا ببینێتەوە (گریمانەبێت یان ڕاستەقینە) ئەندازیارەكە نیشتمانەكەی خۆی لەدەست چوەو هەموو پێی پێدەكەنن.

-3-

لە مێژووی نوێدا چەند قۆناغێك هەیە ژیان تیایاندا لە رۆمانەكانی كافكا دەچێت.

كاتێك هێشتا لە پراگ دەژیام، هەمیشە دەمبیست كە خەڵك بارەگای سەركردایەتی حیزبیان بە (كۆشك) ناو دەبرد، (بینایەكی دزێوی مودرن) گەلێك جار دەمبیست كەسی دووەمی حیزب (هەڤاڵ هنریش) نازناوی —كلام- یان لێ دەنا «جوانی ئەم كارە لەوەدا بوو كە وشەی —كلام- بە زمانی چیكی مانای «تراویلكە» یان «فریودان»ە.

لە ساڵانی پەنجادا، دوای دادگایی كردنێكی ستالینیانە، -ئا-ی شاعیر كە كۆمۆنێستێكی گەورە بوو زیندانی كرا، لە زینداندا كۆمەڵێك شیعری بڵاوكردەوە. ئەگەرچی رووبەڕووی ترس و تۆقاندنێكی زۆر هاتبوو، بەڵام لە شیعرەكاندا پاكانەی زۆری بۆ دڵسۆزی خۆی بۆ حیزبی كۆمۆنیست كردبوو. ئەوەی ئەو كردی لەبەر ترسنۆكی نەبوو، بەڵكو ئەو وای دەبینی كە دڵسۆزیی بۆ جەلادەكانی نیشانەی گەورەیی و ڕاستیی خۆیەتی.

خەڵكی پراگ، ئەوانەی كۆمەڵە شیعرەكەیان دیبوو، بە كەمێك گاڵتە پێكردنەوە ناویان لێ نابوو «ئەمەگ ناسیی جوزیف ك».

ژیان لە پراگدا بوو بوو بە بەشێك لە وێنە و رووداوو و تەنانەت وشەی ناو ڕۆمانەكانی كافكا. ئەو قسەیە دنەمان دەدات بۆ ئەو ئەنجامگیریەی كە: ئەگەر وێنەكانی كافكا لە پراگدا زیندووبن لەبەرئەوەیە كە پێشبینی كۆمەڵگایەكی تۆتالیتاری دەكەن.

ئەم داوایە پێویستی بە ڕاستكردنەوە هەیە: كافكاویەت زاراوەیەكی سوسیولۆژی یان سیاسی نیە. گەلێك لێكدانەوە بۆ ڕۆمانەكانی كافكا كراوە بەو ئاراستەیە كە رۆمانەكان رەخنەن لە كۆمەڵگای پیشەسازی، لە چەوساندنەوە، لە نامۆ بوون لە ئاكاری بۆرژوایانە، بە كورتی رەخنەن لە

سەرمایەداری. بەڵام لە دنیای کافکادا شتێک لە ڕەگەزی سەرمایەداری نیە: نەپارە و دەسەڵاتەکەی نە بازرگانی، نە موڵک و خاوەنداریەتی نە ململانێی چینایەتی.

زاراوەی توتالیتاریزمیش بەسەر کافکاویەتدا پراکتیزە ناکرێت. لە رۆمانی کافکادا نە حیزب هەیە نە ئایدۆلۆژیا و فەرهەنگەکەی و نە سیاسەت. نە پۆلیس و نە سوپا. بۆیە لەسەرمانە بڵێین کافکاویەت توانایەکی شاراوەی مرۆڤ و دنیاکەیەتی. توانایەکی بێ سنووری مێژوویی کە بە هەر شێوەیەک بێت تا هەتا هەتایە لەگەڵ مرۆڤدا ڕێ دەکات.

بەڵام ئەم ڕاست کردنەوەیەیش ئەو پرسیارە ڕەت ناکاتەوە کە چۆن دەبێت ڕۆمانی کافکا تا ئەو ڕادەیە لەگەڵ ژیانی ڕاستەقینەی پراگدا گونجابێت، کەچی لە پاریسدا وا خوێندنەوە بۆ ڕۆمانەکان کرابێت کە دەربڕینێکی ئاڵۆز و نادیاری دنیای تایبەتی خودی نووسەرەکەن؟ ئاخۆ ئەمە بەو مانایەیە کە تواناکانی مرۆڤ و دنیاکەی، ئەو دنیایەی بە کافکاویەت ناودێر کراوە، لە پراگدا دەبێتە چارەنووسێکی شەخسی ڕاستەقینە و لە پاریسدا بەو جۆرە نیە؟

لە مێژووی نوێدا، هەندێک هۆگرایەتی ئەوە هەیە کە کافکاویەت ڕەهەندێکی کۆمەڵایەتی بەر فراوانە. هێزێکی گەورەی دەسەڵات کە دەیەوێت خۆی وەک خودا نمایش بکات، بیرۆکراتیەتی چالاکیە کۆمەڵایەتیەکان کە گشت دامەزراوەکانی کردۆتە وێڵگەیەکی بێ سنوور، ئەمە لە خۆیدا نەهێشتنی کەسایەتی تاکە. دەوڵەتە تۆتالیتارەکان، وەک مەڵبەندێکی چڕی ئەو هۆگریانە، لایەنێکی گەورەی کێشەکانن، ئەو ڕاستیەیش دەسەلمێنن کە پەیوەندیەکی پتەو لە نێوان رۆمانەکانی کافکا و ژیانی ڕاستەقینەدا هەیە. بەڵام کە خۆراوایی ناتوانێت ئەو پەیوەندیە ببینێت، لەبەر ئەوەنیە کە ئەو کۆمەڵگایەی ناوی دیموکراتیمان لێ ناوە کافکاویەتەکەی لە کۆمەڵگای پراگ کەمترە. بەڵکوو لەبەر ئەوەیە، وەک من هەستی پێ دەکەم، لە کۆمەڵگای خۆراواییدا هەست کردن بە واقیع بە تەواویی ئافەرۆزکراوە. بەڕاستیی، ئەو کۆمەڵگایەی پێی دەڵێین دیموکراتی، نامۆ نیە لە چەوساندنەوەی تاک و بیروکراتیەت. ئێستا هەموو دنیا بوەتە شانۆی ئەم پرۆسەیە. رۆمانەکانی کافکا گوزارشتێکی زێدەڕۆیی خەون و خەیاڵی ئەو پرۆسەیەیە، دەوڵەتی توتالیتاریش گوزارشتێکی زێدەڕۆی سووکی ماتەڕیاڵە. بەڵام بۆ دەبێت کافکا یەکەمین رۆماننووس بێت درکی بە کێشەگەلێک کردبێت کە دوای مردنی ڕوو دەدەن و دەکەونە سەر شانۆی مێژوو، ئەمەیش زۆر بە ئاشکرا و دڵڕەقانە؟ ئەگەر خورافات و ئەفسانەکان بخەینە لاوە، هیچ شتێکی گرنگ لە بەردەستانیە بۆمان بسەلمێنێت کە کافکا بایەخی بە سیاسەت داوە. بۆیە، کافکا لە هەموو هاوڕێ پراگیەکانی جیاوازە. وەک ماکس برود، فرانتس ڤیرڤیل، ئیگون ئارڤین کیش و، هەموو ئەو ڕابەرانەی بانگەشەی زانینی ئاڕاستەکانی مێژوویان دەکرد و ڕووی ئایندەیان دەهێنایە بەر چاوو ودڵیان پێ خۆش دەکرد، ئەی کەواتە بۆ بەرهەمەکانیان نەبوون بە پێشبینی کردنێکی کۆمەڵایەتی سیاسی وەک ئەو بەرهەمانەی ئەم تایبەتمەندیەیان وەرگرت؟ بێجگە لە هاوڕێ گۆشەگیر و تەنیاکەیان کە ڕۆچوە ناو ژیانی تایبەتی و هونەرەکەیەوەو، هەر لەبەر ئەمەیش لە بەشێکی زۆری دنیادا بەرهەمەکانی قەدەغە کران؟

من ڕۆژێک بیرم لەم نهێنیە کردەوە کە لە ماڵی کچە هاوڕێیەکی کۆنمدا دیمەنێکی بچووکم بینی،

ئەو کچە ساڵی ١٩٥١ لە دادگایی کردنێکی ستالینیدا لە پراگ زیندانی کرا، بە تۆمەتگەلێک تاوانبار کرا کە نەی کردبوون. هەر لەو کاتەدا سەدان کۆمۆنیست خۆیان لە هەمان بارودۆخی ئەودا بینیەوە. ژیانی ئەوان لەگەڵ ئەو حیزبەدا کە لە پڕێکدا بوو بە خوێن ڕێژیان تەواو تەبا بوو.

ئەوان وەک جوزیف ک «بە وردی بە ژیانی ئێستا و ڕابووردووی خۆیاندا چوونەوە بۆ ئەوەی تاوانێکی شاراوەی تیا بدۆزنەوە» کە هیچیان نەبینی لە کۆتاییدا دانیان بە تاوان گەلێکدا نا کە بە خەیاڵ دروستیان کردبوو.

ژنە هاوڕێکەم ژیانی خۆی دەرباز کرد، چونکە زۆر بوێرانە ملکەچکردنی —وەک هاوڕێکانی و — ئا-ی شاعیر کردیان — ڕەتکردەوە. «گەڕان بە دوای تاوانەکەیدا» ئەو بەو کارە یارمەتی خوێنڕێژەکانی نەدا، لە دوا دیمەنی دادگایی کردنەکەیدا هەراو زەنای نایەوە. بەم جۆرە لەباتی لە سێدارەدان فەرمانی زیندانی کردنی هەتا هەتایان بەسەردا سەپاند. دوای چواردە ساڵ ئیعتباریان بۆ گێڕایەوەو لە زیندان بەر بوو.

کاتێک ئەم ژنە گیرا تەمەنی کوڕەکەی یەک ساڵ بوو، کە بەر بوو تەمەنی کوڕەکەی پانزە ساڵ بوو، لەو کاتەوە هەردووکیان ژیانێکی تەریک و خاکەڕاییان لەگەڵ یەکدا بەسەر برد، پەیوەندییەکی زۆر سۆزدارانەو تەواو دیاری لەگەڵ کوڕەکەیدا هەبوو. ڕۆژێک چووم بۆ دیدەنیی ئەم ژنە، ئەوسا تەمەنی کوڕەکەی بیست و پێنج ساڵ بوو، دایکی لەبەر هۆیەکی زۆر ناچیز دەگریا و تووڕە بوو، تەنیا لەبەر ئەوەی کوڕەکەی زۆر خەوتوە یان شتێکی لەو بابەتە. لە دایکەم پرسی «بۆ لەبەر هۆیەکی وا هیچ بێزار بوویت؟ ئایا ئەمە گریانی دەوێت؟ تۆ شتەکەت زۆر بە گەورە نەگرتوە؟» کوڕە لاوەکە لەباتی دایکی وەڵامی دامەوە «نا» دایکم شت گەورە ناکات، دایکم ژنێکی ناوازەیە، ئازایە، ئەو کاتێک بەرگری دەکرد کە هەموو ئەوانی دی هەرەسیان هێنابوو، ئەو دەیەوێت من بکات بە پیاوێکی ڕاستەقینە، راست دەکات من زۆر خەوتووم، بەڵام دایکم لەسەر شتێکی لەوە زیاتر سەرکۆنەی کردم، ئەویش ڕەفتاری منە، ڕەفتاری خۆپەرستانەم، من دەمەوێت ئەوە بم کە دایکم دەیەوێت، تۆ دەکەم بە شایەت کە دەبێت وا دەربچم».

ئەوەی حیزب نەیتوانی لەگەڵ دایکەکەدا بەدی بێنێت، دایکەکە توانی بۆ کوڕەکەی خۆی دروستی بکات. دایکەکە کوڕەکەی ناچار کرد ئەو تۆمەتە سووکە قبووڵ بکات. نەک «گەڕان بە دوای تاواندا» و بە ئاشکرا دانی پێدا بنێت.

من بە سەرسامیەوە تەماشای ئەم دادگاییە ستالینیە بچووک کراوەیەم کرد. زوو لەوە گەیشتم کە میکانیزمی دەروونی، ئەوەی ڕووداوە مێژووییە گەورەکان (موجیزە و نامرۆڤایەتیەکان) دەرەخسێنێت، هەر ئەویشە کە کاروبارە تایبەتیەکان (زۆر ئاسایی و مرۆییەکان) بەدی دێنێت.

## -4-

لەو نامە بەناوبانگەدا کە کافکا بۆ باوکی نووسیوەو بۆی نەناردوە، بە چاکیی دەردەکەوێت کە پەیوەندیی نێوان منداڵ و دەسەڵاتی ڕەهای بە پیرۆزکردنی دایک و باوک لە چوارچێوەی خێزاندا

یەکێکە لە ناوەڕۆکی کورتە چیرۆکەکانی کە پاشان بوە بە تیمێکی گەورە بۆ هەموو رۆمانەکانی تری. لە چیرۆکی (فەرمانی دادگا)دا کە چیرۆکێکی کورتە و پەیوەندیەکی توندی بە ئەزموونی خێزانیی نووسەرەوە هەیە، باوکەکە کوڕەکەی تاوانبار دەکات و داوای ئەوەی لێ دەکات لە ئاودا خۆی بخنکێنێت. کوڕەکە تاوانە گریمان کراوەکە قبوولّ دەکات و گوێڕایەڵانە خۆی فڕێ دەداتە ناو رووبارەوە. وەک چۆن دواتر جوزیف ک لەلایەن رێکخراوێکی نهێنییەوە تاوانبار دەکرێت و بە چەقۆ دەکوژرێت.

لێکچوونی هەردوو تۆمەتبارییەکە، دوو جۆرە هەست بە تاوانباری کردن، دوو جۆرە فەرمان سەپاندن، پەیوەندیەک لە نێوان کارەکانی کافکادا دروست دەکات. پەیوەندیی نێوان «توتالیتاریزم»ی تایبەتی خێزان و «توتالیتاریزمی» دیدە کۆمەڵایەتیە گەورەکان.

کۆمەڵگای «توتالیتاریزم» بەتایبەتی لە فۆرمەلەکردنی توندڕەویە سەختەکەیدا، بەرەو ئەوە دەچێت کە سنووری نێوان گشتی و تایبەتی نەهێڵێت. داوا لە دەستەڵات دەکات بەردەوام لێڵ و نادیارە، زیاتر بۆ ژیانی هاوولاتی روون و ئاشکرا بێت. ئەم ئایدیای «ژیانی بێ نهێنی» یە لەگەڵ ئایدیای خێزانی نموونەییدا وێک دێتەوە. پێویستە لەسەر هاولاتی هیچ لە حیزب و دەوڵەت نەشارێتەوە. تەواو وەک ئەو مندالّەی لەسەریەتی هیچ نهێنیەک لە دایک و باوکی حەشارنەدات. کۆمەڵگای توتالیتار لە ڕاگەیاندنیدا زەردەخەنەیەکی ئایدیالی دەخاتە سەر لێوی، دەیەوێت وەک «تاقە خێزانێکی مەزن» خۆی نمایش بکات. زۆر جار دەوترێت ڕۆمانی کافکا دەربڕی ئارەزوویەکی پڕ لە جۆش و خرۆشە بۆ بڕواهێنان بە کۆمەڵ و پەیوەندیە ئینسانیەکان.

بۆ نموونە بۆ کەسێکی وەک —ک- کە ڕەگاژۆونیە تاقە ئامانجێک هەیە ئەویش رزگاربوونە لە نەفرەتی تەنیایی. ئەمە تەنیا وتەزایەک نیە، یان تەنیا شرۆڤەیەکی کورت کراوە نیە. بەڵکوو شرۆڤەیەکی ئاوەژوە. —ک-ی زەوی پێو بەدوای خەڵک و سۆزیانەوە نیە، ئەو نایەوێت وەک «ئورست»ی سارتەر ببێتە —مرۆڤێک لەناو مرۆڤەکاندا- ئەو دەیەوێت لەلایەن دامەزراوەیەکەوە قبوولّ بکرێت نەک لەلایەن کۆمەڵێکەوە بۆ ئەوەی وای لێ بێت باجی زۆر گران بدات:

دەبێت واز لە تەنیایی بهێنێت، ئەویش دۆزەخە بۆ ئەو. ئەو هەرگیز تەنیا نیە، ئەو دوانەی لە کۆشکەوە بۆیان ناردووە بەردەوام بەدوایەوەن. کە بۆ یەکەمین جار لەگەڵ فریدادا خۆشەویستی کرد، هەردوو پیاوەکە لەوێ بوون، لە چایخانەیەکدا لەسەر کورسی دانیشتبوون و تەماشای دوو عاشقەکەیان دەکرد. لەو چرکەساتەوە ئیتر لەسەر جێگای نووستنیش وازیان لێ نەهێنان.

خەمی کافکا لە نەفرەتی تەنیاییدا نیە، بەڵکوو «تەنیا خستنی بەزۆر» ئازاری دەدات.

کارول روسمان بەردەوام لەلایەن خەڵکەوە وەڕس دەکرێت، جلەکانی دەفرۆشن، تاقە وێنەکەی دایک و باوکی لێ دەستێنن. لە جێ خەوتنەکەی، لەپاڵ قەرەوێڵەکەیدا، کوڕەکان بۆکسێن دەکەن، تاوەناتاوێک بەسەریا دەکەون. دوو پیاوی سەرسەری، روبنسون و دیلامارش ناچاری دەکەن لەگەڵیاندا بژی. ئاهونالّەی برویندای قەڵەوییش لەکاتی نووستنیدا، گوێی بەژاروژەنگ دەخات.

چیرۆکی جوزیف کافیش بە دەستدرێژی کردنە سەر ژیانی تایبەتی دەست پێ دەکات: دوو

کەسی نەناس لەناو جێگاکەیدا دەستگیری دەکەن. ئیدی لەو ڕۆژەوە هەست بە تەنیایی ناکات. دادگا سووسەی دەکات و بە دوایەوەیەتی، لەبارەی ژیانیەوە لەگەڵیدا دەدوێت. وردە وردە ژیانە تایبەتەکەی لەناو دەچێت. ئەو ڕێکخراوە نهێنیەی دوای کەوتوە ژیانی قووت دەدات.

ئەو گیانە شاعیریەی کە مزگێنی هەڵوەشاندنەوەی نهێنی و پەرەسەندنی شەفافیەتی ژیانی تایبەتی دەکات، ئاگای لە سروشتی ئەو پرۆسەیە نیە کە بانگەشەی بۆ دەکات. خاڵی سەرەتای توتالیتێر سەرەتای ڕۆمانی «دادگای کردن»ە: تۆ لەناو جێگاکەتدا غافڵگیر دەکرێیت، دێنە سەرت وەک چۆن دایک و باوکت ئاسایی دەهاتنەلات.

زۆر جار پرسیاری ئەوە دەکرێیت کە ئاخۆ رۆمانی کافکا رەنگدانەوەی تەواویی ململانێی شەخسی و تایبەتیەکانی نووسەرن، یان وەسفی «ئامێرێکی کۆمەڵایەتی» بابەتین.

کافکاویەت لە خاوەنداریەتی تایبەتی یان گشتیدا کورت ناکرێتەوە، بەڵکو هەردووکیانە، گشتیی ئاوێنەی تایبەتیە و تایبەتییش ڕەنگدانەوەی گشتیە.

## -5-

کاتێک قسە لەسەر ئەو داروبارە کۆمەڵایەتیە بچووکانە دەکەم کە کافکاویەتیان بەرهەم هێناوە، مەبەستم تەنیا خێزان نیە، بەڵکوو ئەو دامەزراوەیەیە کە کافکا هەموو ژیانی خۆی تیا بەسەر بردووە، ئەویش —نووسینگە-یە.

زۆر جار وا لە پاڵەوانەکانی کافکا دەڕوانن کە ڕەنگدانەوەیەکی مەجازیی ڕوناکبیرن. بەڵام ڕوناکبیریی لە گریکۆری سامسادا نیە. کە لە خەو ڕادەبێت بوەتە قالۆنچە، ئیتر تاقە خەمێک دایدەگرێت: لەم شێوە تازەیەیدا چۆن لە کاتی خۆیدا بگاتە نووسینگە. بێجگە لە گوێڕایەڵی و مرێسی کە لە کارەکەیدا لەگەڵیا ڕاهاتوە چی تری لەسەردا نیە. ئەو کارگوزارە، کارمەندە، وەک هەموو پاڵەوانەکانی تری کافکا. کارمەند بە مانای نموونە سوسیۆلۆژیەکەی نا (وەک پاڵەوانەکانی زۆلا) بەڵکو وەک ئەگەرێکی مرۆڤایەتی، شێوازێکی سەرەتایی بۆ بوون. لە دنیای بیرۆکراتیی کارمەندا یەکەم چ دەستپێشخەریەک نیە، هەروەها داهێنان و ئازادیی کاریش نیە، ئەوەی کە هەیە تەنیا فەرمان کردن و ڕێنماییە. ئەوە دنیای فەرمان بەجێهێنانە.

دوەم، کارمەند بەشێکی بچووکی کاری گەورەی بەڕێوەبردن ئەنجام دەدات کە نە لە ئامانجەکەی دەگات و نە لە ئاسۆکەی: ئەو دنیایەی جووڵەیەکی میکانیکی تێدایە کەسەکانیش نازانن مانای ئەوەی دەیکەن چیە.

سێیەم: کارمەند لەگەڵ کەسانێکی نەناس و فایلدا مامەڵە دەکات: ئەمە دنیای ئەبستراکتە.

باری ڕۆمان لەم دنیای گوێڕایەڵیەدا، لەم میکانیزمەدا، لەم ئەبستراکتەدا کە تاقە سەرکێشی کردنی مرۆڤ هاتوچۆیە لەم نووسینگەوە بۆ یەکێکی تر. کارێکە دژ بە گەوهەری شیعری داستانیی، لێرەدا پرسیارێک دێتە گۆڕێ: کافکا چۆن توانیویەتی لەم مادە خۆڵەمێشیی و ناشیعریە، ڕۆمانی

سەرسوورهێنەر وەبەربێنێت؟

وەڵامی پرسیارەکە لە نامەیەکی کافکادایە کە بۆ میلینای نووسیوە: «نووسینگە (ئیدارە) دەزگایەکی گەوج نیە، لە دنیای خەیاڵەوە نزیکترە تا گەوجی».

ئەم ڕستەیە یەکێکە لە گەورەترین ڕازی کافکا، ئەو شتێکی دیوە خەڵکی دی نەیانبینیوە: نەک تەنیا ئەو بایەخە گەورەیەی دیاردەی بیرۆکراتی بە نیسبەت مرۆڤ و هەلومەرج و ئایندەیەوە، بەڵکوو (لەوە سەرسوڕهێنەرتر) ئەو شیعریەتەیە کە لە سروشتی تارمایی ئامێزی نووسینگەدا خۆی پەناداوە.

وەلێ ئەم قسەیە کە «نووسینگە لە خەیاڵەوە نزیکە» بە چ مانایەکە؟

دەشێت ئەندازیارەکەی پراگمان لێی تێبگات: هەڵەیەکی ناو فایلەکەی کۆچی بۆ لەندەن پێ دەکات، بەم جۆرە لە پراگدا وەک تارماییەکی ڕاستەقینە کە بەدوای جەستەونبوەکەیدا بگەڕێت سەرگەردان بوو. لە کاتێکدا ئەو نووسینگانەی سەری لێ دەدان وێڵگەیەکی بێ کۆتایی بوون لە بابەتی میتۆلۆژیا نادیارەکان.

ئەو سروشتە غەریبەی لە دنیای بیرۆکراتیدا درکی پێ کرد، خەیاڵێکی وای بە کافکا بەخشی کە پێشتر نەکرابوو: ماتەریاڵێکی تەواو دژە شیعری کۆمەڵگای بیرۆکراتی گۆڕی بۆ شیعرێکی مەزنی ڕۆمان. چیرۆکێکی زۆر ئاسایی پیاوێک کە ناتوانێت ئەو کارەی بەڵێنیان پێی داوە بەدەست بهێنێت (لە ڕاستیا ئەمە چیرۆکی «کۆشک»ە) دەکاتە ئەفسانە، داستان، جوانیەک کە پێشتر وێنەیان نەدیوە.

بە فراوانکردنی شوێنی بیروکراتیەکە بۆ دنیایەکی پان و پۆڕی فرە ڕەهەند، کافکا بێ دەستی ئانقەست وێنەیەکی سەرسوورهێنەرمان بۆ بەرجەستە دەکات کە خۆی هەرگیز نەیبینیوە، ئەویش کۆمەڵگای هەنووکەیی پراگە.

لە ڕاستیدا دەوڵەتی توتالیتاری تاکە نووسینگەیەکی زەبەلاحە. بەو پێیەی هەموو کارەکان بۆ دەوڵەتن. کەواتە هەر تاکێک، هەر کارێک بکات دەبێتە کارمەند. کرێکار کرێکار نیە. دادوەر دادوەرنیە، فرۆشیار فرۆشیار نیە. قەشە قەشە نیە، هەموو ئەمانە کارمەندی دەوڵەتین. «من سەر بە دادگام» قەشە لە کاتدراییەکەدا ئەمەی بە جوزیف ک وت. بەلای کافکاوە پارێزەریش لە خزمەتی دادگادایە، ئەمە بۆ پراگیەک سەیر نیە، چونکە هیچ کەسێک داکۆکی کردنێکی لەوە چاکتر بۆ خۆی نابینێت وەک ئەو داکۆکیەی لە ک کراوە، لەبەر ئەوەی پارێزەر ئەوەندەی کار بۆ دادگا دەکات بۆ تۆمەتباری ناکات.

## -6-

لە هەڵبەستێکی سەد چوارینەییدا، شاعیری گەورەی چیک یان سکاسێل، بە سادەییەکی نیمچە منداڵانەوە، باس لە ترسناکترین و ئاڵۆزترین قوڵایی دەکات و دەڵێت:

شاعیرەکان شیعر داناهێنن
شیعر لە شوێنێکەوە، لەو پشتەوە
لەوێندەر، زۆر دەمێکە، زۆر
شاعیر هیچ ناکات، جگە لە دۆزینەوەی.

کەواتە نووسین بۆ شاعیر ڕووخاندنی دیوارێکە، لە پشت دیوارەکەوە، لە تاریکیدا، شتێک شاراوەتەوە «شیعر» کە نەگۆڕە. بۆیە (بە هۆی ئەم دۆزینەوە کتوپڕ و سەرسووڕهێنەر)ە «شیعر» وەک «پرشنگێک تیاماندا دەدرەوشێتەوە»

کاتێک بۆ یەکەمجار رۆمانی «کۆشک»م خوێندەوە، تەمەنم چواردەساڵ بوو، ئیدی ئەم کتێبە نەیتوانی جارێکی تر بە هەمان ئەو قووڵیە سیحراویم بکات، هەرچەندە بە نیسبەت ئەو کاتەی منەوە زانیاری فراوانی ناو کتێبەکە (واتا بابەتە کافکاویەکە) نەزانراو بوو، کەچی حەپەساندمی.

دوایی، چاوم بە پرشنگی شیعر ڕاهات، لەگەڵ ئەوەی تووشی حەپەسانی کردبووم دەستم بە بینینی ئەزموون کردنی ژیانی تایبەتی خۆم کرد. بەڵام هێشتا پرشنگەکە لە جێگای خۆیدا مابوەوە.

یان سکاسێل دەڵێت: شیعر» چاوەڕێمانە، شیعر نەگۆڕە «زۆر دەمێکە.. زۆر) لێ نەگۆڕان لە دنیایەکدا کە هەمیشە لە گۆڕاندایە، وەهمێکی ڕووت نییە؟ نا، وا نیە.

(هەموو دۆخێک کردەی مرۆڤە، ئەوەش لە خۆی دەگرێت کە لە مرۆڤدایە، بۆیە دەتوانین خەیاڵی ئەوە بکەین کە دۆخەکە خۆی و هەموو پێکهاتە میتافیزیکییەکەی) «زۆر دەمێکە» وەک بۆ لوانێکی مرۆڤایەتی، بوونی هەیە).

بەڵام لە حاڵەتێکی وادا، مەبەست لە «نەگۆڕ» لای شاعیر چییە؟

لەوانەیە شتێکی سەیر بێت کە مێژوو لە دیدی شاعیردا، بریتی بێت لە هەڵوێستێک کە لە هەڵوێستی خودی خۆی بچێت. مێژوو داهێنەر نیە، بەڵکوو دۆزەرەوەیە. مێژوو لە هەلومەرجی تازەدا گەوهەری مرۆڤ دەدۆزێتەوە، مرۆڤ چیە «لە زۆر دەمێکەوە... زۆر» ئەگەرەکانی چین.

جا کە «شیعر» لە پێشدا هەبوو بێت، دانە پاڵی پێشبینی کردنی شاعیر کارێکی نالۆژیکیە، نا، شاعیر «تەنیا دۆزەرەوەیە» دۆزینەوەی ئەگەرەکانی مرۆڤایەتی «شیعر» کە «لە زۆر دەمێکەوە لەوێندەرە» ئەگەرێک کە مێژوویش لای خۆیەوە رۆژێک لە ڕۆژان دەیدۆزێتەوە.

کافکا پێشبینی نەکردووە. ئەو تەنیا شتێکی «لە جێگایەک — لەوپشتەوە» دیوە، نەیدەزانی بینینەکەی پێشبینی کردنە. ئەو نەیدەویست پەردە لەسەر سیستمێکی کۆمەڵایەتی لادات، ئەو ڕووناکایی خستۆتە سەر ئەو میکانیزمانەی لە ئەزموونی ئینسانی تایبەت و کۆمەڵایەتیەوە ناسیونی. بێ ئەوەی گومان بکات کە پێشکەوتنەکانی ئایندە، لە بواری پراکتیکدا، ئەو میکانیزمانە دەخاتە ڕەوتی بەربلاوی مێژووەوە.

نیگای (خەولێخستن) لەلایەن دەسەڵاتەوە، بێ هودەیی گەڕان بە دوای تاوانی خۆدا، دەرکردن و ترسی دەرکردن، فەرمانی خۆ گونجاندن، سروشتی بەتارمایی کردنی واقیع و واقیعی جادویی

فایلەکان، دەستدرێژی کردنی بەردەوام بۆ سەر ژیانی تایبەتی خەڵک و شتی تریش. هەموو ئەم ئەزموونانە کە مێژوو لە تاقیگا تایبەتیەکەی خۆیدا بەسەر مرۆڤدا پراکتیزەی کردووە، کافکا (چەند ساڵێک پێش ئەوە) لە ڕۆمانەکانیدا ئەنجامی داوە.

نزیک کەوتنەوەی دنیای ڕاستەقینەی دەوڵەتانی توتالیتێر لەگەڵ «شیعر»ەکەی کافکادا هەمیشە لایەنێکی نهێنی لە خۆ دەگرێت، بەردەوامییش ئەوە دەسەلمێنێت کە کاری شاعیر، لە گەوهەریدا، پێشبینی ناکرێت و ناکۆکە. ناوەڕۆکی کۆمەڵایەتی، سیاسی، «پێشبینی» کردن لە ڕۆمانی کافکادا، لە پلەی وردەکاریی «بێ دەربەست بوون»دا خۆی حەشارداوە. مەبەستم ئەوەیە کە ڕۆمانەکان سەربەخۆییەکی تەواویان لە هەموو بەرنامەیەکی سیاسی، چەمکە ئایدۆلۆژیەکان و پێشبینیەکانی ئایندە هەیە.

ئەگەر شاعیر خۆی بە هەقیقەتێکەوە «دەربەست» بکات کە پێشتر دیار و ناسراوە (ئەوەی خۆی خۆی دەردەخات) و (لەوێندەر لەبەردەستایە) لەباتی ئەوەی بە دوای «شیعر»ێکدا بگەڕێت کە «لە جێگایەکدا.. لە پشتەوە) شاراوەتەوە، لەو حاڵەتەدا بە ڕاستیی ئەو شاعیرە دەستبەرداری پەیامی شیعر بووە.

گرنگ نیە ڕاستییەکی پێشتر گریمان کراو، شۆڕش، جیاخوازی، بڕوابوون یان گومڕایی، بەڕاست یان بە هەڵە ناودێر بکرێن. ئەو شاعیرەی خزمەتی هەقیقەتێکی تر بکات، بەدەر لە خزمەتی ئەوەی «پێویستی بە دۆزینەوەیە» و «پرشنگێکی حەپەسێنە» ئەوە شاعیرێکی درۆزنە.

کە من وا سەرسەختانە پابەندی میراتی کافکام، کە من وەک میراتیەکی شەخسیی خۆم داکۆکی لێ دەکەم، لەبەر بڕوابونم نیە بەوەی تەقلیدکردنی شتێک کە تەقلید ناکرێت بەکەڵک و سوودمەندە (دووبارە دۆزینەوەی کافکاویەت) بەڵکوو لەبەر ئەوەیە کە ئەو میراتیە، نموونەیەکی ناوازەی (سەربەخۆییەکی ڕادیکالانە)ی ڕۆمانە (ئەو شیعرەی پێی دەوترێت ڕۆمان) هەر ئەو سەربەخۆییە ڕێگای بۆ فرانزکافکا خۆش کرد، دەربارەی دۆخی مرۆڤایەتیمان بە شێوازێک بدوێت (وەک لەم سەدەیەی ئێمەدا دەرکەوت) هیچ بیرۆکەیەکی کۆمەڵناسی یان سیاسی ناتوانێت بەو شێوەیە لەگەڵماندا بدوێت.

*لە دەقە عەرەبیەکەدا کە لە ئەنتەرنێتەوە وەرگیرا بوو، هەندێک ڕستە و دەستەواژە و وشەیان پەڕیبوون یان باش دەرنەچووبوون و ماناکەیان دەبزرکاند. بۆیە ناچار بۆ ڕاست کردنەوەیان پەنام بردە بەر دەقە فارسیەکە کە دکتۆر: پرویز همایون پور وەریگێڕاوە. -وەرگێڕ-

## سەرچاوە:

گۆڤاری نزوی - ژمارە (١٩) ساڵی ١٩٩٨.

# ك. وەكو كافكا

## چاوخشاندنێك بەسەر ژیان و بەرهەمەكانی كافكا

لە فارسییەوە: ئیسماعیل ئیسماعیل زادە

زۆربەی چیرۆكەكانی نووسەری ئاڵمانی زمان فرانتز كافكا كە لەدایكبووی كۆماری چیكە، پاش مردنی بڵاوكرانەوە و نیشاندەری بێگانەبوونی خەڵكی سەدەی بیستەمە.

كابوسەكانی كافكا كە لەبارەی نامرۆڤانەبوون و ئاڵۆزیی پێكهاتەی ئیداری و كۆمەڵگای سەرمایەدارییە، لە زۆر رووەوە لە بەرهەمەكانی «جۆرج ئۆرویل» وەكو رۆمانی ١٩٨٤ و مەزرای ئاژەڵان دەچێ.

نەخۆشی، سست بوونی ئەقڵ و لاوازبوونی جەستەی لەو فاكتەرە گرنگانەی بیوگرافی كافكان كە لە كورتە چیرۆكەكانی ئاین هانگر كونستلر و مەسخ دا رەنگیان داوەتەوە. (گریگۆر سامسا كاتێ لە كەڕەی بەیانییەكدا لە خەو هەڵدەستێ، تێدەگا كە بۆتە حەشەرەیەكی گەورە).

فرانتز كافكا لە شاری پراگی كۆماری چیك كە ئەوكات بەشێك بوو لە خاكی نەمسا، لەدایك بوو. هێرمان كافكای باوكی وشكە فرۆش بوو. دایكی واتە جوولی كافكا (لووی) لە بنەماڵەیەكی ناسراوی ئاڵمانی زمان، بە كولتوورێكی ئاڵمانیەوە لە گەڕەكی جوولەكانی پڕاگ دەژیان. هێرمانی باوكی كافكا لە ماڵێدا توورە و تۆسن بوو و داخی بە كوڕەكەی دەڕشت. كافكا سێ خوشكیشی هەبوو كە لە ئوردوگای نازییەكاندا كوژران. چیرۆكەكانی كافكا زۆر جاران لە ناكۆكیی نێوان باب و كوڕ دەدوێن یان لەبارەی كەسانێكەوەن كە لە بەرامبەر دەسەڵاتداراندا بەرگریی لە بێ تاوانان دەكەن.

کافکا لە وتاری «نامەیەک بۆ باوک» (١٩١٩)دا ئاوا دەنووسێ:

هەموو نووسینەکانی من لەبارەی تۆوەیە. ئەوەی کە لە نێو نوسراوەکانمدایە ئاخ و داخ و هاوارە بۆ ئەو شتانەی کە نەمدەتوانی بەرامبەر بە تۆ بیانڵێم. ئەوان ماڵئاواییەکی تاهەتایین لە تۆ.

کافکا لە نێو شەڕ و کێشەی بنەماڵەدا گەورە بوو و بە هۆی ئەندامبوون لە کەمینەی جولەکەی پڕاگدا، هەڵاواردنی کۆمەڵایەتیی ئەزموون کرد. بۆ ئەو چوونەوە سەر ڕەچەڵەکی جوولەکە بوون دژواز و دوو جۆریی بوو. لە نووسینەکانیدا دەڵێ :

من چ هاوبەشییەکم لەگەڵ یۆنانییەکاندا هەیە؟ من تەنانەت بە زەحمەت خاڵی هاوبەش لەگەڵ خۆمدا دەبینم. دەبێ هانا بۆ شوێنێک بەرم و لەوە رازی بم کە هەناسە هەڵدەکێشم.

کافکا لە قوتابخانەی سەرەتایی نەتەوەیی ئالمان خوێندی و قوتابخانەی نەتەوەیی زانستە مرۆڤیەکانی ئالمانی تەواو کرد. لە ساڵی ١٩٠١دا چوو بۆ زانینگەی «فریدناند کارلز» و لە ساڵی ١٩٠٦دا دکتۆرای یاسای وەرگرت. لەو ماوەیەدا چووە نێو کۆڕی بیرمەندانەوە کە تێیدا «فرانس ویرفل»، «ئۆسکار بووم»، «ماکس بروود» بەشداربوون و کافکا هەر لە ساڵی ١٩٠٢وەوە تێکەڵاویان بوو.

ساڵی ١٩٠٤ دەستی کرد بە نووسین و بە رۆژ لە دایرەدا راپۆرتی لەسەر رووداوی پیشەکاری و سڵامەتی دەنووسی و شەوانەش خەریکی نووسینی چیرۆکەکانی خۆی دەبوو. زمانی وشک و یاسامەندی چیرۆکەکانی کافکا تا ڕادەیەک لە ژێر کاریگەریی ئیشەکەی لە (دایرە)دا بوو و لە هەر چەشنە هەست و تەفسیرێکی ئەخلاقیی خۆی دەبوارد.

کافکا تا کاتی خانەنشین بوونی (لە ساڵی ١٩٠٧وە هەتا ١٩٢٣) لە شەریکەی بیمەدا کاری کرد. لە سەرەتادا لە بەرێوەبەرایەتیی یەکێک لە شەریکەکانی بیمەی ئیتالیادا لە پراگ بەرپرسایەتیەکی لە ئەستۆ بوو و دواتر لە دامەزراوەی بیمەی رووداوی کرێکاران لە پراگ بوو بە بەڕێوەبەر. لەم شەریکەیەدا پلەیەکی بەرزی هەبوو و لە ماوەی شەڕی یەکەمی جیهانیدا بە شێوەیەکی کاتیی لە چوون بۆ شەڕ بەخشرا.

کافکا لە ماوەی ژیانیدا لە ژن و کچێکی زۆر نزیک بوو و لەم پێوەندیانەشدا تووشی چەند شکستێک هات. ساڵی ١٩١٢ لەگەڵ خاتوو «فلیس بویر» کە بازرگانێکی ٢٤ ساڵەی بێرلینیی ئاشنا بوو. کافکا پێی وتبوو کە ژیان لە پەنای ئەو ژیانێکی راهبانەیە لەگەڵ پیاوێکی بێئەخلاق، ماخولیا، کەم دوو، ناڕازی و نەخۆش. پێوەندیی ئەوان ٥ ساڵی خایاند. دواتر فلیس چوو بۆ ئەمریکا و لە ساڵی١٩٦٠دا مرد.

یەکەم قۆناغی داهێنانی کافکا بە نووسینی کورتە چیرۆکی وەکو «داوەری» و «مەسخ» دەستی پێکرد. لە چیرۆکی مەسخ دا گریگور سامسا دوای ئەوەی لە خەو هەڵدەستێ تێدەگا کە لە ماوەی شەودا بۆتە حەشەرەیەکی گەورە. بەم هۆیە لەلایەن بنەماڵە بورژوازییەکەی خۆیەوە لە ژوورێک توند دەکرێ و باوکی ناوکی سێوێک لە گریگۆر هەڵدەکا، ئەم ناوکە سێوە دەڕزێ و دەبێتە هۆی مەرگی گریگۆر.

دەسپێکردنی شەڕی یەکەمی جیهانیی نەیدەهێشت کە کافکا لە بواری ئافراندنی چیرۆک وەکو ڕۆماننووس یان کورتە چیرۆک نووسێک کار بکات. بەڵام ئەو بە درێژایی ئەو ساڵانە وازی لە نووسینی نامە و نووسراوەکانی نەهێنا. لەو نووسینانەی کە کافکا لە ساڵی ١٩١٠وە دەستی کرد بە پاراستنیان، گریمانە ئەدەبیەکانی خۆی و خەون و ڕووداو و ئەزموونەکانی ڕۆژانەیەتی.

ئەو شانۆ و فیلمانەی کە چاوی لێکردن لە ژیانیدا دەوری گرنگیان هەبوو. ئەو پاش سەیرکردنی شانۆیەک بە زمانی عیبری (ئەرووپایی لە کافەیەکدا) بەمجۆرە دەنووسێ:

"هاودەردی و دڵسۆزی ئێمە بۆ ئەکتەرانی ئەم شانۆیانە کە کەسانێکی باشن و بێ دەسکەوتن و تەنانەت ناوبانگ و داهاتوویەکی باشیان نیە، لە ڕاستیدا وەکو هاودەردی و دڵسۆزی بۆ ئەو کەسانەیە کە بۆ سەربەرزی و نێوبانگ هەوڵ دەدەن.»

کافکا ١٩١٤دا دەستی کرد بە نووسینی ڕۆمانی دادگایی کە دووەم ڕۆمانییەتی و هەروەها کورتە چیرۆکی «سترافکولونی» نووسی، ئەمەش لەو بەرهەمە دەگمەنانەی ئەوە کە لە ماوەی ژیانی کافکادا بڵاوبووە.

ڕۆمانی»دادگایی» بەسەرهاتی هەوڵی ناهومێدانەی «جۆزیف کێ»ە بۆ مانەوە لەنێو ئەو ڕووداوە دڵتەزێنانەدا کە لەسەر سفرەی نانی بەیانییەوە دەست پێدەکا.

"کەسێک دەبێ بوختانی بە «جۆزیف کێ» کردبێ کە بەبێ هیچ تاوانێک گیراوە.»

لە دادگاییدا جۆزیف کێ تاوانی خۆی ڕەت دەکاتەوە و لێکۆڵینەوەی بێ کۆتای سیستمی دادگا دەست پێدەکا. بەڵام ڕاستیەک دەرناکەوێ و جۆزیف کێ وەکو سەگێک دەمرێ. لە کورتە چیرۆکی»سترافکولونی»دا، لە ڕاستەقینە وەکو و ئامرازێک بۆ ئەشکەنجە و ئازاردان کەڵک وەردەگیرێ. ماشێنێک کە قوربانییەکانی بە نووسینی زاتی تاوان لەسەر جەستەیان دەبا بۆ کوشتارگە.

کەسایەتیەکانی چیرۆکی کافکا تەنانەت پێش ئەوەی سنووری دەسەڵاتی خۆیان ببەزێنن سزا دەدرێن یان هەڕەشەی سزادانیان لێدەکرێ. یەکێک لە کەسایەتیەکانی چیرۆکی «دادگایی» ئاوا دەدوێ:

"ڕەنگە پێت وانەبێ کە ئەمە دادگاییکردنە. تۆ ڕاست دەکەی، چونکە کاتێ دەبێتە دادگایی کردن کە من پێموابێ.»

ئەم کتێبە بەم ڕستە بەناوبانگانە دەست پێدەکا:

دەبێ کەسێک بوختانی بە «K» کردبێ کەوا لە بەیانیەکی خۆشدا بەبێ هیچ تاوانێک گیرا. «جۆزف کێ» دوای ئەم ڕووداوە تووشی کاریگەریەکی بێبەزییانەی قانوون دەبێ، ئەگەرچی لە چیرۆکەکەدا تاکە یەک بەڕێوەبەری یاسا نابینی. کافکا ئەم تێمە چیرۆکییەی لە ڕۆمانی ناتەواوی «کۆشک»دا بەکارهێناوە. بەشی کۆتایی چیرۆکی دادگایی بەم جۆرەیە، دوو پیاو(کە بە پێی بۆچوونی تاقمێک لە ڕەخنەگران سیمبوولی تۆوی پیاون) جۆزێف لەگەڵ خۆیان دەبەن و بەچەقۆ لە دڵی دەدەن و دەیکووژن. کافکا لە مانگی ئووتی ساڵی١٩١٧دا نەخۆشی زەردوویی دەگرێ و بۆ ماوەی ١٠ مانگ لەگەڵ خوشکەکەی بە نێوی «ئۆتێلا» لە گوندی «زووێرۆ»لە دەڤەری «بووهمین»دەژی.

ساڵی ١٩١٩ لەبەر نەخۆشی ئەنفلۆنزا لە نەخۆشخانە دەکەوێ. دوای ئەوە کافکا زیاتر لە خەڵوەتگەی گوندەکاندا دەژی.

کافکا دواتر ئاشقی «میلنا جێسنسکا»، نووسەرێکی٢٤ ساڵە دەبێ کە بەشێک لە چیرۆکەکانی ئەوی وەرگێڕابووە سەر زمانی چێک. دوای ئەوەی لە یەکتر جیا بوونەوە، میلنا وەکو رۆژنامە نووسێک کاری کرد و توانی وەکو پاڵەوانی بەرگریی بناسرێ. میلنا ساڵی١٩٤٤ لە ئوردوگای کاری زۆرەملی ئاڵمانیەکاندا مرد.

«مارگارێت بوبەرنیومەن» لە بەرهەمی «میلنای کافکا»دا باسی ژیانی ئەم خاتوونە دەکا. رەنگە ترس لە پێوەندیی جنسی کافکا هۆی سەرەکیی رۆیشتنی میلنا بووبێ. ئەو لە زستانی ١٩٢٠ـ١٩٢١وە ئیتر هیچ نامەیەکی بۆ میلنا نەنووسی.

پاش ئەوەی پێوەندییان پچڕا، کافکا دوایین رۆمانی خۆی بە نێوی «کۆشک» نووسی. لەم چیرۆکەدا بەڕیز «K»دێتە گوندەکە و بانگەشەی ئەوە دەکا کە زەویناسە.

«کۆشکی هیل نووقمی تاریکایی و مژ بوو. تەنانەت تروسکەیەک نەبوو شوێنی کۆشکەکە دەربخا.

بەڕێز «K» هەوڵدەدا بە نواندنی خۆی وەکو لێکۆڵەرێکی رەسمی لێکۆڵینەوە لە سەر کۆشک، رێزێک بۆخۆی بەدەست بێنێ. کۆشککە وەکو دیاردەیەکی سەمەرە دەسەڵاتی بە سەر گووندەکەوە بوو. «K» هەوڵدەدا چاوی بە «کەلام»ی سەروەری کۆشک بکەوێ، یاریدەدەرەکانی، واتە «ئارتور» و «جێرمیا» هاوکاریی ناکەن «K» دواتر ئاشقی «فریدا»، کڵفەتی پێشووی «کەلام» دەبێت و فریدا کە تێدەگا «K» وەکو ئامرازێک کەڵکی لێوەردەگرێ، بەجێی دێڵێ.

کافکا لە ساڵی ١٩٢٢دا خانەنشین دەکرێت. ساڵی دواتر لەگەڵ «بالکتیک دورا دیامنت» ئاشنا دەبێت کە ژنێکی ٢٠ ساڵە و لە بنەماڵەیەکی جوولەکەی ئۆرتۆدۆکس بوو و هەروەها لە چێشتخانەی ئوردوگای گەشتوگوزاریدا کاری دەکرد.

نەخۆشیەکەی دەبێتە هۆی ئەوەکە واز لە لێپرسراوییە ئیداریەکان بێنێ، بەڵام ئیتر نەیدەتوانی بژیوێک بۆ خۆی دابین بکا و بنەماڵەکەشی لە پراگ ـ وە پووڵیان بۆ دەنارد. کافکا لەبەر ئەوەی عادەتی بوو نامەی دوور و درێژ بنووسێ و نەیدەتوانی پووڵی پۆستکردنی نامەکان بدا، ناچار بوو هەر کارت پۆستاڵ بنێرێ.

تەندرووستیی کافکا بەرەو خراپی دەچوو. بۆیە ساڵی ١٩٢٤ لە گەڵ دورا لە خەڵوەتگەیەک لە دەرەوەی ڤیەن نیشتەجێ بوو. بۆ ئەوەی لەگەڵ دۆرا زەماوەند بکا نامەیەک بۆ باوکی دورا دەنووسێ بەڵام وەڵامی نـــای پێدەدرێتەوە. هەرچی بێ دواتر دورا وەکو «ژنی فرانتس کافکا» خۆی دەناسێنێ. دورا دیامنت لە ئوردووگای نازیەکان و سەردەمای حکوومەتی ستالین لە رووسیا و شەڕی دووەمی جیهانیی رزگار دەبێ، بەڵام ساڵی ١٩٥٢ لە لەندەن کۆچی دوایی کرد.

کافکا شەش هەفتەی کۆتایی تەمەنی خۆی لەم خەڵوەتگەیەکدا تێپەڕ کرد و لە سێی ژوویەی ساڵی ١٩٢٤ بە نەخۆشی زەردوویی مرد. رۆمانی ناتەواوی ئەو بە نێوی «ئەمریکا» ساڵی ١٩٢٧ بڵاو

کراوە.

کافکا هیچ کات سەردانی ئەمریکای نەکرد بەڵام لە روانگەی یەکێک لە کەسایەتیە چیرۆکیەکانی خۆیەوە ئاوا دەڵێ: «کارڵ روسمان»ی تەمەن ١٧ساڵان، کاتێ وەکو کۆچەرێک دەچێتە بەندەری نیۆیۆرک، پەیکەرەی ئازادیی دەبینێ کە لەجیاتی مەشخەڵ شمشێرێکی بە دەستەوە.

کافکا وەکو جولەکەیەک لە کۆمەڵگەی ئاڵمانی زمانەکانی پراگ دوورە پەرێز کرابوو. بەڵام «ماکس برود»ی هاوڕێی ژیاننامە نووسی ئەو، ئەوپەڕی هەوڵی خۆیدا بۆ بەرزکردنەوەی کافکا لە بواری نووسەریدا، هەرچۆنێک بێ کافکا چەند چیرۆکێکی چاپ کرد. ئەو لە ماوەی دووساڵ ونیوی کۆتایی ژیانیدا توانی بەشێک لە باشترین بەرهەمەکانی تەواو بکا. لەوانە ئاماژە بە «هانگر کونستلێر» دەکرێ کە پاڵەوانی ئەم چیرۆکە لە پیشەی نائاسایی خۆیدا دەهێڵدرێتەوە هەتاکو بمرێ.

«جوزفین و سانگرین»یش یەکێکی دی لەو چیرۆکانەیە کە مشکێکی گۆرانی بێژ کەسایەتییە سەرەکییەکەیەتی.

کافکا پێش مردنی داوای کرد کە هەموو دەستنووسەکانی لە ناو بچن، بەڵام ماکس برود ئەم ویستەی کافکای بەجێنەهێنا و چیرۆکە ناتەواوەکانی»دادگایی، کۆشک، ئەمریکا»ی بڵاو کردەوە کە دەکەونە ریزی چیرۆکی کلاسیکیی مۆدیرنەوە.

***

**سەرچاوە:**

www.mandegar.info

# بلۆم فیلدی ڕەبەن

فرانز کافکا
لەفارسییەوە: ڕەووف بێگەرد و مەنسوور تەیفوری

بلۆم فیلد، ڕەبەنی گەڕاوە، شەوێکیان پلیکانەکانی بەرەو شوقەکەی خۆی دەبڕی. سەرکەوتن بە پلەکاندا ئێجگار زەحمەت بوو، چونکە لە نهۆمی شەشەم دەژیا. ئەویّ شەویش وەک دیکەی شەوان بەدەم بڕینی پلیکانەکانەوە بە خەیاڵیدا هاتەوە کە ژیانی تەنیایی چەند ئاستەمە. بیری کردەوە چی شەوە، بە ناچاری، ئەو شەش نهۆمە کپ و کڕ بەرەو ژوورە چۆڵەکەی دەبڕێ. لە ژوورێش ناچار کپ و کڕ جلی نووستن لەبەر دەکات، پایپەکەی دادەگیرسێنێ، لاپەڕەی گۆڤارێکی فەرەنسی کە ساڵانێکە بۆی دێت هەڵدەداتەوە، بەدەم خوێندنەوەوە قومێک لە ئارەقە بلاڵووکە دەسکردەکەی خۆی دەدات، دوایش پاش نیو کاتژمێر دەچێتە نێو نوێنەکەی، بێ ئەوەی ناچار نەبێ هەموو جارێک پێش نووستن ئەو نوێن و چەرچەفە دەقنەکاتەوە کە کارەکەرە لاسارەکە بە ئارەزووی خۆی کەڵەکەی کردوون. بلۆم فێلد تاسەی دۆزینەوەی هاوڕێیەکی کردبوو، کەسێک سەیری هاتووچۆکانی ئەم بکات. ماوەیەک بوو بیری لەوە دەکردەوە کە ڕەنگە خراپ نەبێ سەگێکی بچووک بۆ خۆی دەست بخات. سەگی بچووک بوونەوەرێکی شاد و بەتایبەت ئەمەگناس و بەوەفان. هاوکارێکی بلۆم فێلد سەگێکی وەهای هەیە. ئەو سەگە، خاوەنەکەی نەبێ لەگەڵ کەسی دیکە ناکەوێ و هەمیشەش دوای چەند خولەک دوورکەوتنەوە، بە حەپەحەپ بە پیریەوە دەچێ و وەک دیارە بەم دەنگ و هەرا دەیەوێ خۆشحاڵیی خۆی لە بینینەوەی دووبارەی خاوەنە زۆر خێرەومەندەکەی دەربڕێت. هەڵبەت ڕاگرتنی سەگ کێشەی خۆیشی هەیە. سەگەل چەندەش خاوێن ڕاگیرێن، دیسان ژوورەکە گڵاو

دەکەن و کەسیش هیچی پێناکرێ. خۆ ناکرێ هەموو جار پێش ئەوەی سەگە بێتە ژوورێ بە ئاوی گەرم بیشۆی؟ جگە لەوەی ئەمە بۆ تەندروستیی سەگەکەش خراپە. لەلایەکی دیکەشەوە، بلۆم فێلد چاوی هەڵنایەت ژوورەکەی بە پیسی ببینێ. لای ئەو خاوێنیی ماڵ پێویستییەکی بێ سێ و دووە. لەسەر ئەمە، ئەو هەفتەی چەند جار لەگەڵ کارەکەرەکەی، کە بەداخەوە زۆر گوێ بە پاک و خاوێنی نادات، تێدەگیرێ. لەبەر ئەوەی گوێی کارەکەرەکەی قورسە، بلۆم فێلد ناچارە دەستی بگرێ و بۆ ئەو سووچەی ژوورەکەی بەرێت کە بە دڵی ئەم پاک نەکراوەتەوە. بلۆم فێلد بەم چەق و قیریانە توانیویەتی کەم تا کورتێک ژوورەکە بە دڵی خۆی رێکبخات. بەڵام هێنانی سەگ مانای ئەوەیە بەنیازە بە دەستی خۆی ئەو پیسییەی کە هێند خۆی لێدەپارێزێ، بێنێتە ماڵێ. بەم جۆرە ئەسپێش، کە هاوڕێی هەمیشەیی سەگەلن، ژوورەکە پڕ دەکەن، کە ئەسپێش رێگەی بکەوێتە ئەو ناوە، دوور نابێ بلۆم فێلد بە ناچاری ژوورە کەنارەکەی بۆ سەگە جێبهێڵێ و لە ژوورێکی دیکە بگەڕێ. پیسبوونی ژوور، تەنیا یەکێکە لە کێشەکانی راگرتنی سەگ. سەگ نەخۆشیش دەکەون و، راستیەکەشی تێگەشتن لە نەخۆشینەکانیان بە گشت کەسێک ناکرێ. سەگ، کە نەخۆشینی پێ بگات، لە سووچێکدا هەڵدەترووشکێ یان زار و نزار تەپاوتل دەکات. ناچار دەبیت لە بەتانیەوەی بپێچی، فیکەی بۆ لێدەی، شیری بۆ دابنێی. بە کورتی، بە هیوای ئەوەی لەوانەیە نەخۆشینەکەی زووتێپەڕ بێ، تیماری بکەی. بەڵام دەشکرێ کێشەکە لەمانە قورستر بێ و باسەکە پەتا و نەخۆشییەکی ترسناک بێ .

سەگ، پیریش نەبێت، ئەنجام رۆژێک هەر پیر دەبێت، بێ ئەوەی فریای ئەوە بکەوی رێک لە کاتی خۆیدا لە کۆڵی خۆتی بکەیتەوە. دوایيش زوو رۆژێک دێ ئەو بەتەمەنییەی کۆتکردۆتەوە، لەودیو چاوی فرمێسکاویی سەگەکەوە چاوت تێدەبڕێ. بەم جۆرەش، ناچاری باری راگرتنی حەیوانێکی چاوکز و هەناسەسوار و پەککەوتەی قەڵەو لە کۆڵ بنێیت و باجی ئەو شادییەی سەگە رۆژکارێک پێی داوی، بە قورسترین شێوە بدەیتەوە. بۆیە بلۆم فێلد ئەگەرچی زۆر حەز دەکات سەگێک رابگرێ، وای پێ باشترە لە باتی داسەپاندنی گرفتی سەگێکی پیر کە کاتی سەرکەوتن لە پلیکانەکان دەنگی ناڵەناڵی لە خۆی بەرزتر بێ، سی ساڵی رەبەقی دیکەش تاق و تەنیا پلیکانەکان ببڕێ.

ئەمەشە بلۆم فێلد وەک جاری جاران و بە تاق و تەنیا دەمێنێتەوە. خۆ قەیرە کچ نییە حەز بکات بوونەوەرێکی دەستەمۆی لەلا بێت، ئاگای لێی بێ، بیلاوێنێ و ئاگاداری لێ بکات. تاسەکەی هێندە نییە بەشی [راگرتنی] پشیلە، کەناری و تەنانەت ماسیەکی زێڕینیش بکات، گەر ئەمانەش سەری نەگرت، تەنانەت مل بە گوڵ و گیای بەر پەنجەرە بدات. بلۆم فێلد، بە پێچەوانەی ئەم جۆرە قەیرە کچانە، هاوڕێیەکی دەوێ، ئاژەڵێک خزمەتی زۆری نەوێ، گیاندارێک کە کەی پێویست بوو بەرگەی شەقێک بگرێ و گەر پێویستیش بوو بتوانێ شەو لە کۆڵان بمێنێتەوە و بەمانەشەوە کەی بلۆم فێلدی دیت کلکەسووتێی بۆ بکات و پێیدا هەڵزنێ و دەست و پێی بلێسێتەوە. بلۆم فێلد شتێکی وەهای دەوێ. بەڵام چونکوو دەزانێ بۆ بەدیهێنانی داوایەکی لەم چەشنە دەبێ مل بە گەلێ کێشە بدات، وازی لێدێنێ. بەڵام بەپێی سروشتی خۆی، جار جارە، وەک ئەمشەو، هەمان ئەڵهای

کۆن سەری لێدەداتەوە. لە نهۆمی شەشەم، لە بەر درگای ژوورەکەی، کاتێ خەریکە کلیلەکە لە گیرفانی دەردێنێ، دەنگێک لە نێو ژوورەکەوە سەرنجی رادەکێشێ. دەنگەکە، دەنگی سەیری شتێکە خێرا و بێ ناوبڕ بە زەویدا دەدرێ. مادام بلۆم فێلد ساتێک پێشتر بیری لە سەگ دەکردەوە، لای وایە دەنگەکە پێی سەگە بەر زەوی دەکەوێ. بەڵام سەگ هێند خێرا بە زەویدا ناکێشێت. نە ئەمە زرمەی پێی سەگ نییە. بە پەلە دەرگاکە دەکاتەوە و کلیلی گڵۆپەکە دەچرکێنێ. ئینجا لە دیمەنێک هەڵدەکەوێ کە بە هیچ جۆرێک چاوەڕێی ناکات. ئەوەی دەیبینێ پتر لە جادوو دەچێ. دوو تۆپی سیلۆلێزی لە تەنیشتی یەکتر لەسەر رووکاری ژوورەکە هەڵبەز و دابەزیانە، بە جۆرێک کە کەی یەکێکیان کەوتە سەر زەوی ئەویدیکەیان لە تەشقی هەڵبەزینەوەیدایە. تۆپەکان، بێ هەدادان، یەکوچان هەڵبەز و دابەزیانە. بلۆم فێلد زۆر پێش ئێستە جارێکیان لە قوتابخانەی کۆتایی لە کاتی تاقیکردنەوەیەکی ئەلەکتریکیی بەناوبانگدا، هەندێ گۆی بچووکی بینیوە کە هەر بەمجۆرە هەڵبەز و دابەزیان دەکرد. بەڵام ئەم دوانە دوو تۆپی تاڕادەیەک گەورەن و لە کەشی ئازادی ژوورەکەدا هەڵبەز و دابەز دەکەن، چ تاقیکردنەوەیەکی ئەلەکتریکیش لەئارادا نییە. بلۆم فێلد دادەنەوێ کە باشتر بیانبینێ. بێگومان ئەمانە دوو تۆپی ئاساییین کە لەوانەیە بە گۆی بچووکتر ناواخن کرابن و هەر ئەم گۆیانەن ئەو دەنگە سەیرە درووست دەکەن. بلۆم فێلد دەستێک لە هەوادا رادەتەکێنێ بزانێ تۆپەکان دەزوویان پێوەیە یان نا. نا، هەڵبەز و دابەزەکەیان تەواو خۆبەخۆیە. جەخار بلۆم فێلد کوڕێکی مێردمنداڵ نییە ئەگین ئەم دوو تۆپە دیارییەکی زۆر دڵخۆشکەر دەبوون. بەڵام ئێستە، بەم تەمەنەی ئەمەوە، هەڵبەز و دابەزی تۆپەکان تەنیا لێی دەبێتە دەردی سەر. هەر ئەمەی کە وەک رەبەنێکی نەناسراو تەنیایی بەدەمەوە گرتووە، خۆی کەم نییە، بەڵام ئێستا کەسێک، گرنگ نییە کێ، ئەم دوو تۆپە سەیرەی بۆ ناردووە و تەنیاییەکەی تێکداوە.

بڕیار دەدات دەست ببات و یەکێکیان بگرێ. بەڵام تۆپەکان دەرباز دەبن و بە دوای خۆیاندا ژوورەکەی پێ دەتەقێنن. هەست دەکات ئەملا و ئەولا کردن بەدوای تۆپەکاندا گەوجانەیە، وازدێنێ و سەیری راکردنی تۆپەکان دەکات. مادام وەک دیارە رەدوونان نەماوە، تۆپەکانیش لە جووڵە دەکەون. بلۆم فێلد لەبەر خۆیەوە دەڵێ هەر دەیانگرم، دیسان پەلاماریان دەداتەوە. تۆپەکان خێرا دەکشێنەوە. بەڵام بلۆم فێلد پێیەکانی دەکاتەوە و دەیانترنجێنێتە سووچێکی ژوورەکە. پاشان لەبەردەم جانتایەکدا کە لەو سووچەدایە یەکێکیان دەگرێ. تۆپەی سارد و بچووک، لە دەستیدا خۆی بادەدات و دیارە دەیەوێ رزگار ببێ. تۆپەی دووهەم، چما هەستی بە گیرۆدەیی ئاوەڵەکەی کردبێ، توندتر هەڵدەبەزێتەوە و بەریانی بازدانەکەی فراوانتر دەکات تاکوو ئەنجام بەر دەستی بلۆم فێلد دەکەوێ، لەگەڵ ئەوەدا کە چرکە بە چرکە خێراییەکەی زۆر دەکات و ڕێچکەکەی دەگۆڕێ، لە هەر بازدانێکدا زەبرێک لە دەستی بلۆم فێلد دەدات، پاشان مادام دەرەقەتی ئەو دەستە نایەت کە تۆپەکەی لە مستیدا گرتووە، بەرزتر هەڵدەبەزێتەوە و وادیارە بەنیازی نیشانکردنی دەموچاوی بلۆم فێلدە. بلۆم فێلد دەتوانێ تۆپەی دووهەمیش بگرێ و هەردووکیان لە جێگەیەکدا زیندانی بکات، بەڵام لەم ساتەدا گرتن و زیندانیکردنی ئەو دوو تۆپە بچووکە لە ئاستی خۆیدا نابینێ.

لەلایەکی دیکەوە، راگرتنی دوو تۆپی لەو چەشنە، ناخۆشیش نییە. وەکی تر، زۆر ناخایەنێ تۆپەکان ماندوو دەبن، دەخزێنە ژێر دۆلابەکە و دادەمرکێن. بلۆم فێلد بەم ئەنجامگیرییەوە، بە تووڕەییەکی تایبەتەوە تۆپەکە بە زەویدا دەکوتێ. سەیر ئەوەیە رووکاری ناسک و تاڕادەیەک تەنکی ئەو تۆپە سیلۆلێزییە، کاتێ بەر زەوی دەکەوێ ناشکێ و تۆپەکان بێ چرکەیەک وچان، هەڵبەز و دابەزی کورت و هاوئاهەنگی خۆیان دەست پێدەکەنەوە.

بلۆم فێلد بە هێمنی جلەکانی دادەکەنێ و دەیخاتە دۆلابەکەوە. ئەو وا راهاتووە ورد سەیر بکات بزانێ کارەکەرەکە هەموو شتێکی لە جێگەی خۆی داناوە یان نا، بەدەم ئەم کارەوە یەک دوو جارێک چاو دەگێڕێ و سەیری تۆپەکان دەکات. ئێستە کە بلۆم فێلد دوای تۆپەکان نەکەوتووە، ئەوان دوای ئەو کەوتوون. تۆپەکان لێی نزیک بوونەتەوە و رێک لە پشتیەوە خەریکی هەڵبەز و دابەزن. بلۆم فێلد جلی نووستن لەبەر دەکات و بەنیازە بۆ ئەو سەری ژوورەکە بڕوات و لەوێ یەکێک لەو پایپانە هەڵبگرێ کە لە قەفەزەیەکدا بە دیوارەوە هەڵواسراون. بەر لەوەی ئاوڕبداتەوە و رێبکەوێ، بێ هەستی خۆی لەقەیەک دەخات. بەڵام تۆپەکان باش دەزانن چۆن خۆیان بدزنەوە و خۆیان لە لەقەکەی بپارێزن. کە دەڕوا پایپەکە هەڵبگرێ، تۆپەکانیش لە دووی دەڕۆن. بلۆم فێلد نەعلی لەپێدایە، نارێک پێ لە زەوی دەخشێنێت، کەچی لەگەڵ هەر پێدانانێکیدا، خێرا یەکێک لە تۆپەکان بەر تەختی ژوورەکە دەکەوێ. تۆپەکان بوونەتە هاوهەنگاوی. بلۆم فێلد لەپڕ هەڵدەگەڕێتەوە بزانێ تۆپەکان چۆن ئەم کارەیان پێدەکرێ. بەڵام هێشتا تەواو ئاوڕی نەداوەتەوە، تۆپەکان نیو بازنە دەسووڕێن و دەچنە پشت سەری، هەر جارەیش کە بلۆم فێلد ئاوڕدەداتەوە، ئەم کارەیان دووبارە دەبێتەوە، تۆپەکان وەک بەرێکەرێکی گوێلەمست، خۆ لە چوونە بەردەمی دەپارێزن. ئەگەر تا ئێستەش بێ ئەدەبیەکی وەهایان نواندووە، تەنیا لەبەر ئەوە بووە ویستوویانە خۆیانی پێ بناسێنن. بەڵام ئێستە ئیتر خەریکی بەجێهێنانی ئەرکەکەیانن.

بلۆم فێلد، بەزۆری لەو دۆخە نائاساییانەدا کە هەست دەکات دەرەقەتی روبەرووبوونەوەی دۆخەکە نایەت، خۆی گێل دەکات و وادەنوێنێ ئاگای لە هیچ نییە. ئەم کارە گەلێ جار فریای کەوتووە و هیچ نەبێ گرژیی بارودۆخەکەی کەم کردۆتەوە. بۆیە ئەمجارەشیان ئەم هەڵسوکەوتە دەگرێتە بەر، لە پێش قەفەزەی پایپەکاندا دەوەستێ و بە لێوی خونچەکراوەوە تەڵێکیان هەڵدەبژێرێ، ورد ورد لەو کیسە توتنەی لە بەردەستدا دایناوە، توتن هەڵدەگرێ و پایپەکە تێدەکات و، بەوپەڕی خەمساردییەوە وازدێنێ تۆپەکان لە پشت سەری لە هەڵبەز و دابەز بەردەوام بن. تەنیا کاتی چوون بەرەو مێزەکە چرکەیەک دڕدۆنگ دەبێ. بیستنی دەنگی ریتمی یەکهەوای هەنگاوی خۆی و دابەزینی تۆپەکان ئازاری دەدات. بۆیە هەنگاو شل دەکات، بێ ئەوەی پێویست بێ، ماوەیەکی زۆر تووتنەکە لە پایپەکەدا دەشێلێ و دووریی خۆی لە مێزەکە مەزەندە دەکات. ئەنجام بە سەر سستیەکەیدا زاڵ دەبێ و بە هەنگاوی پتەوەوە بەرەو مێزەکە دەچێ، هێند پتەو کە هیچ دەنگی بەریەککەوتنی تۆپەکان و تەختی ژوورەکە نابیسێ. بەڵام کە دادەنیشێ، تۆپەکان دیسان لە پشت سەریەوە دەست دەکەنەوە بە هەڵبەز و دابەز، بە دەنگێکەوە کە  بە راشکاوی دەبیسرێت.

لە ژوورەوەی مێزەکە، لە بەردەستدا، لە سەر لێواری تەختەیەک، بوتڵێ ئارەقی بڵاڵووکی لێیە و چەند گێلاسی بچووکیش لە دەوری. لە تەنیشتیان چەند ژمارەیەکی گۆڤارە فەرەنسیەکە هەڵچنراوە (ژمارەی نوێی گۆڤارەکە هەر ئەمڕۆ گەشتووە). بلۆم فێلد دەست رادەکێشێ و دایدەگرێ. ئارەقەکە پاک لەبیر دەکات. خۆی هەست دەکات ئەمشەو تەنیا لەبەر لاسارییە بە سەرقاڵیە هەمیشەییەکەیەوە خەریک دەبێ. ئەگەرچی زۆریش حەزی لە خوێندنەوە نیە، بە پێچەوانەی راهاتنی کە هەمیشە گۆڤارەکەی ورد و لاپەڕە بە لاپەڕە سەیر دەکرد، ئەمجارەیان لە خۆبەختی لاپەڕەیەک دەکاتەوە و چاوی بە وێنەیەکی گەورە دەکەوێ. زۆر بۆ خۆی دێنێ کە ورد سەیری وێنەکە بکات. وێنەکە، چرکەساتی یەکدیتنی تێزاری رووسیا و سەرۆک کۆماری فەرەنسا پیشان دەدات: یەکدیتنەکەیان لەسەر تەختی کەشتییەک بووە. لە دەوروپشتی کەشتیەکە، تا چاو هەتەر دەکات کەشتیی دیکە دیارن. ئەو دووکەڵەی لە دووکەڵکیشەکانیانەوە هەڵچووە، لە ئاسمانی سامالّدا ون بووە. تێزاری رووسیا و سەرۆک کۆماری فەرەنسا بە شەقاوی هەراو بەرەو یەکتر هاتوون و لەم چرکەدا تەوقە دەکەن. لە پشتی هەر کامیانەوە دوو پیاو وەستاون. بە پێچەوانەی سیمای بەخەندەی تێزار و سەرۆک کۆمار، دەم و چاوی ئاوەڵەکانیان ئێجگار مۆنە. هەر تاقمە ئاوەڵێک چاویی بڕیوەتە سەرۆکەکەی خۆی. کەمێک لەولاترەوە (بەڵگەکان پیشان دەدەن ئەم دیدارە لە بەرزترین نهۆمی کەشتیەکەدا بووە) سەربازانی هێزی دەریایی لە چەندین ریزی درێژدا، بەئاگا وەستاون. بلۆم فێلد بەرەبەرە بە حەزێکی زیاترەوە سەیری وێنەکە دەکات. پاشان کەمێک دوورتری دەخاتەوە و بە چاوی نیوە نووقاوەوە سەیری دەکات. ئەو هەمیشە بە دیتنی دیمەنی بەشکۆی لەم چەشنە دەهەژێ. ئەوەی کە کەسە سەرەکیەکانی شانۆکە بەدەر لە هەر گومانخراپییەک، دڵنزیک و رووخۆش دەستی یەک دەگوشن، لای ئەو زۆر راستەقینە دیارە. لەلایەکی دیکەشەوە، زۆر ئاساییە ئاوەڵەکانیان (دیارە کەسانێکی پلەبەرز کە ناویان لە خوارەوەی وێنەکەدا هاتووە) لە هەڵسوکەوتی خۆیاندا مەزنیی ئەم چرکە مێژووییەیان رەچاوکردووە.

بلۆم فێلد لەباتی ئەوەی پێداویستییەکانی دابگرێ، کڕ و کپ دانیشتووە و ئەوقی سەری پایپە دانەگیرساوەکە بووە. خۆی مەڵاس داوە. لەپڕ، جۆرێکی پاک چاوەڕێنەکراو، بێدەنگی و بێجووڵەییەکەی نامێنێ و بە تەکانێک بە قەنەفەکەی ژێریەوە دەسوورێ. بەڵام تۆپەکانیش بە قەد ئەو وشیارن، لەوانەشە بێ ئیرادەی خۆیان پێڕەوی یاسایەک دەکەن کە بەسەریاندا زاڵە. هەر چۆنێک بێت، هاوکات لەگەڵ سووڕانی بلۆم فێلد، ئەوانیش شوێنی خۆیان دەگۆڕن و لە پشتیەوە خۆیان دەشارنەوە. ئێستە بلۆم فێلد، پایپی سارد بە دەست، لە پشتی مێز دانیشتووە. تۆپەکانیش جارێ لە ژێر مێزەکە هەڵبەز و دابەزیانە و، مادام ژێر مێزەکە فەرش کراوە، دەنگی بزووتنەکەیان بەئاستەمێ دەبیسرێ. ئەمە خۆی شانسێکە. ئەو دەنگەی دێت ئەسپایی و کپە. دەبێ ورد گوێ رادێری تاکوو گوێت لێبێ. هەڵبەت بلۆم فێلدیش کەسێکی زۆر وردە و باش گوێی لەو دەنگەیە. بەڵام گومانی تێدا نییە دۆخەکە وەها ناخایەنێ. پێدەچێ پاش دەمێکی کورت، گوێی لە چ دەنگێک نەبێ. ئەوەی کە تۆپەکان ناتوانن لە سەر فەرشەکە هەرایەکی ئەوتۆ بنێنەوە، لای بلۆم فێلد لاوازیە

گەورەکەیانە. هەر ئەوەندەی یەک دوو فەرشێک لە ژێریاندا رابخەیت، بەسە بۆ ئەوەی هێزیان ببڕێت، هەڵبەت نەک تا سەر، تەنانەت بوونی تۆپەکان، خۆی جۆرێک هێزە.

لەم بارودۆخەدا، دەرمانی دەردی بلۆم فێلد، سەگێکە. سەگێکی گەنج و ئازا دەیتوانی سانا دەرەقەتی تۆپەکان بێت. بلۆم فێلد دەیهێنێتە پێش چاوی خۆی کە سەگێکی لەم چەشنە چۆن چنگاوڕی تۆپەکان دەبێ، پاشەکشێیان پێدەکات، بە چوار دەوری ژوورەکەدا دەیانڕفێنێ و لەدواییدا بە کەڵبەی دەیانگرێ. ئان و ساتە بلۆم فێلد سەگێک بۆ خۆی بکڕێ.

بەڵام تا ماوەیەکی زۆر دەبێ تۆپەکان تەنیا مەترسیی بلۆم فێلدیان لەسەر بێ. بەڵام جارێ تاقەتی لەناوبردنیانی نییە. لەوانەشە ئەوەی کەمە تەنیا تواناى پێویستە بۆ ئەو بڕیارە. شەو، شەکەت لە کار هاتۆتەوە و ئێستە کە حەسانەوەی پێویستە، تووشی ئەم گرفتە هاتووە. تازە ئێستا باش تێدەگات چەندە ماندووە. بێ سێ و دوو تۆپەکان لەناودەبات، زوویش، بەڵام نەک ئێستە، لەوانەیە سبەی. وەکی تریش، گەر بێ دەمارگرژی سەیری کێشەکە بکەی دەبینی تۆپەکان گرفت و ئازارێکی ئەوتۆیان نییە. بۆ نموونە، دەکرا بەرزتر لەمەش هەڵبەزێنەوە و بە سەر مێزەکەدا بدرێن و بەمجۆرەش تۆڵەی کپبوونی دەنگیان لە ژێر مێزەکەدا بکەنەوە. بەڵام شتی لەم چەشنە ناکەن. چونکوو بەنیاز نین لەخۆڕا بلۆم فێلد شێتبگیر بکەن. بە ئاشکرا دیارە تۆپەکان بە چەندەی بۆیان بڕەخسێ رازی دەبن.

هەڵبەت هەر ئەم کەمترین رادەیەش بەشی ئەوە دەکات چیدی بلۆم فێلد تاقەتی دانیشتنی پاڵ مێزەکەی نەمێنێ. هێشتا چەند خولەکێک پتر بە سەر مانەوەی لە تەنیشت مێزەکەدا رانەبوردووە کە بە خەیاڵیدا دێت بچێتە نێو نوێنەکەی. پاڵنەرێکی ئەم بیرۆکە ئەوەیە لێرە ناتوانێ پایپ پێبکات، چونکوو لقە شقارتەکانی ناوەتە سەر مێزی نووستنەکە. بۆیە ناچارە بچێ و بیانهێنێ. بەڵام مادام ئێستە بەتەمایە بۆ لای مێزی نووستنەکە بچێ، باشتر ئەوەیە لەوێ بمێنێتەوە و رابکشێ. هەڵبەت بەم کارە دەیەوێ شتێکی دیکەش بپێکێ، بلۆم فێلد لای وایە تۆپەکان بەهۆی ئارەزووی کوێرانەیان بۆ کەوتنە دوای، باز دەدەنە سەر چرپاکەی و ئەو لە کاتی ڕاکشاندا، بەرێکەوت بێ یان بە حەز، لەژێر خۆیدا دەیانتلیقێنێتەوە. ئەم خەیاڵە لە خۆی دەڕەوێنێ کە رەنگە لەت و کوتی شکاوی تۆپەکانیش هێشتا هەڵبەز و دابەز بکەن. خۆ مەحاڵیش، دەبێ سنوورێکی هەبێ. زۆر راستە، تۆپی ساغ هەڵبەز و دابەز دەکەن، هەڵبەت هەڵبەز و دابەزەکەیان هەمیشەییش نییە، بەڵام لەت و کوتیان مەحاڵە. کەوابوو لەم کاتەدا چ هەڵبەز و دابەزێک لەکاردا نابێ.

بلۆم فێلد، شاگەشکە بەم خەیاڵە، بە دەنگی بەرز دەڵێ: «هەستە!» پاشان بە هەلەکەسەما بەرەو چرپاکە دەجووڵێ و تۆپەکان دوای خۆی دەخات. وا دیارە خەیاڵەکەی پڵاو نەبووە. هەر کە بە ئەنقەست رادەوەستێ و خۆی تەواو بە چرپاکەوە دەنووسێنێ، خێرا یەکێک لە تۆپەکان بازدەداتە سەر چرپاکە. بەڵام تۆپەکەی دیکەیان، بە پێچەوانەی چاوەڕێکردنەکەی ئەم، بۆ ژێر چرپاکە دەچێ. بلۆم فێلد بە خەیاڵیشیدا نەدەهات تۆپ بتوانن لە ژێر چرپاش هەڵبەز و دابەز بکەن. بۆیە لە دەستی ئەم تۆپە نەختێک وەڕەز دەبێ. بەمەشەوە، بیر دەکاتەوە نابێ هێندەش وەڕەز بێت. لەوانەیە

ئەم تۆپە بە هەڵبەز و دابەزکردن لە ژێر چرپاکەدا باشتر لەوەی دیکەیان ئەرکەکەی خۆی ڕاپەڕێنێ. ئێستە هەموو شتێک بەوەوە بەستراوە تۆپەکان کامە شوێن بۆ خۆیان هەڵدەبژێرن، چونکوو بلۆم فێلد لای وانییە ئەم جووتە بتوانن ماوەیەکی زۆر بێ یەکتر لە کارەکەیان بەردەوام بن. لە ڕاستیشدا پاش ساتێک ئەوەی چۆتە ژێر چرپاکە بازدەداتە سەرێ. بلۆم فێلد، لەکاتێکدا هەموو گیانی پێدەکەنێ، لەبەر خۆوە دەڵێ: «گرتمن» و بە پەلە پیژامەکەی دادەکەنێ تاکوو خۆی هەڵداتە سەر چرپاکە. بەڵام بە چاوتروکانێک تۆپەی یەکەم دەچێتە ژێر چرپاکە. بلۆم فێلد، دەسخەڕۆ، گرمۆڵە دەبێ. پێدەچێ ئەم تۆپە تەنیا ویستبێتی چاوێک بەسەر چرپاکەدا بگێڕێ و لە دواییشدا حەزی بەو شوێنە نەکردبێ. ساتێک ناخایەنێ و تۆپەی دووهەمیش دوای ئەوی دیکە دەکەوێ، گومانی تێدا نییە لە ژێر چرپاکەدا دەمێنێتەوە، چونکوو ئەوێی زیاتر دەچێتە دڵ. بلۆم فێلد بە خۆی دەڵێ: «وەک دیارە ئەم دوو تەپڵکوتە هەموو ئەم شەوگارە لە ژێر چرپاکەدا دەمێننەوە.» پاشان لێوی خۆی دەگەزێ و بە سەر ڕاوەشاندن پشتی قسەکانی خۆی دەگرێ.

بلۆم فێلد دڕدۆنگە، ئەگەرچی لێی روون نییە تۆپەکان لە ماوەی شەوەکەدا تووشی چ کێشەیەکی دەکەن، خەوی قورسە و سانا دەتوانێ خۆی لەو دەنگە کزە نەبان بکات. بۆ ئەوەی خۆی لەم بابەتە دڵنیا بکات، پشت بەو ئەزموونەی فێری بووە، دوو قاڵیچە دەخزنێتە ژێر چرپاکە، چما دەیەوێ جێگەی نووستنی سەگەکەی گەرم و نەرم بکات. تۆپەکانیش وەک ئەوەی ماندوو بووبێتن، هێدی و کورتتر هەڵبەز و دابەز دەکەن. کاتێ بلۆم فێلد جارەجارە ئەژنۆی دەنێتە زەوی و بە لایتی دەستی ژێر چرپاکە ڕووناک دەکاتەوە، بە بینینی دابەزینی بێ تین و سووڕانەوەی کڕیان، دێتە سەر ئەمەی زۆر ناخایەنێ بۆ هەمیشە لەسەر فەرشەکە سەردەنێنەوە. هەڵبەت تۆپەکان بە پێی ئەرکەکەیان پاش چرکەیەک دەکەونەوە بزێوی، بەڵام لەوانەشە کاتێ بلۆم فێلد بەرەبەیان سەیری ژێر چرپاکەی کرد، دوو تۆپی بێئازاری منداڵانەی بەرچاو بکەوێ.

بەڵام دیارە تۆپەکان ناتوانن تا بەیانی خەریکی هەڵبەز و دابەز بن، چونکوو کاتێ بلۆم فێلد لە چرپاکەیدا ڕادەکشێ، چیدی دەنگیان نابیسێ. گوێ هەڵدەخات بۆ دەنگیان، لەسەر چرپاکەوە بەرەو ژێرەوەی چرپا دادەنەوێ. بەڵام نا، چ دەنگێک نایەت. ناکرێ کاریگەریی فەرشەکان هێندە بێ. تەنیا پاساوی جێگە بڕوا ئەمەیە تۆپەکان وازیان لە هەڵبەز و دابەز هێناوە. دوو شت ڕێگەی تێدەچێ: یان تۆپەکان ناتوانن لە سەر فەرشەکان باش هەڵبەز و دابەز بکەن و بۆیەشە جارێ وازیان لە بزووتن هێناوە، یان چیدی هیچ کات ناجووڵێن، کە ئەمەی دووهەمیان زیاتر ڕێگەی تێدەچێ.

لە بنەڕەتدا، بلۆم فێلد دەتوانێ هەستێ و سەرەندەری دۆخەکە بکات، بەڵام ئاسوودە لەو بێدەنگیەی لە دواییدا دەستکەوتووە، لە نوێنەکەی دەمێنێتەوە. نایەوێ تەنانەت بە سەیرکردنێکیش تۆپە کڕبووەکان هانبدات. ئەمەیە واز لە داگیرساندنی پاپپەکەش دێنێ، دەکەوێتە سەر لا و خێرا خەو دەیباتەوە.

بەڵام ئاسوودە نابێ. ئەمجارەش وەک هەمیشە نووستنەکەی بێ خەون، بەڵام نائارامە. بە درێژایی شەوگار، بەم خەیاڵەی کە کەسێک خەریکە لە درگاکەی دەدات، خەوەکەی ئاڵۆز دەبێ. کەچی باش

دەزانێ کەس لە درگا نادات، باشە دەشێ کێ نیوەشەو دەرگای ئەم ڕەبەنە تەرە و تەنیایە بکوتێ؟ ئەگەرچی لەمە دڵنیایە، هەموو جارێک رادەپەڕێ و ساتێک بە دەمی ئاوەڵا و چاوی دەرپۆقیوەوە، گوێ هەڵخستوو، چاوەڕوان، چاو لە درگاکە دەبڕێ و قژە ژاکاوەکەی بە سەر تەوێڵی شەلاڵی ئارەقەدا دەکەوێ. هەوڵدەدات بیژمێرێ بزانێ چەند جار خەوەکەی زڕاوە، بەڵام لەو ژمارە زۆرەی کۆدەبێتەوە سەرسام دەبێ و دیسان خەو دەیباتەوە. لای وایە دەزانێ دەنگی درگاکە رەگی لە کوێدایە. کەس لە درگا نادات، دەنگی ئەو کوتانانە لە جێگەیەکی دیکەوە دێ. بەڵام خەو ناهێڵێ بیهێنێتەوە بیری کە مەزەنە و بۆچوونەکەی لە کوێوە دێ. تەنیا ئەوە دەزانێ کە بڕی بێژماری لێدانی بچووک و بێزهێنەر، لەسەر یەک کەڵەکە دەبن و لە دواییدا ئەو زرمە قورس و گەورە درووست دەکەن. بە دڵ و بە گیان ئامادەیە مل بە ئازاری ئەو لێدانە بچووکانە بدات، بەو مەرجەی ئەو زرمە توندە نەمێنێ. بەڵام لە بەر هۆیەکی نادیار چیدی درەنگە و ئەو هیچی لە دەست نایەت. هەلەکە لەکیسچووە، تەنانەت چیدی نووزەشی لە زارەوە نایەت. دەمی تەنیا بۆ باوێشکی بێدەنگ دەکرێتەوە و ئەویش تووڕە رووی خۆی بە سەرینەکەدا دەکوتێ.

بەیانی زوو، بەو زەبرانەی کارەکەرەکە لە درگاکەی دەدات، بە خەبەر دێت و بە نیشانەی سەرفرازی هەناسەیەک دەردەکێشێ. بلۆم فێلد هەمیشە گلەیی لە لەدرگادانی هێواشی کارەکەرەکە کردووە. بەڵام ئەمڕۆ بە خۆشحاڵییەوە بەپیر ئەو زەبرە نەرمانەوە دەچێ. کەچی هەر کە دێت خوڵکی بکاتە ژوورێ، دەنگی لیدانی دیکەی دێتە گوێ، لێدانی خێرا و، هاوکاتی نەرمی، شەڕخوازانە. دەنگی تۆپەکانە لە ژێر چرپاکەوە دێتە گوێ. ئاخۆ ئەوان، بە پێچەوانەی ئەو، بە شەو توانای تازەیان پێدا هاتووە و ئێستا لە خەو هەستاون؟ بلۆم فێلد روو لە کارەکەرەکە دەڵێ: «چاوەڕێ بکەن». پاشان بە پەلە لە چرپاکە دێتە خوارێ، بەڵام بۆ دڵنیایی جۆرێک دەوەستێ کە تۆپەکان بکەونە پشتی. پاشان لە کاتێکدا پشتی تێکردوون، لە سەر زەوی رادەکشێ، سەری بەرەو لایەک دەگەڕێنێ، بۆ تۆپەکان دەڕوانێ، زۆری نەماوە بە دەنگی بەرز جنێو بدات. تۆپەکان هەر چۆن منداڵێکی بچووک لێفە بێزارکەرەکە لەسەر خۆی لا بدات، توانیویانە ئەو شەوە بە تەکانی بەردەوام، فەرشەکان لە ژێر چرپاکە دەربکەن و لە سەر تەختپۆشە رووتەکە دەنگەدەنگەکەیان دەست پێبکەنەوە. بلۆم فێلد بە سیمایەکی تووڕەوە دەڵێ: «بگەڕێنەوە سەر فەرشەکە» و پاش ئەوەی تۆپەکان بە چوونە سەر دوو تەختە فەرش لە هەرا دەکەونەوە، روو لە کارەکەرەکە دەنەڕێنێ: «وەرە ژوورێ». هەموو ئەو کاتەی کارەکەرەکە، ژنێکی قەڵەو و گێل کە هەمیشە رەق و ڕەپ بە رێگەدا دەڕوات، خەریکە خواردنی بەیانی لە سەر مێزەکە دادەنێ و ناوبەناو دەستێک بە ژوورەکەدا دێنێ. بلۆم فێلد، پیژامە لەبەر، لە پاڵ چرپاکەدا بە بێدەنگی و جۆرێک رادەوەستێ کە تۆپەکان نەتوانن لە ژێر چرپاکە بێنە دەر. لەگەڵ ئەمەدا چاوی لەسەر کارەکەرەکەشە بزانێ هەستی بە هیچ کردووە. بەو گوێ قورسانەی ئەوەوە، ئەستەمە گوێی لە هیچ بووبێ. لای بلۆم فێلد وایە کە کارەکەرەکە جارنەجارێک دەوەستێت، دەست بە شوێنێکەوە دەگرێ و بە برۆی هەڵتەکاوەوە گوێ هەڵدەخات، بەڵام لای وایە ئەم بەدگومانیەی هی بێخەوییە. چەند بەختی یار دەبێ بتوانێ ژنە هەڵبنێ خێراتر ئەرکەکانی

رابپەڕێنێ. بەڵام کارەکەرەکە تەنانەت لە رۆژانی پێشووش خاوترە. ناشیانە جل و چەکمەکانی بلۆم فێلد بە باوەشیەوە دەگرێ و دەیباتە ڕێڕەوەکە و ماوەیەک لەوێ دەمێنێتەوە. دەنگی تەکاندنی جلەکان ئێجگار خاو و یەکهەوایە. لەو ماوەدا کە کارەکەرە لە دەرێ سەرقاڵی خاوێنکردنەوەی جلەکانە، بلۆم فێلد بە ناچاری بێ جووڵە لەسەر چرپاکە دادەنیشێ. ئەگەر نایەوێ تۆپەکان دووی بکەون، ناچارە بێ حەزی خۆی واز لە خواردنەوەی قاوە بێنێ. جارێ هیچی لە دەست نایەت جگە لەوەی چاو لەو پەردە کێشراوانە ببڕێ کە لە پشتیانەوە رۆژێکی لێڵ و پێڵ خەریکی هەڵهاتنە.

ئەنجام کارەکەرە ئەرکی خۆی رادەپەڕێنێ. بەڵام پێش رۆشتن، ساتێک لای درگا دەوەستێ، کەمێک لێوەکانی دەجووڵێنێ و لە بلۆم فێلد رادەمێنێ. بەڵام هەر کە بلۆم فێلد بڕیار دەدات داوای روونکردنەوەی لێبکات، لە درگاکە دەچێتە دەرێ. بلۆم فێلد پێی خراپ نییە بە تەکانێک درگاکە بکاتەوە و هاواری لێ بکات و پێی بڵێ ژنێکی چەند پیر و گەوج و خڵەفاوە. بەڵام کە لە خۆی دەپرسێ لە چ شتێکی ژنە تووڕەیە، تاقە وەڵامێکی نەک زۆر ئەقڵانی بە خەیاڵیدا بێ ئەوەیە کە پیرەژنەکە بێگومان هەستی بە هیچ نەکردووە و تەنیا ویستوویەتی وا بنوێنێ بەشتێکی زانیوە. هەر ئەم یەک شەو خەوزڕانە چەندە بیر و هۆشی بلۆم فێلدی شپرزە کردووە! لە دواییدا بەو ئەنجامە دەگات کە وازهێنان لە عادەتە هەمیشەییەکەی بۆتە هۆی بێخەوییەکەی، ئەنجام دڵنیا بە خۆی دەڵێ کەی تووتن نەکێشم و ئارەق نەخۆم ، بێخەوێ سەرم لێدەدات.

لە ئێستە بە دوا، بلۆم فێلد زیاتر لە جاران ئاگای لە تەندرووستیی خۆی دەبێ و، وەک یەکەم هەنگاو لە قوتووی دەرمانی فریاکەوتنی سەرەتایی کە لە ژوور مێزی نووستنەکە بە دیوارەوە هەڵواسراوە، بڕێک لۆکە دەردێنێ و هەر دوو گوێی دەخنێ. پاشان هەڵدەستێ و بۆ تاقیکردنەوە کەمێک دەڕوات. تۆپەکان دوای دەکەون، بەڵام ئەو بە دەگمەن گوێی لە دەنگیانە.

تۆزێکی تر لۆکە دەکاتە گوێیەوە، ئێستە هیچ نابیستێ. چەند هەنگاوی دیکە دەڕوات. هیچ گرفتێک نییە. بلۆم فێلد و تۆپەکان هەر یەک خەریکی کاری خۆیانن. ئەو سیانە، ئەگەرچی پێکەوە بەستراون، بەڵام هیچ گرفتێک بۆ یەکتر درووست ناکەن. تەنیا جارێکیان کاتێ بلۆم فێلد خێراتر لە جاران دەگەڕێتەوە و یەکێک لە تۆپەکان فریا ناکەوێ خێرا خۆی رێکبخاتەوە، ئەژنۆی بلۆم فێلد بەر تۆپەکە دەکەوێ. ئەمە تەنیا بەریەککەوتنێکە روودەدات. گەر لەمە بگەڕێین، بلۆم فێلد بێخەم قاوەکەی دەخواتەوە. برسییەتی، هێند کە چما دوێنێ شەو لە باتی خەو، رێگەیەکی درێژی بڕیوە. دەست و دەم و چاوی بە ئاوی سارد دەشوا و دێتەوە سەرخۆی. پاشان جل لەبەر دەکات. تاکوو ئەم ساتە خۆی لە لادانی پەردەکان پاراستبوو، هەر بۆ پارێز پێی باشتر بوو لە کەشی نیوەڕووناکی ژوورەکەدا هەڵبکات، نایەوێ بێگانە چاوی بەم تۆپانە بکەوێ. بەڵام مادام ئێستە تەیاری چوونە دەرێیە، دەبێ بزانێ ئەگەر تۆپەکان، با بڵێین ئەگەر هات و ویستیان لە کۆڵان و شەقامیش دوای بکەون، چار چییە. بۆ چارەی ئەم کێشە، بیرێکی باشی بە خەیاڵدا دێت. درگای دۆڵابی جلەکان دەکاتەوە و پشتی تێدەکات و دەوەستێ. بەڵام تۆپەکان چما زانیبێتیان چی لە خەیاڵە، خۆ لە چوونە نێو دۆڵابەکە دەپارێزن و لە کەشی نێوان بلۆم فێلد و دۆڵابەکەدا لە هەڵبەز و دابەز بەردەوام

دەبن، ئەگەریش پێویست بێ، بۆ چرکەیەک دەچنە نێوەوە و خێرا لە تاریکایی ئەو ناوەوە رادەکەنە دەرێ. بە هیچ کلۆجێک ئامادەنین بچنە نێو دۆڵابەکەوە، تەنانەت ئامادەن لە ئەرکەکەیان لابدەن، کەچی ساتێک چییە لە بلۆم فێلد دانەبڕێن. بەڵام فێڵی تۆپەکان چیدی سەرناگرێت. چونکوو ئێستە بلۆم فێلد خۆی هەنگاو بە هەنگاو پشتا و پشت دەچێتە نێو دۆڵابەکە، تۆپەکانیش ناچارن لەگەڵی برۆن. بەڵام بەم جۆرە تووشی ئەو چارەنووسە دەبن بۆیان نووسراوە. چونکوو تەختی دۆڵابەکە پڕە لە کەل و پەلی ورد و درشتی وەک پووت، قوتووی بەتاڵ و جانتای گەورە و بچووک. بلۆم فێلد بە داخەوەیە کە بریا ئەم شتانە رێک و پێک دانەنرابان، بەڵام دڵنیایە لە هەر حاڵدا کێشە بۆ تۆپەکان دروست دەکەن. بلۆم فێلد کە لە کاتی چوونە نێو دۆڵابەکەوە دەرگاکەی کپ کردووە، لەپڕ بە بازێکی بەرز، کە دەمێک ساڵە لێی نەبینراوە، لە دۆڵابەکە دەردەپەڕێ، درگاکە پێوە دەدات و کلیلی دەدات. ئێستە تۆپەکان کەوتوونەتە داوەوە. لای خۆی دەڵێ «براپەوە» و ئارەقەی هەنیەی دەسڕێ. ئای لەو هەرایەی تۆپەکان لە دۆڵابەکەدا ناویانەتەوە! دیارە بێهیوا پەل دەکوتن. بلۆم فێلد، بە پێچەوانەی ئەوانەوە، رازی و کەیف خۆشە. لە ژوورەکە دێتە دەرێ و لە رێڕەوە چۆڵ و بێ رۆحەکەدا هەستێکی باشی هەیە. لۆکەکانی گوێی دەردێنێ و لە دەنگە دەنگی بەخەبەر هاتنی بەرەبەرەی ماڵەکە شادی دایدەگرێ. هێشتا سەرلەبەیانە و هاتوچۆ زۆر دەستی پێنەکردووە.

لە خوارەوە، لە بەر درگایەکی بچووکدا کە بە سەر شوقەی ژێر پلیکانی کارەکەرەکەدا دەکرێتەوە، کوڕە بچووکە دە ساڵانەکەی ژنەکە وەستاوە. لە هەموو لایەنێکەوە چۆتەوە سەر دایکی. هیچ کام لە ناشیرینیەکانی دایکە لە سیمای کوڕەدا لەبیر نەکراوە. کوڕە، دەست لە گیرفانی پانتۆڵ و بە لاقی لار و گێڕەوە لەوێ وەستاوە و سیخەی سینگی دێت. ئاخر بەم تەمەنەوە نەخۆشی گواترەیەتی و هەناسەی توندە. بلۆم فێلد بە پێچەوانەی هەموو جار کە تا دەگەیشتە ئەو منداڵە پێی هەڵدەگرت بۆ ئەوەی کەمتر مەجبوور بێ سەر و سەکوتی ببینێ، ئەمجارەیان بە خەیاڵیدا دێت کەمێک لای بمێنێتەوە.

ئەگەرچی ئەم منداڵە لە زگی ئەو ژنە هاتۆتە دەر و هەموو تایبەتمەندییەکانی ئەوی لەگەڵە، بەڵام لەدواییدا منداڵە و ئەم سەرە ناقۆڵایە جگە لە بڕێک خەیاڵی منداڵانە چی دیکەی تێدا نییە. ئەمەشە گەر کەسێک بە زمانێکی ساکار بانگی بکات و شتێکی لێ بپرسێ، بێگومان بێگەرد و بە ئەدەب و دەنگێکی ناسکەوە وەڵام دەداتەوە. تەنانەت گەر مرۆڤ زۆر بۆ خۆیشی بهێنێ، لەوانەیە بتوانێ بە گۆناش بیلاوێنێ. بلۆم فێلد لەم بیرانەدایە، کەچی بەمانەشەوە دەدات بە پاڵ کوڕەدا و دەڕوات. کە دەگاتە کۆڵان، دەبینێ هەوا لەوە خۆشترە لە ماڵەوە گریمانی کردبوو. مژی بەرەبەیان هێدی هێدی دەڕەوێتەوە. بایەکی تاڕادەیەک توند ئاسمان گەسک دەدات و چەند پەڵەیەک لە شینایییەکەی دەر دەخات. ئەمڕۆ بلۆم فێلد بە هیممەتی تۆپەکان زۆر زووتر لە جاران لە ژوورەکەی دەرپەڕیوە و تەنانەت رۆژنامەکەی بێ خوێندنەوە لە سەر مێزەکە جێهێشتووە. بە هەر جۆرە بێ، ئەورۆ دەرفەتی بەقەد پێویست هەیە و دەتوانێ هێواشتر بڕوات. سەیر ئەوەیە بە دابڕان لە تۆپەکان هەست بە چ مەترسییەک لەلایەن ئەوانەوە ناکات. تا ئەو کاتەی تۆپەکان لە دووی بوون، لەوانەبوو

هەندێ کەس بە بەشێک لە ئەویان بزانن و لە هەڵسەنگاندنیدا ئەوانیش بەجۆرێک لەبەرچاو بگرن. بەڵام ئەو دوانە ئێستە چ نین جگە لە یاریلەیەکی بچووک لە جلدانی ژوورەکەدا. لەم ساتەدا بیرێک بە مێشکی بلۆم فێلددا دێت. رەنگە باشترین رێگە بۆ بێ ئازارکردنی تۆپەکان ئەوە بێ بۆ ئەو شتە بەکاریان بێنێ کە بۆی کراون. کورە هێشتا وەستاوە. بلۆم فێلد تۆپەکان دەداتە ئەو، نا، بە قەرز نا، بەوپەڕی دڵنیاییەوە بە دیاری پێیدەدات و ئەمەش رێک مانای دەرکردنی حوکمی نەمانی تۆپەکان دەبێ. تازە ئەگەر بە دەستی کوڕەشەوە زیندوو دەرچن، چیدی ئەو گرنگایەتیەیان نامێنێ کە لە نێو دۆلابی ماڵەکەدا هەیانە. هەموو دانیشتوانی بیناکە دەبینن کوڕە چۆن یارییان پێدەکات. منداڵانی دیکەش دێنە پاڵی. ئەمەی کە تۆپەکان کەرەسەی یاریین نەک هاوڕێی هەمیشەیی بلۆم فێلد، یەکسەر دەبێتە بڕوای گشتی. بلۆم دەگەڕێتەوە ماڵێ. کوڕە لە پلیکانەکان چۆتە خوارێ و زۆری نەماوە دەرگای بیناکە بکاتەوە. بلۆم فێلد ناچار دەبێ بانگی بکات و ناوەکەی، کە وەک هەموو ئەو شتانەی کە پێوەندییان بەوەوە هەیە، گاڵتەجاڕییە، بە زماندا بێنێ، بۆیە بانگ دەکات:» ئالفرێد، ئالفرێد.» کورە تاوێک درِدۆنگ دەبێ. بلۆم فێلد گازی دەکات: «وەرە بۆ ئێرە — دەمەوێ دیارییەکت بدەمێ». دوو کچ، کە کچی پاسەوانی بیناکەن، لە دەرگاکەی بەرامبەرەوە دێنە دەرێ و لەم شان و ئەو شانی بلۆم فێلددا دەوەستن. ئەو دوانە زووتر لە کورە تێدەگەن باسەکە چییە و نازانن ئەو بۆ چی هەی پێی لێناکات. هەردووکیان بە دەست راشەکاندن بۆ هاتن هانی دەدەن و هاوکات چاویش لە بلۆم فێلد هەڵناگرن. بەڵام ناتوانن بزانن چ جۆرە دیارییەک چاوەڕێی ئالفرێد دەکات. حەز بۆ زانینی دیاریەکە ئازاریان دەدات و کێچیان کەوتۆتە کەوڵ. بلۆم فێلد بەوان و بە کوڕەش پێدەکەنێ. چما کورە ئەنجام تێگەشتووە چ باسە و ئێستە هەڵتەک هەڵتەک و رەق و رەپ بە پلیکانەکاندا سەردەکەوێ. تەنانەت لە رۆشتنیشدا ئینکاری پێوەندیی خۆی لەگەڵ دایکی ناکات. وەکی تر، چەند ساتێکە سەر و مێقلی کارەکەرەش لە پاڵ دەرگای بیناکەدا دەرکەوتووە. بلۆم فێلد بە دەنگی بەرز قسە دەکات. مەبەستی ئەمەیە کارەکەرەکەش گوێی لە وتەکانی بێ و گەر پێویست بوو ئاگای لێبێ کورە داواکەی ئەو تەواو بەجێ بێنێ. دەڵێ: «لە سەرێ لە ژوورەکەم، دوو تۆپم هەیە. حەز دەکەی بیاندەم بە تۆ؟ « کورە تەنیا دەمی خوار دەکات و نازانێ دەبێ چۆن وەڵام بداتەوە. ئاوڕ دەداتەوە و بە چاوێکی بە پرسیارەوە لە دایکی رادەمێنێ. بەڵام کچەکان خێرا لە دەوری بلۆم فێلددا دەستدەکەن بە هەڵبەز و دابەز و داوای لێدەکەن تۆپەکان بدات بە ئەوان. بلۆم فێلد پێیان دەڵێ: « ئێوەش دەتوانن یارییان پێ بکەن»، بەڵام حەزدەکات چاوەڕێی وەڵامی کورە بکات. ئەو دەتوانێ دەستبەجێ تۆپەکان بدات بە جووتە کچەکە، بەڵام دەزانێت ئەوان کەمتەرخەمن و زیاتر بڕوای بە کورەکەیە. لەم ناوەدا، بێ ئاڵوگۆڕی هیچ وشەیەک، دایکە لە کورەی گەیاندووە چی بکات. بۆیە کورە ئەمجارەیان بە سەر وەڵامی ئەرێنی بە پرسیاری دووبارەی بلۆم فێلد دەداتەوە. بلۆم فێلد باش دەزانێ کە بۆ ئەم دیارییە کەس سپاسی ناکات، بۆیە بە هیوای نابێ و روو لە کورە دەڵێ: « کەواتە باش گوێ بگرە. دایکت کلیلی ژوورەکەمی لایە. بڵێ پێتی بدات. ئەمەش کلیلی دۆلابەکە. تۆپەکان لە دۆلابەکەدان. کە بردتن، دەرگای دۆلاب و ژوورەکە باش قوفڵ بکە. هەر چیەکیشت پێ

خۆش بوو دەتوانی لە تۆپەکانی بکەی. نامەوێ بیاندەیتەوە بە من. تێگەشتی چیم وت؟ «. بەڵام بە داخەوە کوڕە تێنەگەشتووە، بلۆم فێلد دەیەویست زۆر بە روونی کوڕە تێبگەیەنێت، بۆیە هەر شتێکی چەند جار دووپاتکردەوە و ناوی ژوور و دۆلاب و کلیلی چەندجار هێنا. ئەنجامەکەش ئەمە بوو کوڕە ئەوقی بووە و نەک وەک کەسێکی خێرخواز، بەڵکوو وەک کەسێک کە وڕی کردووە سەیری دەکات. بەڵام کچەکان زۆر زوو لە هەموو شتێک تێگەشتوون، ئەمەشە ئامبازی بلۆم فێلد دەبن و دەستیان بۆ کلیلەکە دێننە پێش. بلۆم فیلد دەڵێ: «پەلە مەکەن». لە هەموویان تووڕەیە. کاتیش خێرا تێدەپەڕێ و ئەو چیدی دەرفەتی زۆری بە دەستەوە نەماوە. چەند باش دەبوو ئەنجام کارەکەرە دەمی بکردایەتەوە و بیگوتایە لە قسەکانی تێگەشتووە و کارەکان بۆ کوڕە ڕێکدەخات. بەڵام هێشتا لە خوار پلیکانەکانەوە وەستاوە، وەک هەموو کەڕەکان بە شەرم و حەیاوە بزە دەیگرێ و لەوانەشە وابزانێ لەو سەرە بلۆم فێلد بە دیتنی کوڕەکەی ئەو شاگەشکە بووە و خەریکە خشتەی لێکدانی لێدەپرسێتەوە. خۆ بلۆم فێلدیش ناتوانێت لە پلیکانەکان بچێتە خوارێ و بەدەم پاڕانەوەوە بە گوێی کارەکەرەدا هاوار بکات و داوای لێبکات کوڕەکەی لوتف بفەرموێ و لەبەر خودا لە بەڵای ئەو تۆپانە رزگاری بکات. تا ئێرەش ئەو کەم زۆری بۆ خۆی نەهێناوە کلیلی دۆلابی جلەکانی بۆ یەک رۆژی رەبەق بداتە دەستی ئەم خێزانە. ئەمەی کە دەیەوێ کلیلەکە بداتە دەستی کوڕە و نایەوێ لەگەڵی بچێتە سەر و لەسەرێ تۆپەکانی پێ ببەخشێت، هی کەم لەشی نییە. ئاخر ئەو ناتوانێ لەو سەرە تۆپەکان بدات بە کوڕە و کە ڕێکەوت، زۆر لەوانەیە ببینێ بە دوای خۆیدا کێشیان دەکات و کوڕە دەست بەتاڵ ماوەتەوە. بۆیە جارێکی تر هەوڵدەدات کوڕە لە قسەکانی خۆی تێبگەیەنێ، بەڵام لە بەرامبەر روانینی ئەوقی کوڕەدا رستەکەی تەواو ناکات و بە تووڕەییەوە دەپرسێ « دیسان تێنەگەشتی چیم وت؟ «. بەم روانینە وڕماوەوە کار ناڕوات. نیگایەکی وەها بەتاڵ لەوانەیە مرۆڤ بە لاڕێدا ببات و وابکات زیاد لە حەزی خۆت قسە بکەیت، بەڵکوو بتوانی ئەم بۆشاییە بە کەمێک وشیاریی پڕ بکەیتەوە.

کچەکان دەڵێن: « ئێمە تۆپەکانی بۆ دێنین .» مێشکی ئەوان باش کار دەکات و زانیویانە تەنیا لە رێگەی کوڕەوە دەتوانن بگەنە تۆپەکان، بەڵام دەزانن بۆ نێوانگیریی کوڕەیش دەبێ هەوڵ بدەن. لە ژووری پاسەوانەکە دەنگی کاتژمێر بەرز دەبێتەوە و بلۆم فێلد ئاگادار دەکاتەوە کە دەبێ خێرا بکات. بلۆم فێلد دەڵێ: «دەی ئەمە کلیلەکە.» بەڵام بەر لەوەی دەستی بباتە پێش، کچەکان کلیلەکەی لە دەست دەرفێنن. ئەگەر بلۆم فێلد توانیبای کلیلەکە بداتە کوڕە، پتر هەستی بە دڵنیایی دەکرد. سەرەڕای ئەمەش، بە کچەکان دەڵێ: « کلیلی ژوورەکەش لەو خانمە وەرگرن. کە تۆپەکانیشتان هەڵگرت، هەردوو کلیلەکەی پێ بدەن. « کچەکان بە دەنگی بەرز دەڵێن: « باش، باش.» و بەپەلە بە پلیکانەکاندا بەرەو خوار دەڕۆن. ئەو دوانە ئاگاداری هەموو شتێکن، بەڕاستی هەمووی، بلۆم فێلد کە دەڵێی حەپۆلیی کوڕە لێی داوە، سەرسامە کە ئەو جووتە چۆن توانیویانە بەو خێراییە لە هەموو روونکردنەوەکانی بگەن.

زۆری پێ ناچێ کچەکان لە خوارێ چنگاوژی داوێنی کارەکەرە دەبن، بەڵام بلۆم فێلد ئەگەرچی

حەز دەکات، بەڵام چاوەڕێی ناکات بزانێ ئەو جووتە ئەرکەکەیان چۆن رادەپەڕێنن. درەنگی کات تەنیا هۆیەکە لە چاوەڕێنەکردنەکەی. هۆکەی دیکەی ئەوەیە نایەوێ کاتی بەربوونی تۆپەکان لەوێ بێ. با بڵێین، تەنانەت پێی باشترە بەر لەوەی کچەکانی سەرێ درگای ژوورەکە بکەنەوە، چەند کۆڵانێک لە ماڵێ دوور بکەوێتەوە. خۆ نازانێ تۆپەکان شتی چۆنیان لە دەست دێت. بۆیە بەم بەیانە زووە بۆ دووهەمجار لە ماڵ دەردەپەڕێ. بەڵام بەر لە رۆشتن ئاگای لێیە چۆن کارەکەرە ململانێ لەگەڵ کچەکان دەکات و کوڕە چۆن پێیە خوار و خێچەکانی دەجووڵێنێ بۆ ئەوەی فریای دایکی بکەوێ. بلۆم فێلد ناتوانێ لەوە تێبگات بۆ چی بوونەوەری وەک ئەو کارەکەرە لە سەر زەوی دەژین و گەورە دەبن و منداڵ دەخەنەوە.

بلۆم فێلد رێگەی ئەو کارگەی دروونە دەگرێت کە کاری تێدا دەکات. لە رێگەدا باس و خواسی کارەکەی بەرەبەرە هەر بیرێکیتری لە مێشک دوور دەکەنەوە و وادەکەن خێراتر هەنگاو هەڵبگرێ. ئەنجام، وێڕای ئەو دواکەوتنەی گوناهەکەی لە ئەستۆی کوڕە بوو، پێش هەموان دەگاتە شوێنی کارەکەی. نووسینگەکەی شوێنێکە چوار دەوری شووشەیە کە مێزی نووسینی و دوو کورسیی قاچ بەرز بۆ دوو شاگردەکەی ژێر دەستی تیایدا جێگە کراوەتەوە. ئەم دوو کورسیە هێند بچووک و باریکن چما بۆ منداڵی قوتابخانە کراون، بەڵام چونکوو نێو نووسینگەکە زۆر تەسکە، جووتە شاگردەکە بۆیان نییە دابنیشن، چونکوو لەو کاتەدا کورسیە ئاسوودەکەی بلۆم فێلد جێگەی نابێتەوە. ئەمەشە ئەو دوانە تەواوی رۆژ هەموو قورسایی لەشیان دەخەنە سەر کورسیەکان و بە پێوە دەوەستن. گومانی تێدا نییە بەپێوە وەستان بۆیان ئەستەم و ناخۆشە، بەڵام لەلایەکی دیکەشەوە وا دەکات بلۆم فێلد نەتوانێ بە باشی چاودێرییان بکات. زۆرجار بە تاسەوە بە کورسیەکانەوە دەنووسێن، بەڵام نەک بۆ کارکردن، بەڵکوو بۆ ئەوەی دەیانەوێ پێکەوە چپەچپ بکەن یان بۆ وەنەوزدان. کەم دیق ناکەنە دڵی بلۆم فێلدەوە. کارێکی کەم بە بلۆم فێلد نەسپێردراوە و ئەو جووتە لە راپەڕاندنیدا بەقەد پێویست یارمەتیی نادەن. بەرپرسایەتی هەموو ئاڵوگۆڕە دراڤی و کاڵاییەکان لەگەڵ ئەو ژنانەی لە ماڵێ بۆ کارگە کار دەکەن، لە ئەستۆی بلۆم فێلدە.

ئەرکی ئەم ژنانە ئەوەیە هەندێ کاڵای وردتر بۆ کارگە بەرهەم بێنن. بۆ تێگەشتن لە بڕی ئەو کارەی بە بلۆم فێلد سپێردراوە، دەبێ چاوێک بە کۆی چالاکیەکانی کارگەکەدا بخشێنێ. بەڵام پاش ئەوەی چەند ساڵێک پێشتر بەرپرسە راستەوخۆکەی بلۆم فێلد مرد، چیدی کەس بە تەواوی ئاگاداری پێوەندییە گشتیەکانی کارگەکە نییە. بۆیەش بلۆم فێلد لای وایە کەس لەو ئاستەدا نییە کارەکەی هەڵسەنگێنێ. بۆ نموونە، ئاغای ئۆتۆماری خاوەن کارگەکە، بە ئاشکرا کارەکەی بلۆم فێلد سووک دەکات. بێگومان ئەو باش بەو زەحمەتانە دەزانێ بلۆم فێلد لەو بیست ساڵەدا بۆ کارگەکە کێشاویەتی و، ئەم ئەمەکناسیەشی تەنیا لە ناچاری نییە، بەڵکوو لەبەر ئەوەشە رێزێکی زۆری بۆ بلۆم فێلد وەک پیاوێکی بەوەفا و جێگەی متمانە هەیە. بەڵام، سەرەڕای ئەمانەش، کارەکەی ئەو سووک دەکات. چونکوو پێی وایە دەکرێ کارەکەی ئەو سادەتر و لە هەموو بارێکەوە بە قازانجتر جێبەجێ بکرێ. هەندێ، کە قسەکەیان لە راستیش دەچێ، دەڵێن ئۆتۆمار تەنیا لەبەر

ئەوە بەدەگمەن لە شوێنی کارەکەی بلۆم فێلد دەردەکەوێ کە بە بینینی چۆنیەتی کارکردنەکەی وەڕەز نەبێ. گومانی تێدا نییە بلۆم فیلّد زۆر لەو زولّمەی دەرهەقی دەکرێت ناڕەحەتە. بەڵام چی لە دەست دێت. جا خۆ ئەو ناتوانێ ئۆتۆمار ناچار بکات رەبەق مانگێک لەو بەشە بمێنێتەوە کە ئەو کاری تێدا دەکات، سەرپەرشتی ئەو کارە جۆرا و جۆرانە بکات کە لەو بەشە دەکرێ، شێوە بەرواڵەت باشترەکانی خۆی تاقی بکاتەوە و پاش ئەوەی بەشەکە لە بن و بنچینەوە هەڵتەکێ، ئەوسا مل بەوە بدات کە بلۆم فێلد راست دەکات. هەر لەبەر ئەمەیە بلۆم فێلد بێ هیچ دوودڵییەک وەک رابردوو کارەکەی خۆی دەکات و کە جارجارەش سەر و گوێلاکی ئۆتۆمار دەردەکەوێ، کەمێک دەلەرزێ، بەڵام دواتر وەک بندەستێک بە پێی ئەرکەکەی هەوڵدەدات لە کاتێکی کورتدا هەندێ شت سەبارەت بە شێوازی خزمەتکارییەکەی خۆی بە عەرز بگەیەنێ. بەڵام ئۆتۆمار هەموو جارێک بێ ئەوەی سەر هەڵبێنێ، کپ و کپ سەر دەجووڵێنێ و دوور دەکەوێتەوە. لەم کاتانەدا ئەوەی زیاد لە نەناسراویی تواناکەی بلۆم فێلد ئازار دەدات، وێناکردنی ئەو رۆژەیە بەناچار واز لە کار بێنێ و پاشان کارگە تووشی ئاژاوەیەکی گەورە بێت و کەسیش هیچی لە دەست نەیەت. چونکوو لە هەموو ئەو کارگەدا کەسی پێ شک نایەت بتوانێ جێگەکەی ئەو پڕ بکاتەوە و لانیکەم ئەوەندە دەرەقەتی ئەرکەکەی ئەم بێت کە کارگەکە لە چەند مانگدا تووشی گرفتی گەورە نەبێ. بەڵام دیارە کاتێ سەرۆک کەسێک بە سووک دابنێ، زۆر پێدەچێ کەسانی دیکە لەم کارەدا پێش سەرۆک بکەون. هەر ئەمەشە کە هەموو فەرمانبەران کارەکەی بلۆم فێلد بە سووک دەزانن.

کەس پێی وانییە بۆ تێگەشتن لە وردەکاریی کارەکان دەبێ ماوەیەک لە بەشەکەی بلۆم فێلد بمێنێتەوە. کە فەرمانبەری تازەش دادەمەزرێنرێن، کەس بیری بۆ ئەوە ناچێ یەکێکیان بنێرێتە بەشەکەی بلۆم فێلد. ئەمەش وایکردوە کە نۆقسانی هێزێکی جێگرەوە لە بەشەکەیدا بە ئاشکرا دیارە. بلۆم فێلد کە پێشتر هەر خۆی و تەنیا بەیارمەتی بەردەستێکی پیر هەموو کارەکانی رێکدەخست، پاش چەندین هەفتە ململانێی بێ کۆڵدان توانی ویستەکەی خۆی بسەپێنێ و داوای کرد شاگردێک بنێرنە بەشەکەی. ئەو رۆژانە نزیکی رۆژی جارێک دەچووە نووسینگەی ئۆتۆمار و بە تاقەت و زۆرر ورد و پوخت روونیدەکردەوە کە بۆ چی بوونی شاگردێک لە بەشەکەی ئەودا پێویستە. پێویستییەکە لەبەر ئەوە نەبوو کە بیەوێ خۆی کەمتر کار بکات، ئەو نیازی ئەوەی نەبوو لە بارستای کارەکەی کەم بکاتەوە یان هەر ئامادە بوو بەشی هەرە زۆری کارەکە لە ئەستۆی خۆی بێ، بەڵام خۆزگە ئۆتۆمار بیری دەکردەوە و دەیبینی کارگەکە بە درێژایی ئەو ساڵانە چەندە گەشەی کردووە و بەشەکانی دیکە چەندە پەرەیان سەندووە. لەم ناوەدا، تەنیا ئەو بەشەی پێوەندیی بە ئەمەوە هەبوو نەبینرابوو، لە کاتێکدا کە کاری بەشەکە چەند قات ببوو. لەوانەیە جەنابی تۆتۆمار بیری نەمابێ کاتێ بلۆم فێلد لە کارگە دەستی بەکار کرد، ئەو بەشەی ئەو نزیکی دە بەرگدروی پێوە خەریک بوو، کەچی ئەورۆکە ژمارەی بەرگدروەکان لە نێوان پەنجا و شەستدا خوار و ژوور دەکات. کارێک بەم بارستاییەوە، هێزی ئینسانیی دەوێ. بلۆم فێلد دەتوانێ بەڵێن بدات کە هەموو تواناى خۆی بەکار دێنێ، بەڵام ئیتر ناتوانێ زەمانەتی ئەوە بکات پڕاوپڕ ئەرکەکانی پێ هەڵدەسوورێ.

هەڵبەت ئۆتۆمار هیچکات داواکەی بلۆم فێلد ڕاستەوخۆ ڕەتناکاتەوە. ئەو هیچکات ڕێگە بەخۆی نادات لەگەڵ فەرمانبەرێکی کۆنیدا ڕەفتاری وابکات. بەڵام هەر ئەمەی وتەکانی ئەو بە گۆترە وەردەگرێ، ئەمەی کە کاتێ گوێ لە داواکاریەکەی ئەم دەگرێ لەگەڵ کەسانی دیکە قسە دەکات، قەولی نیوە ناچڵ دەدات و پاش چەند رۆژ هەموو شتێکی بیر دەچێ، سووکایەتیە. هەڵبەت نەک بۆ بلۆم فێلد. بلۆم فێلد خەیاڵپڵاو ناکات، راستە رێز و ئەمەکناسی شتێکی باشە، بەڵام ئەم پێویستی پێی نییە و وێڕای هەموو ناخۆشیەکان، تا کەی بکرێ پڕ و پتەو لە کارەکەی بەردەوام دەبێ. لەدواییدا ئەو لەسەر حەقە و حەقیش ون نابێ، ئەگەرچی جارجار کەمێکیش دەخایەنێ. بەکورتی، ئەنجام دوو شاگرد بۆ بلۆم فێلد دیاری دەکەن، بەڵام چۆن شاگردێک! بێجامان نەکردووە ئەگەر بڵێین ئۆتۆمار هاتە سەر ئەم ئەنجامەی کە بە دانانی ئەم دوو شاگردە باشتر دەتوانێ بەشەکەی بلۆم فێلد سووک بکات، تاکوو بە ڕەتکردنەوەی داواکەی. تەنانەت پێدەچێ ئۆتۆمار تەنیا لەبەر ئەوە بەجێهێنانی داواکەی بلۆم فێلدی دوادەخست چونکوو بۆ شاگردێکی لەم چەشنە دەگەڕا و دیاریشە شتی وا زوو نادۆزرێنەوە. ئێستە بلۆم فێلد چیدی ناتوانێ گلەیی و گازندە بکات. کە گلەیی بکات، دیارە چۆن وەڵامی دەدرێتەوە: دوو شاگردیان بۆ ناردووە، ئەگەرچی ئەو داوای یەکێکی کردووە. وایە، ئۆتۆمار زۆر باش کارەکەی بەجێهێنابوو. بەمانەشەوە، بلۆم فێلد گلە و گازندەی دەکرد، بەڵام تەنیا لە داماویی و نەک لەبەر ئەوەی بە هیوا بێت شتێک لە گرفتەکەی رایی ببێت. هەڵبەت زۆریش لەسەر گلەییەکانی نەدەڕۆشت و تەنیا کە هەلێک دەڕەخسا گلەییەکانی خۆی دەکرد. وێڕای ئەمانە، زۆر زوو ئەم دەنگۆیە لە نێو هاوکارانی ناحەزیدا بڵاوبۆوە کە دەڵێن کەسێک لە ئۆتۆماری پرسیوە راستە بلۆم فێلد سەرەڕای ئەوەش کە ئەو یارمەتیە باشەی بەدەستەوەیە دیسان لە گلە و گازندە نەکەوتووە؟ ئۆتۆماریش لە وەڵامدا وتوویەتی:» بەڵێ، بلۆم فێلد هێشتا گلەیی و سکاڵای هەیە، بەڵام ئەم جارەیان بە هەق. ئەمەشە ئەو — واتە ئۆتۆمار– ئاخری رازی بووە و بەنیازە بەرەبەر بەرامبەر هەر بەرگدروویەک شاگردێک بداتە بلۆم فێلد تاکوو دەبنە شەست کەس. تەنانەت ئەگەر ئەم برەش بەش نەکات، چەند دانەیەکی دیکەش دەنێرێتە بەشەکەی و هێند لەم کارە بەردەوام دەبێ تاکوو ئەو شێتخانەیەی لە چەند ساڵ پێشترەوە لەو بەشەدا کراوەتەوە، پڕ و پتەو ببێ.» ئەگەرچی بێژەرانی ئەم تەشەرە بە باشی لاسایی ئۆتۆماریان دەکردەوە، بەڵام بلۆم فێلد دڵنیابوو ئەو خۆی هەرگیز بەو جۆرە لەسەر ئەم قسە ناکات. ئەم باسە ئەو بێکارانە هەڵیانبەستووە کە لە نووسینگەی نهۆمی یەکەم کاریان دەکرد. بلۆم فێلد گوێی بە قسە و قسەلۆکی ئەوان نەدەدا. بەڵام خۆزگە دەیتوانی هەر بەم سانایییە خۆی لە بوونی شاگردەکانیش نەبان بکات، بەڵام شاگردەکان زرپ و زیندوو بوون و لە کۆڵ نەدەبوونەوە. ئەو دوو شاگردە دوو مێردمنداڵی لاواز و زەردەڵ بوون. بە پێی بەڵگەنامەی شوناسیان وادیار بوو تەمەنی پەروەردەی زۆرەملێیان تێپەڕاندووە، بەڵام راستیەکە شتێکی جیاواز لەمە بووە. وایە، لە راستیدا ئەوان هێشتا پێویستیان بەوە بوو دایک ئاگای لێیان بێ و تەنانەت بەکەڵکی خستنە بەر مامۆستاش نەدەهاتن. هەردووکیان هێشتا نەیاندەتوانی باش بە ڕێگەدا بڕۆن و بەتایبەت رۆژانی سەرەتا بە پێوە وەستان شەکەتی دەکردن.

کەی چاویشی لێ خافڵ دەکردن، لە تاوی شەکەتی و بێهێزی پشتیان دەچەماوە و لە سووچێکدا کرووشکەیان دەکرد. بلۆم فێلد هەوڵی دەدا تێیان بگەیەنێ ئەگەر بەتەمابن لە تەوەزەلیدا بەردەوام کووڕ ببنەوە، هەموو تەمەنیان کووڕ دەمێننەوە. سپاردنی کار پێیان سانا نەبوو. جارێکیان بڕیار بوو یەکێکیان شتێک چەند هەنگاوێک بگوێزێتەوە، بەڵام هێند بە کەف و کوڵ بوو ئەژنۆی بەر گۆشەی مێزەکە کەوت و شین بوەوە. ژوورەکە پڕ بوو لە ژنی بەرگدروو، مێزەکان پڕ بوون لە کاڵای جۆراوجۆر، بەڵام بلۆم فێلد ناچاربوو واز لە کار بێنێ، کوڕەی دەم بە زریکە لەگەڵ خۆی ببات بۆ نووسینگە و برینەکەی بپێچێ. بەڵام تەنانەت ئەم کەف و کوڵەش تەنیا ڕووکەش بوو. چونکوو هەردووکیان وەک منداڵی بچووک تەنیا هەندێجار ئارەزوویان دەکرد کەمێک خۆیان دەربخەن. بەڵام زۆرربەی کات، یان تاڕادەیەک هەمیشە، هەوڵیاندەدا بە فێڵ و دەهۆ سەرنجی کەسی سەرووی خۆیان ڕابکێشن و فێڵی لێ بکەن. جارێکیان، لە کاتێکدا کاری زۆر هەڵڕژابوو، بلۆم فێلد شەلاڵی ئارەقە بە جێگەیەکدا تێدەپەڕی و بینی هەردووکیان لە نێو بەستەی کەل و پەلەکاندا خۆیان شاردۆتەوە و پێکەوە وێنە بازی دەکەن. لەو ساتەدا زۆری نەمابوو بە مشت و پێلەقە بکەوێتە وێزەیان، سزای ئەو ڕەفتارەشیان هەر ئەمە بوو، بەڵام لە هەرحاڵدا ئەم دوانە منداڵ بوون و بلۆم فێلد کەسێک نەبوو لە منداڵ هەڵبچێ. کەواش بوو، چ چارەیەکی دیکەی نەبوو جگە لەوەی بەردەوام لە تاویان خەفەت بخوات. ڕۆژانی یەکەم پێی وابوو شاگردەکان کاتی دابەشکردنی کەل و پەل ( کە کارێکی زەحمەت بوو و وریاییەکی باشی دەویست) یان لە ئاڵوگۆڕکردنی هەندێ شتدا یارمەتیدەری دەبن. لای وابوو خۆی لە ناوەڕاستی ژوورەکە لە پشت مێزەکە دەوەستێ، چاودێریی کاروبار دەکات و لێی دەپرسێتەوە، شاگردەکانیش بە فەرمانی ئەو ئەملا و ئەولا دەکەن و کەل و پەلەکان دابەش دەکەن. لای خۆی وای وێناکردبوو چاوی ئەو وێڕای هەموو وردبینیەکەی بەشی چاودێریی ئەو ئاژاوە ناکات و شاگردەکان بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکان یارمەتیی دەدەن و بەرەبەرە بە ئەزموون دەبن، بەجۆرێک کە دواتر بۆ هەر کارێکی بچووک پێویستیان بە فەرمانی ئەو نابێ و لەدواییدا ڕۆژێک فێردەبن بزانن کامە ژنی دروونکار لە کام شت و چەندەی پێویستە و هەرکامیان چەندە بە متمانە دەشێن. بەڵام ئێستە کە ئەم شاگردانەی دەبینی، تێدەگەیشت هەموو خەیاڵەکانی لەخۆڕا بووە. بلۆم فێلد زۆر زوو تێگەشت نابێ بهێڵێ لەگەڵ ژنە بەرگدروەکاندا قسە دابمەزرێنن. چونکوو ئەو دوانە لە ترسان یان لەبەر مۆنییان هەر ئامادە نەبوون لەگەڵ هەندێ لە ژنەکان قسە بکەن، بە پێچەوانەوە ئەوەی هەندێ ژنی دیکەیان هێند خۆش دەویست کە تا بەر درگا بە پیریانەوە دەچوون. ئەم ژنانە چییان ویستبا بۆیان دابین دەکردن و تەنانەت ئەگەر ژنەکان بۆیان هەبوایە شتێک لەمان وەربگرن، بە دزیەوە کەلوپەلەکەیان پێدەدان، لە قەفەزە بەتاڵەکاندا پڕوپیتاڵی بێ بەهایان بۆ کۆدەکردنەوە و، هەڵبەت هەندێ وردکە و پرتکەی بە کەڵکیشیان تێکەڵی ئەم شتانە دەکرد و بە دزی بلۆم فێلد و بە تاسە و تینەوە لە دووڕا ئاماژەیان بۆ ژنەکان دەکرد کە بڕۆن بۆ لای شتەکان. بەرامبەر بەمە، ژنەکانیش نوقڵیان دەنایە دەمیان. هەڵبەت بلۆم فێلد زۆر زوو بەری لەم سەرپێچیانە گرت. لەوە بەدوا، کەی ژنە بەرگدروەکان دەهاتن شاگردەکانی دەنارده شوێنە شوشەییەکە. ئەم کارەی بلۆم فێلد لای ئەم دوانە،

تا ماوەیەکی زۆر وەک بێدادییەکی گەورە دەردەکەوت، بۆیە ئەوانیش لاسارییان دەکرد، بە قەستی قەڵەمەکانیان دەشکاند و هەندێ جار، هەڵبەت بێ ئەوەی بوێرن سەرهەڵێنن، توند لە شوشەکەیان دەدا و بەم کارە ژنە دروونکارەکانیان تێدەگەیاند کە بلۆم فێلد چییان پێدەکات.

ئەم جووتە نازانن کارەکەیان چەند ناشیرینە. بۆ نموونە دەکرێ بڵێی هەمیشە درەنگ دێنە سەر کار. بلۆم فیلدی بەرپرسیان، لە گەنجییەوە راهاتبوو لانیکەم نیو کاتژمێر زووتر بچێتە سەر کارەکەی — هەڵبەت نە لەبەر شێلگیریی لەرادەبەدەر یان لەبەر هەست بە بەرپرسایەتی نائەقڵانی، بەڵکوو لەبەر دەست پاکی. بلۆم فێلد بە زۆری ناچارە پتر لە کاتژمێرێک چاوەڕێی شاگردەکانی بکات. بە زۆریش لەم کاتەدا نانی بەیانیەکەی بەدەمەوە دەگرێ، لە هۆڵەکەدا، لە پشتی مێزی خزمەتکارەکەوە دەوەستێ و سەیری حسێبی ژنە بەرگدروەکان لە دەفتەرە تایبەتەکاندا دەکات. پاشان زۆر زوو سەرقاڵی کار دەبێ و ئیتر هەموو شتێک لەبیر دەکات. بەڵام لەپڕ وەها رادەچڵەکێ کە بۆ ماوەیەک قەڵەمەکە لە دەستیدا دەلەرزێ. هۆکەی ئەوەیە یەکێک لە شاگردەکان هێند بە پەلە دێتە ژوورێ کە فریا نەکەوێ بە سەرەوە بە عەرزدا دەدرێ. پاشان دەستێکی خۆی بە جێگەیەکەوە دەگرێ و هەناسەسوار دەستەکەی دیکەی دەنێتە سەر سینگی. بەڵام هەموو ئەم کارانە بۆ ئەوەیە بیانوو بۆ درەنگ هاتنەکەی بتاشێ. ئەو بیانووەی دەیڵێ هێند گاڵتەجارییە بلۆم فێلد بە قەستی خۆی لە کەڕی دەدات، چونکوو گەر وانەکات ناچار دەبێ کوڕە بەڕاستی تەمێ بکات. بەڵام کە خۆی لە قسەکانی نەبان بکات، دەتوانێ چەند ساتێک لێی بڕوانێت، پاشان بە دەست ئاماژە بۆ شوێنە شوشەییەکە بکات و، سەرلەنوێ خۆی سەرقاڵی کار بکات. لەم جۆرە کاتانەدا چاوەڕێی ئەوە دەکرێ کوڕەی شاگرد بە هەڵسوکەوتی باشی سەرۆکەکەی بزانێ و بە پەلە ملی رێ بگرێ. بەڵام نا، کوڕە پەلەی نییە، قوون بادەدات و خنەخن دەڕوات، لەسەر پەنجە هەنگاو هەڵدەنێ. مانای دەیەوێ بە سەرۆکەکەی رابوێرێ؟ نە، بە نیازی شتی وا نییە. ئەوەی لە هەڵسوکەوتیدا دەبینرێ هەمان تێکەڵەی ترس و خۆپەرستیە کە توانای هەرچەشنە کردەوەیەک لە بلۆم فێلد دەستێنێ. ئەگینا چۆنە ئەمڕۆ، وێڕای ئەوەی خۆی زۆر درەنگ هاتۆتە نووسینگەکەی، دوای تەمایەرییەکی درێژ — کە زادەی وەڕەزیە لە سەیرکردنی دەفتەرچەکاندا — لە نێو ئەو تەپ و تۆزەوە کە کارەکەرە بێ ئەقڵەکە بەرپای کردووە، شاگردەکان دەبینێ کە هەڵتەک هەڵتەک لە کۆڵانەوە دێن و هێند نزیک لە یەکتر دەڕۆن چما لە باوەشی یەکتر چەقیون. چما خەریکن شتی زۆر گرنگ بۆ یەکتر باس دەکەن. ئەگەر گوتوبێژەکەشیان پێوەندییەکی بە کارەکەوە هەبێ، ئەوا دەبێ لە کاری شێوێنەردا بۆی بگەڕێی. تا لە درگا شوشەییەکە نزیکتر دەبنەوە، هێواشتر هەنگاو هەڵدەگرن. ئەنجام یەکێکیان دەسکی دەرگاکە لە مشت دەگرێ، بەڵام نایباتە خوارێ. هێشتا بە دەم پێکەنینەوە خەریکی قسەکردنن — بلۆم فێلد دەستی هەڵدێنێ و روو لە کارەکەرەکە هاوار دەکات: «دەرگاکە لە بەرێزان بکەنەوە.» بەڵام پاش ئەوەی شاگردەکان دێنە ژوورێ، بلۆم فێلد چیدی تاقەتی مشتومڕی نییە و بێ گوێدانە سڵاوەکەیان بەرەو مێزی نووسینەکەی دەچێ. خەریکی حسێب و کتێب دەبێ. بەڵام جارجار سەرهەڵدەبڕێ بزانێ شاگردەکان خەریکی چین. یەکێکیان دەست بە چاویدا دێنێ، دیارە

ماندووە. لە کاتی هەڵواسینی کۆتەکەی بە قولاپدا، هەلەکە دەقۆزێتەوە و کەمێک پاڵ بە دیوارەکەوە دەدات. لە کۆڵاندا زرپ و زیندوو دیار بوو، بەڵام نزیککەوتنەوەی دەسپێکردنی کار ماندووی کردووە. بە پێچەوانەی ئەو، شاگردەکەی دیکە حەزی لە کارە، بەڵام نەک هەموو کارێک. دەمێکە ئارەزووی لە گسکدانە. بەڵام ئەم کارە لە ریزی ئەرکەکانی ئەودا نییە. گسکدان بە کارەکەرەکە سپێردراوە. لە بنەڕەتدا، بلۆم فێلد لاری لە گسکدانی شاگردەکە نییە. بە هەر چەشنە لەوە ناچێ گسکدانی ئەو لە کارەکەرەکە خراپتر بێ. بەڵام ئەگەر بە نیازی گسکدانە، دەبێ بەر لەوەی کارەکەرە گسک بەدەستەوە بگرێ، بێتە سەر کار، نەک ئەوەی کە کاتی کار لە نووسینگە بۆ گسکدان تەرخان بکات. بەڵام مادام کوڕە قسەی راستی بە گوێدا ناچێ، خۆزگە لانیکەم ئەم کارەکەرە پیرە، کە زۆری نەماوە کوێر بێ و تەنیا لە خێری سەری بەرپرس و بەزەیی خودایە هێشتا زیندووە، بۆ جارێکیش بووە رازی دەبوو و چەند خولەک گسکەکەی دەدایە کوڕە. کوڕە نازانێ گسک بدات، کەواش بوو زۆر زوو وەڕەز دەبێ و گسک بەدەست دوای کارەکەرە دەکەوێ تاکوو گسکدانەکەی پێ بسپێرێتەوە. بەڵام، وەک دیارە، کارەکەرەکە گسکدان بە یەکێک لە ئەرکە سەرەکییەکانی خۆی دەزانێ. ئەمەشە کەی کوڕە لێی نزیک دەبێتەوە، گسکەکە توندتر لە دەستە لەرزۆکەکانیدا دەگوشێ و تەنانەت پێی باشترە نەجووڵێ و واز لە گسکدان بهێنێ بۆ ئەوەی هەموو بیر و هۆشی لای پاراستنی گسکە بێت. گومانی تێدا نییە شاگردەکە هەرگیز ناپاڕێتەوە، چونکوو دەترسێ بلۆم فێلد، کە وادیارە خەریکی ژماردنە، گوێی لە دەنگی بێ. جگە لەوەی کە پاڕانەوە بە دەنگی نزم بێهوودە دەبێ، چونکوو تا هاوار نەکەی، کارەکەرەکە هیچ نابیسێ. بۆیە کوڕە یەکەمجار سەرقۆڵی دەگرێ و دەیکێشێ. دیارە کارەکەرە دەزانێ چ باسە. بۆیە مۆڕەیەکی لێدەکات، سەر ڕادەوەشێنێ و گسکەکە دەکێشێتە دواوە و دەینووسێنێ بە سنگیەوە. پاشان شاگردە دەستەکانی وەک نیشانی پاڕانەوە لێک هەڵدەپێکێ. هەڵبەت هیوای ئەوەی نییە بە بۆڵە بۆڵ و پاڕانەوە شتێکی پێ بکرێ. پاڕانەوەکەی تەنیا لەبەر ئەوەیە حەزی کردووە بپاڕێتەوە. شاگردی دووهەم بە کەنینێکی ئارامەوە سەیری ئەو دوانە دەکات، لەخۆڕا لای وایە بلۆم فێلد گوێی لە دەنگی پێکەنینەکەی نییە. کارەکەرە، کە پەڵپ و پاڕانەوەی کوڕە هیچ نەرمی نەکردووە، هەڵدەگەڕێتەوە و لای وایە لەم دۆخەدا دەتوانێ بێ خەم گسکەکەی بخاتە کار. بەڵام کوڕە خێرا لە سەر پەنجەی پێ بازێک دەدات و بە دەستی لێکهەڵپێکراوەوە لە بەردەمیدا قوت دەبێتەوە و دەست دەکاتەوە بە پاڕانەوە. ڕوو وەرگێڕانی کارەکەرە و هەڵبەز و دابەزی کوڕە چەند جارێک دووبارە دەبێتەوە. پاشان کارەکەرەکە هەست دەکات هەر چوار لای گیراوە و تێدەگات خۆی زووتر لە کوڕە ماندوو دەبێ. هەڵبەت ئەگەر کەمێک ئەقڵی بەکار هێنابا، دەیتوانی زۆر زووتر بەم ئەنجامە بگات. بە کورتی، ئێستە بیر لەوە دەکاتەوە پەنا بۆ کەسێکی دیکە ببات. بۆیە پەنجەی بۆ هەڕەشە هەڵدەبڕێ و ئاماژە بۆ بلۆم فێلد دەکات. مانای گەر کوڕە واز نەهێنێ، لای بلۆم فێلد شکاتی لێدەکات. شاگردە تێدەگات کە ئەگەر هێشتا گسکەکەی دەوێ، دەبێ تا زووە دەست بەکاربێ، بۆیە بەو پەڕی بێشەرمییەوە دەست رادەکێشێ تا لە چنگی کارەکەرە دەریبهێنێ. هاواری نەخوازراوی شاگردەکەی دیکە مانای ئەوەیە زۆری نەماوە کارەکە یەکلایی ببێتەوە. هەڵبەت

ئەم جارەیان کارەکەرە فریا دەکەوێ هەنگاوێک بکشێتەوە و گسکەکە رزگار بکات. بەڵام ئێستە کورە واز ناهێنێ، توورە و چاو دەرپۆقیو پەلاماری دەدات. کارەکەرە دەیەوێ دەربچێ، بەڵام پێیە پەککەوتەکانی لەباتی راکردن، دەشەلێن. شاگردە پەلاماری گسکەکە دەدات و ئەگەرچی پێی ناگیرێ، بەڵام بەهۆی تەقەللای ئەمەوە گسکە دەکەوێتە سەر زەوی و لە دەستی کارەکەرە دەردێت. هەڵبەت وادیارە لە کیسی کورەش چووە. دوا بە دوای کەوتنی گسکەکە، بۆ ساتێک هەرسێکیان، کارەکەر و جووتە شاگردەکە، وشک دەبن، چونکوو وا دیارە ئەنجام بلۆم فێلد بە هەموو شتێکی زانیوە. هەر بە راستیش بلۆم فێلد سەرهەڵدەبڕێ و لە دەلاقەوە سەیری دەرەوە دەکات، جۆرێک چما تازە سەرنجی راکێشراوە. بە توورەیی چاو لە یەک بە یەکیان دەکات و لە گسکەی سەر زەویش نابوێرێ. زۆر خایاندنی بێدەنگی یان گرۆی بێهەدای کورەی بەدکار؟ دیار نییە کامیان وا دەکەن کورە دانەوێتەوە و بە سڵەوە، جۆرێک چما دەست بۆ بوونەوەرێکی زیندوو دەبات، گسکەکە هەڵبگرێ و چەند جار بە سەر زەویەکەدا راپ بکێشێت. بەڵام خێرا هەر کە بلۆم فێلد هەڵدەستێ و لە شوێنە شوشەییەکە دێتەدەر، کورە دەتۆقێ و گسکەکە فرێ دەدات. بلۆم فێلد دەقیژێنێ: «هەردووکتان بێدەنگ دەرچن بۆ لای کارەکەتان» و بە دەست ئاماژە بۆ شوێنی کارەکەیان دەکات. شاگردەکان بە پەلە رێدەکەون، بەڵام نەک شەرمەزار و چاو لە خوار. ئەوان رەق و رەپ بە پاڵ بلۆم فێلددا تێدەپەڕن و چاو لە چاوی دەبڕن، چما بیانەوێ بە تماشا لە تەمێکردنی خۆیان پاشگەزی بکەنەوە. لە کاتێکدا دەبوا بە ئەزموون فێر بووبێتن کە بلۆم فێلد لە بنەڕەتدا دەست لە کەس بەرز ناکاتەوە. بەڵام ئەو دوانە نیگەرانن و بەردەوام بێ هیچ وردییەک بە دوای ئەوەوەن مافە راستەقینە یان خەیاڵیەکانی خۆیان دابین بکەن.

## سەرچاوە:

فرانتس کافکا، بلۆم فلد، عزب میان سال، ترجمەی علی اسغر حداد، تجربە، دوم، تهران، ١٣٨٠.

# کافکا..
# ئەو یەهودییەی دونیا بە ڕەش ڕەنگ ئەکا!!

وسام الدويك
لە عەرەبییەوە: سەروەر عومەر

### فرانز کافکا

(تێکۆشان پڕم ئەکات لە شادییەک کە توانای ئەنجامدانی هەرکارێکم پێئەبەخشێ، وادیارە من لە ژێر فشاری تێکۆشاندا کۆتاییم پێنایەت ، بەڵکو لەژێر فشاری شادییدا).

بەم شێوەیە (فرانز کافکا) پێشەنگی نووسینی «کابوسییەت» لە دواین ڕۆژەکانی ژیانیدا کە زۆربەی هەرەزۆری بە نەزانراوی تێپەڕی وەک نووسەرێکی لەدایکبووی چیک، بە ئایین یەهودی و بە ئەڵمانی ئەینووسیو قسەی ئەکرد. ئەو ئەم وشانە ئەنووسێت؛ بۆئەوەی تیشک بخاتە سەر کەسێتی خۆی کە هەتاوەکو پلەی تۆقین لە خۆشیو شادی ئەترسێت.

فرانز کافکا لە ٣ی یولیۆی ١٨٨٣دا لەدایکبوو و لەهەمان ڕۆژیشدا کۆچی دوایی کرد — ڕێکەوتێکی نیشانەئامێز- دوای چلو یەک ساڵ لە شاری براگی پایتەختی چیک. کافکا هەواداری یەهودییەتی چینی ناوەند بوو کە بە ئەڵمانی ئەپەیڤین، وەختێک کاتی چوونە قوتابخانەی نزیک بوویەوە، «هێرمان»ی باوکی کە بازرگانێکی دەوڵەمەند بوو، ناردی بۆ قوتابخانەی دەوڵەتی. پاشانیش بۆخوێندنی یاسا، لە زانکۆی ئەڵمانی لە پراگ.

نزیکەکانی کافکا بەوە وەسفی ئەکەن کە لەکاتی قسەکردندا پەنای بۆ ئەندامەکانی جەستەو ڕووخساری ئەبرد. کەسێکی سادەو شەرمن بووە، بێئومێد، نائارام، نیشانەی هەرە دیاری ژیانی ئەو تووڕەییەی بوو کە بەرهەمی نیگەرانیی بوو.

«کافکا» زۆربەی ژیانی لە تەنیاییدا بەسەربرد، چیک وەک ئەڵمانی لێیان ئەڕوانی، ئەڵمانییەکان وەک یەهودیو یەهودییە ئسوڵییەکانیش وەک عەلمانی، بەڵام هەستی زۆری تەنیایی کافکا بەهۆی ئەو پەیوەندییە هەمیشە ئاڵۆزەوەبوو لەگەڵ کەسەکانی چواردەوریدا، ئیدی باوکی بێت یان دایکی یان کۆمەڵگا بە گشتی. هەمیشە هەستی بە پەستیی ئەکرد، بەڵام هیچکات هەوڵی نەداوە ئەم پەستییە بگۆڕێت، بەڵکو تەنها بە ڕیسواکردنو ڕووتکردنەوەی وازی هێناوە.

لە سێپتەمبەری ١٩١٧دا نیشانەکانی نەخۆشیی سیلی سییەکان تیایدا بەدەرکەوتن، سەبارەت بە نەخۆشییەکەی نووسیویەتی: «ئازاری سییەکان هیچ نییە، جگە لە کاردانەوەی ئازارە مەعنەوییەکانم.»

## هونەر... چارەسەری کەلێنی دەروونی یاخود کەلێنێکی گەورەتر؟

کەلێنێکی گەورە هەبوو لە پەیوەندی کافکا بە دونیاوە — دونیای چواردەورو دونیای ناوەوەی پێکەوە، ئەو دونیایەی تیایدا ئەژیا دنیایەک بوو خۆی بیناى کردبوو. دونیای نامۆیی خنکێنەر و داماڵراو لە مرۆڤایەتی. بەرهەمەکانی گوزارشت لە هەڵوێستی ئەکەن بەرامبەر دونیای دەرەوە. هەر لە تافی لاوێتییەوە کافکا گرنگی بەو کارە ئەدەبییانە داوە کە باس لە کرێکارە چەوساوەکان بە ئامێرەکان و ئەشکەنجەدراوەکانی دەستی یاساکان ئەکەن، هەر بۆیە دۆستۆفیسکی، تۆڵستۆیو گۆرکی دەخوێندەوە.

ئەدەب لای کافکا هونەری هەڵاتنە، ئەدەب بەڕای ئەو هەڵاتنە لە واقیع. نووسینە سەرەتاییەکانی تەنها ڕازونیازێکی ناخی خۆی بوون کە گوزارشتیان لە باری سەرنج و هەستەکانی ئەکرد. لەساڵی ١٩١٢دا و لە دوای نووسینی «دادگای» لەم شێوازە نووسینە دەستی هەڵگرتو دەستیکرد بە نووسینی کارە ئەدەبییە ڕاستەقینەکانی.

هەروەها کافکا بە پێشەنگی نووسینی ڕەشبینی یاخود «کابوسی» دائەنرێت، چیرۆکنووسی بەتوانای میسری یوسف الشارونی ئاوا پێناسەی ئەکات: (وێناکردنی ڕووداوە ناواقیعییەکان بە شێوازێک کە واقیعی بنوێنن، وەک ئەوەی لە کابووسدا ڕوو ئەدات).

پاڵەوان لە کارە ئەدەبییەکانیدا لە ڕووداوێکی کابوسئاسادا ئەژی، بەشێوەیەک کە وردەکارییە واقیعییەکان بەسەریدا کەڵەکە ئەبن، بەڵام بەشێوەیەکی ڕۆژانە واتە هێزێکی دیکە هەیە هەڵوێستێکی دژی بەرامبەر وەرئەگرێت. بەجۆرێک ژیانی ئاسایی ئەم کەسێتییە لەگەڵیدا، ئەگۆڕێت بۆ شتێک لە شێوەی کابوس. ئەمەش بە درەوشاوەیی لە کارە ئەدەبییە بەناوبانگەکانی کافکادا ئەیبینین، وەک « بەدگۆڕان، کرمێکی سامناک، لە ئۆردوگای سزاداندا، گەڕانەکانی سەگ، کون. هەروەها ئەو ڕۆمانانەی دوای مردنی بڵاوکرانەوە: (دادگای ١٩٢٥) ، (کۆشک ١٩٢٩).

## کارەکانی کافکا...تامی تاڵ، ڕەنگی خەڵوزو دەستلێدانی دڕک:

کارەکانی کافکا بەم جۆرەن: هەستێکی بەرزو قووڵ بە تاڵیی‌و تاریکی. لە ڕۆمانی «بەدگۆڕان»دا تێڕوانینێکی ڕەش بۆ ژیان هەیە، فەرمانبەرێکی نائومێد لە کارەکەی، بەیانی بەئاگادێتەوە ئەبینێ فشاری پێداویستییەکانی خێزانەکەی بڕستی لێبڕیوە، ئەو دایکو باوکو خوشکەکەی بەخێو ئەکات... کاتێک بەئاگادێتەوە خۆی وەک زیندەوەرێکی گەورە ئەبینێت کە لە قالۆنچە ئەچێت‌و لە سەرچاوەی نەرمونیانییەوە ئەگۆڕێت بۆ سەرچاوەی بێزاریی.

خێزانەکە هەناسەیەکی ئاسوودە هەڵئەکێشن کاتێک ئەو «زیندەوەرە» ئەمرێت، وەک بڵێی ئەو شتەی مرۆڤ بە خێزانەکەیەوە ئەبەستێتەوە پێویستی مادییە، ئەگەر نەیتوانی دابینی بکات خێزانەکەی دەستبەرداری ئەبن‌و بەرەنگاری ئەبنەوە، وەک چۆن بەرەنگاری هەر زیندەوەرێکی زیانبەخشی دیکە ئەبنەوە.

لە یەکێک لە ڕۆمانەکانی کافکادا، پاڵەوانەکەی بەبێ تاوان ئەنێرێتە گۆڕەپانی دادگا، بەڕێوەچوونی دادگاییەکەمان بە شێوازێکی ترسناک بۆ ئەگوازێتەوە. دادگاییەکە لە ژێر میچێکی نزمدا ئەنجام ئەدرێت‌و هەموو ئامادەبووان بە درێژایی کات خۆیان ئەنووشتێننەوە. پاڵەوانەکە وەک ئاژەڵێک بەرەو مەرگ پەلکێش ئەکرێت.

یەکێک لە توێژەرەوەکان ئەپرسێت: «چی وا لە کافکا ئەکات حەز لە کۆتاییە سامناکەکان بکات، بە شێوەیەک کە هەموو جارێک پاڵەوان ئەمرێت لەگەڵ جیاوازی شێوازەکانیشدا. پاڵەوانی «کۆشک» ئەکوژرێت، پاڵەوانی «دادگای» لە دارئەدرێت و پاڵەوانی «بەدگۆڕان» وەک زیندەوەرێکی سامناک ئەمرێت.

ئەمە تەنها کاردانەوەی خوێنەرێکی ئاسایی نییە، بەڵکو گۆڤارێکی فەرەنسی داوای سووتاندنی کارەکانی کافکا ئەکات، لەبەر ئەوەی بانگمان ئەکات بۆ ڕووخان‌و نائومێدی، بەڵکو ئەدیبێکی گەورەی فەرەنسی وەک «ژان ژینییە» ئەڵێت: (چ خەمێکە! هیچ شتێک لەگەڵ کافکادا ناکرێت، هەرکاتێک تاقیمکردۆتەوەو لێی نزیک بوومەتەوە هەستمکردووە زیاتر لێی دوور ئەکەومەوە). تەنانەت کار دەگاتە ئەوەی گومان لە خودی خۆی‌و لە توانای خۆی بکات بۆ تێگەیشتن، و هەڵکڕانی شتێک و لەمبارەیەوە ئەڵێت: (ئایا ئەندامێکی جەستەم کەمە؟ من باش لە نیگەرانی‌و بێزاریی کافکا تێئەگەم، بەڵام هەرگیز قەبوڵیان ناکەم).

## ئەی «کافکا» ... خەونە خوێناوییەکەت هاتە دی

کافکا وەک پێکۆڵی ئەو ڕیشە یەهودییانەی بوو، کە جیهانی ناوەوەیان پێکهێنابوو. هەروەک خوێندنەوەکانی بۆ دۆستۆیڤسکی‌و تەورات پێکیانهێنابوو، بەڵام ئەو بەتەواوەتی دووریەرێزبوو لەهەر کۆمەڵەیەکی ڕۆحی، هەروەها گەلی جولەکە لە تێڕوانینی ئەودا گەلێکی هەڵبژێردراو بوو،

بەڵام هاوکات ئەو گەلەشە کە بەر نەفرەتی خودا کەوتووە. سەرەڕای ئەوەش وای ئەبینی کە یەهود هێشتا دەستیان بەهەندێک بیروباوەڕ و ڕێوڕەسمەوە گرتووەو هەرگیز ناتوانن لە ناوەرۆکەکەی تێبگەن. بەڵام ئەمە ڕێگر نەبوو لەوەی بۆ بیروباوەڕەکەی بە وەفا بێت، کە دروستکردنی دەوڵەتێک بوو بۆ جولەکە. بەکردەوەش بەشداری لە بزووتنەوەی زایۆنیدا کرد، ڕەنگە پێی وابوبێت ئەمرێت بۆیە ویستی جەخت لە قووڵیی ڕاستگۆیی خۆی بۆ بیروباوەڕەکەی بکاتەوە و دەڵێت: (تەنانەت ئەگەر کۆچیش نەکەم بۆ فەڵەستین، ویستوومە کاتێک ئەمرم پەنجەکانم لەسەر نەخشەی ئەویَ بن).

## ئەدەب لە ڕاژەی دۆزەکەیدا

کارەکانی کافکا پڕبوون لە بانگهێشتکردنێکی ڕاشکاوانە بۆ ئەو دۆزەی باوەڕی پێی بوو، کە ئەویش دامەزراندنی دەوڵەتێکی یەهوودی بوو لەسەر خاکی فەڵەستین. ئەم باوەڕە قووڵەش ڕەنگە لەبەر زۆریی ئەو نەهاتییە دەروونیو کۆمەڵایەتییانەی بێت کە لە ڕەشبینیدا نقووم بووبوون. ڕەنگە پێی وابووبێت بەمە خۆیو گەلەکەی ڕزگاریان ئەبێت. ئایا ئەبێ کافکا لەسەر ئەم بیرتەسکیو بەرچاوتەنگییە سەرکۆنە بکرێت، یاخود ناکرێت هزرەکانی لە سیاقە مێژوویيو ئینسانییەکەی ئەو دەمەی جیابکرێتەوە کە مرۆڤایەتی تیایدا بەدەست پەرتەوازە بوونەوە ئەینالاند؟

سەرجەم ئەم پرسیارانە و جگە لەمانەش دێنە پێشەوە کاتێک چاوێک بە کارەکانیدا ئەخشێنین، بۆ نموونە چیرۆکی «چەقەڵ و عەرەب»..و چیرۆکی «یازدە عیبرانییەکە» تەنها هەر ئەمانەش نینو ئەو تەنها بە کارە داهێنەرانەکانی وازی نەهێنا، بەڵکو لە ساڵی ١٩١٨دا پڕۆژەیەکی دانا بۆ کۆمەڵەی کرێکارە بێ موڵکەکان، بەشێوەیەک کە هێڵکاری گشتی بۆ کۆمەڵەکانی کیبوتز ئەکێشا لە دەوڵەتی چاوەڕێکراوی ئیسرائیلدا، باس لەوەش ئەکرێت کە لەدوا ڕۆژەکانی ژیانیدا بەشێوەیەکی شێلگیرانە پابەند بووە بە تاوتۆێکردنی زمانی عیبری، بەڵکو پەیوەندی بە بزووتنەوەیەکی نهێنییەوە کرد کە گوزارشتی لە ئایدزایەکی یەهودیی سۆفیی ئەکرد.

کافکا هاوڕێیەکی خۆی ڕاسپارد تەواوی بەرهەمە ئەدەبییەکانی بسووتێنێت چ دەست نوس و چ چاپکراو، ئەم کارە کەوتە سەرشانی هاوڕێی نزیکیی «ماکس برود»، بەڵام برود بەجێهێنانی ڕاسپاردەکەی ڕەتکردەوەو کارە گرنگەکانی کافکای پاراست.

## هەستکردن بەبێزاریی لەپشت تەواوی نووسینە کابووسیەکانییەوە

(تۆ لەودیو تەواوی کۆژانەکانمەوەی)، کافکا بەم شێوەیە لە نامەیەکدا بۆ باوکی نووسیوەو پاشان ئەڵێت: (نەمئەتوانی ئەوەی ئەمویست بیڵێم، کاتێک بەرامبەر تۆ دەوەستاوم). ڕۆجییە گارودی لە کتێبەکەیدا «واقیعیەتێکی بێکەنار» ئەڵێت: (باوکی کافکا لە تێڕوانینی کوڕەکەیدا

وێنەیەکی بچووککراوەیە بۆ ئەو کۆمەڵگا فشارگەرەی بەرەو هەستکردن بە نامۆییت ئەباتو کەسێتیی مرۆڤ ئەخنکێنێت، نامۆیی لای مرۆڤ سەرئەنجامی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانە، کە کافکا بۆ یەکەمجار لە شێوەی پەیوەندییەکانی لەگەڵ باوکیدا ئەزموونیکرد)

بەتەواوەتی نازانین بۆچی کافکا بەم شێوەیە ڕقی لە چواردەورەکەی بۆتەوە؟ بەڵام پێئەچێت ئەمە لە بنەمادا بۆ ئەوان نەگەڕێتەوە، بەڵکو بۆ تێڕوانینی خودی کافکا بگەڕێتەوە بۆ ئەوان. سەبارەت بە هۆکاری قەیرانەکانی خۆی لەگەڵ دەوروبەردا زۆری نەنووسی، بەڵام لە گوزارشتکردن لە تووڕەیی خۆی بەسەر گەردووندا زۆری نووسیوە . وادیارە تێبینییە پەرشو بڵاوەکانی لەمەڕ دونیاکەی، ڕووناکی خستۆتە سەر ئەو کەسێتییە وەڕسەی بێزاریی ئەیکوژێ. ئەو گەردوونی چواردەوری خۆی ئاوا پێناسە ئەکات (ئەستێرەیەکی پڕ لە بیرۆکراتییەت). ئەو بەدەست ناکۆکی نێوان پیشەکەیو گرنگی پێدانە ئەدەبییەکانییەوە ئەیناڵاند. کافکا سەرەڕای ئەوەی پلەی دکتۆرای لە یاسادا بەدەستهێنا، بەڵام ڕقی لێی بوو و دەستی لێهەڵگرت، تاوەک فەرمانبەرێکی بچووک لە دەزگای بیمەی کرێکاراندا لە وڵاتی بوهیمیا کاربکات. لە ساڵی ١٩٠٨دا کافکا سەبارەت بە خوێندنەکەی ئەڵێت: (یاسام خوێند ئەمەش واتە من مێشکی خۆم تەواو ماندوو کردو خۆراکی ڕۆحم زبڵ بوو)..

ئەو ڕقی لە قوتابخانەکەی بوو کە بەرپرسیاری تەواوی پوکانەوەی تایبەتمەندییە کەسییەکانی بووە لە منداڵیدا، بۆ نموونە ئەو بە باوکی سەرسام نەبوو لەبەر تەماحو چاوبرسێتییەکەیو ئەو ستەمەی کە بەرامبەر کرێکارانی دەزگاکەی ئەیکرد، هەروەها ناوی خێزانەکەی دایکیشی بە سەرچاوەی تەواوی ستەمو ترسنۆکییەکانی کەسێتیی خۆی دائەنا.

سەرەڕای هەموو ئەمانەش سێ پەیوەندیی سۆزدارییانە کە تیایاندا شکستی هێنا. بێزارییەکەی گەیشتە ئەوپەڕی کاتێک جووڵەی ئاسایی سەعاتە بکوژەکانی ڕۆژانە پەستی ئەکرد، بە پێچەوانەی سەعاتەکەی ناوەوەی کە بە (ئەهریمەنیی لە خێراییدا) وەسفی ئەکرد. هەروەها ئەیوت: (بەڕاستی ژیانێکی دووفاقیی سامناکە، باوەڕناکەم دەروویەک هەبێت بۆ ڕزگار بوون جگە لە شێتیی).

**سەرچاوە:**

سایتی: اسلام اون لاین.نت



# نامه بۆ میلنا

فرانز کافکا
له فارسییه‌وه: ره‌ووف بێگه‌رد

ئه‌م نامانه به‌شێکی تری چالاکیی نووسینی نووسه‌ری گه‌وره‌ی چیکی فرانز کافکایه که له ماوه‌ی چه‌ند ساڵێکدا (١٩٢٠-١٩٢٤) بۆ میلنای خۆشه‌ویستی نووسیوه. ئه‌و کاته کافکا له ئه‌ڵمانیا و میلنا له نه‌مسا ژیاون، ئه‌گه‌رچی خۆشه‌ویستی نێوانیان دوور به‌دوور و تاراده‌یه‌کی زۆر پاکیزه‌یش بووه، به‌ڵام نامه‌کان ته‌ژی جۆش و خرۆش و تاسه‌و شه‌یدایین، به‌شێکن له ژیانی رۆژانه و ئه‌و خولیا و ئاره‌زوانه‌ی بۆ فه‌رهه‌نگ و کلتوور هه‌یانه. میلنا له سه‌ره‌تادا ژنی مێردار بووه و پاشان جیا بۆته‌وه، به‌ڵام کافکا ره‌به‌ن بووه و وه‌ک خۆیشی له نامه‌کاندا باسی کردوه سێ جار ویستوویه‌تی ژن بێنێت و گه‌یشتۆته قۆناغی ده‌زگیرانداری و له‌دواکاتدا په‌شیمان بۆته‌وه‌و خۆی له (داو)ی هاوسه‌رگیریه‌تی ده‌رباز کردوه. ئه‌مه‌یش خه‌سڵه‌تێکی تری جیاوازی ئه‌وه که وه‌ک پاڵه‌وانی هه‌ندێک له رۆمانه‌کانی یان نامۆن یان به‌دوای ئه‌و هۆکارانه‌وه‌ن که چاره‌نووسی نادیار بۆی دیاری کردوون و خۆیان سه‌ری لێ ده‌رناکه‌ن. کافکا له نامه‌کاندا هه‌موو شتێک بۆ میلنا ده‌درکێنێت، وه‌ک ده‌ڵێن خۆی بۆ رووت ده‌کاته‌وه‌و نهێنی لای خۆی ناهێڵێت، به راشکاوی پێیی ده‌ڵێت هه‌موو شتێک خه‌یاڵه: خێزان، هاورێ، ئیداره، شه‌قام و کۆڵان، ژن. ئه‌و ئه‌وه‌نده‌ی حه‌زی به په‌یوه‌ندی رۆحیه په‌یوه‌ندیی جه‌سته‌یی حه‌زی پێ ناکات.

سه‌ره‌تای په‌یوه‌ندی کافکا و میلنا به‌کارێکی ئه‌ده‌بی ده‌ست پێ ده‌کات، کاتێک میلنا چیرۆکێکی کافکا وه‌رده‌گێڕێته سه‌ر زمانی چیکی و ناچاره به‌هۆی نامه‌وه هه‌ندێک پرسیاری لێ بکات، ئیتر

نامەی نێوانیان لە خۆشەویستی ئەدەبەوە هەر بە پاکی و جوانیی ئەدەب دەمێنێتەوە. نامەکانی کافکا تەنیا خۆشەویستی رووتی نێوان دوو کەس نین. بەڵکو زۆر جار کافکا روو لە مانا شاراوەکانی ژیان و هەستی پڕ لە ئەندێشەی مرۆڤ و خەسڵەتی تایبەتی دەکات. یان با بڵێم لە دەقی نامەکاندا بەرجەستە بوونی هەڵوێستی هەندێک لە کاراکتەری ناو رۆمانەکانی تێدایە، بۆیە نامەکان بیروبۆچوونی روناکبیرێکی هوشیارو نووسەرێکی داهێنەرن زیاد لەوەی تەنیا نامەی خۆشەویستی بن. ئەوەی ئەم ڕاستیانە دەسەلمێنن تەنیا دەقی نامەکانن کە هیوادارم بەرەبەرە لێیان بڵاو بکەمەوە.

-وەرگێڕ-

**ئەپریل 1920**

**مران، ئونترمایس**

**پانسیۆنی ئوتوبورگ**

خاتوو میلنای ئازیز

یاداشتێکم لە پراگەوە بۆ ناردیت، دوای ئەوە لە مرانەوە یاداشتێکی ترم بۆ نووسیت. لە ڕاستیدا ئەو یاداشتانە شتێکی وایان تیانەبوو پێویست بە وەڵامدانەوەی خێرا بکات. ئەگەر بێدەنگیەکەت نیشانەی چاکی و تەندروستیتە هەر لە بەرئەمەیشە نانووسیت من لەم لایەنەوە تەواو دڵخۆشم. بەڵام لەوانەیە شتێکی تریش هەبێت — هۆی نامە نووسینەکەیشم هەر ئەمەیانە — ڕەنگە من لە یاداشتەکانمدا بە جۆرێک لە جۆرەکان تۆم ڕەنجاندبێت (ئەگەر بەو جۆرە بێت کەواتە من بە پێچەوانەی هەموو خواست و ئارەزوویەکی خۆمەوە بە چ دەستێکی دزێوەوە نامەم بۆ نووسیویت) یان لەوانەیە شتێکی لەوە خراپتر بێت، ڕەنگە نامەکەم ئەو چرکەساتەی لێ تێکدابیت کە وەک خۆت نووسیوتە خەیاڵت ئاسوودەیەو من جارێکی دی کاتم لێ تاڵ کردبێتیت. دەربارەی یەکەمیان چ قسەیەکم بۆ وتن پێ نیە، ئەمە لە من دوورە و هەرچیەک بە پێچەوانەی ئەوەوە بێت لە منەوە نزیکە. دەربارەی دوەمیشیان نامەوێت ئامۆژگاریت بکەم — جا من چۆن دەتوانم ئامۆژگاری تۆ بکەم — بەڵکوو تەنیا بە سادەیی دەمەوێت لێت بپرسم بۆچی بۆ ماوەیەک لە ڤیەنا دوور ناکەویتەوە؟ هەرچۆنێک بێت تۆ وەک کەسانی دی بێ ماڵ و حاڵ نیت، بیرت لەوە نەکردۆتەوە ڕەنگە سەفەرێکی بۆهیما توانایەکی تازەت تێ بگەڕێنێت؟ ئەگەر لەبەر هۆکاری تر کە من لێی بێ ئاگام ناتەوێت سەفەر بۆ بۆهیما بکەیت، ئەی بۆ نارۆیت بۆ شوێنێکی تر؟ تەنانەت لەوانەیە سەفەرێکی مران بۆ تۆ سەرکەوتنێک بێت. بۆیە من چاوەڕێی یەکێکم لەم دوانە. یان لەسەر بێدەنگیەکەت بەردەوامبە کە ماناکەی ئەمەیە « نیگەران مەبە، من زۆر باشم». ئەگەر وانیە چەند دێڕێک بنووسە.

**لەگەڵ دلۆڤانترین سوپاسی کافکا.**

چەند زۆر لە خۆم دەکەم ناتوانم سیمای ڕوخسارت بە ڕوونی بێنمەوە بیرم. تەنیا ئەوەندەم لەبیرە کە چۆن سەر ئەنجام لەم لاو ئەو لای مێزی چاخانەکەوە هەنگاوت ناو دوور دەکەوتیتەوە، تاقە شتێک کە هێشتا لە یادمدا مابێت ئەم دوو شتەیە: ئەندامت، جل و بەرگت.

**مران - ئەپریل 1920**

خاتوو میلنای ئازیز، تۆ خۆت لە دنیای خەمبارو وەڕزکەری ڤیەنادا بەکاری ناخۆشی وەرگێڕانەوە گیرۆدە کردووە. ئەمە لە ڕوویەکەوە کارم لێ دەکات و خەجاڵەت دەبم[1] دەبێت پێش ماوەیەک لە ولفەوە نامەیەکت[2] پێگەیشتبێت. بە کورتی ولف ماوەیەک لەمەوبەر خۆی لەبارەی نامەیەکی لەو جۆرەوە چەند مەبەستێکی بۆ نوسیم، باسەکە لەبارەی کورتە چیرۆکێکەوەیە بە ناونیشانی «مرۆڤ کوژ»[3] کە گوایا ناوەکەی لە کاتۆلۆگێکدا بڵاوبۆتەوە، من ئەو کورتە چیرۆکەم نەنووسیوە، گوایا بەدحاڵی بوونێک لە ئارادا بووە، بەڵام تێکڕا دەشێت ئەوە ڕاست بێت کە ئەم چیرۆکە گوایا بە چاکترین کورتە چیرۆک لە قەڵەم دراوە.

بەپێی دوانامەی خۆت و نامەیەکی پێشتریش وا دێتە بەرچاو کە وەک ئەنجام و بۆ هەمیشە بزۆزی و پەشێوی وازی لێ هێنابن، ئەمە مێردەکەیشت دەگرێتەوە. هیوادارم هەردوکتان وابن. لەبیرمە چەند ساڵێک لەمەوبەر، دوا نیوەڕۆی یەک شەمەیەک ویستم بە پاڵ دیواری ماڵی فرانتسنز کوایدا تێپەڕم، لەوێدا بە مێردەکەت[4] گەیشتم، باری ژیانی هێند لە من باشتر نەبوو. دوو پسپۆر هەریەکەو بە ڕێگای تەواو جیاواز و تایبەتی بەخۆی[5]، ئیتر دوای ئەوە لە یادم نیە پێکەوە گەڕابین یان بە لای یەکدا تێپەڕیبێتین. ئەم دوو شتە جیاوازیەکی وایان لە بەینا نیە. بەڵام ئەمە باسێکی کۆنە و پێویستە لە قوڵایی ڕابووردوودا ژێر گڵ خرێت. ئایا قایلیت هەر لە ماڵەوە بمێنیتەوە؟

**لەگەڵ دڵۆڤانترین سوپاسی کافکاتان.**

**مران، ئوتتەر مایس، پانسیونی ئوتوبرگ**

**ئەپریل 1920**

بارانێک کە بە درێژایی دوو ڕۆژ و شەوێک دایکردبوو هەر ئێستا وەستا، هەرچەند دەشێت ئەم ڕێکەوتە کەم تەمەن بێت بەڵام بەهەرحاڵ شایانی ئاهەنگ بۆ سازکردنە، من ئەم ئاهەنگە بە نامە نووسین بۆ تۆ دەست پێ دەکەم. بەڕاستیی تەنانەت بارانیش قابیلی ئەوەیە بەرگەی بگریت. هەرچۆنێک بێت مرۆڤ لێرە نامۆیە، لە ڕاستییا نامۆیەکی بچووک و زۆر کەم، ئەمە شتێکە دڵت تازە دەکاتەوە. ئەگەر بەڕاستیی هەستم کردبێت کە تۆیش (دیدارێکی کورت. نیمچە خامۆش و لە

حاڵێکی تەریکیدا بێگومان هەرگیز لەیاد ناکرێت) حەزت لەو نامۆبوونە هەیە لە ڤیەنا. هەرچەندە زۆر نابات ڕەنگە ئەو هەستی نامۆ بوونە لە ژێر هەلومەرجی گشتیدا تارومار بێت. وەلێ ئایا تۆیش چێژ لەو نامۆیی بوونە وەردەگریت کە لە ڤیەنادا هەستی پێ دەکەیت؟ (ڕەنگە لە هەمان کاتدا نیشانەیەکی باش نەبێت و نەبوونی چاکتر بێت لە بوونی)

ژیانی من لێرە زۆر باشە، ئەم لەشە داڵگۆشتە لەمەزیاتر توانای ئاگاداری و چاودێری کردنی نیە. باڵکۆنی ژوورەکەم بەسەر باخێکدا دەڕوانێت کە گوڵبۆتەکان هەموویان داگیرکردوەو لە کاتی پشکوتندان.

زۆر سەیرە لێرە سەوزە هەبێت. لە کاتێکدا بەڕاستیی سەرمای پراگ گەرداوەکان دەبەستێت، گوڵی بەردەم باڵکۆنەکەی من وردە وردە لە پشکوتندان. (لە هەمان کاتدا ڕوو لە هەتاو یان وەک هەفتەی پێشوو کەش و هەوایەکی تەواو هەورییە). مارمێلکە و باڵندە ئەم دووە ناتەبایە دیدەنیمان دەکەن. زۆرم حەزدەکرد تۆیش لە مران بوویتایە. بۆ دواجار نووسیوتە ناتوانیت هەناسە بدەیت. لەم وتەیەدا وێنەو ماناگەلێک لە یەکترەوە نزیکن و لە مران کەمێک ئەو دوانە ئاسانترن.

**لەگەڵ دلۆڤانترین سوپاس**

**ف. کافکاکەت.**

**مران. ئەپریل** 1920

کەواتە پەیوەندیی بە سیپەڵاکەوە هەیە. بە درێژایی ڕۆژێکی تەواو من ئەمەم لە بیری خۆمدا هێناو برد. نەمتوانی بیر لە شتی تر بکەمەوە، نەک لەبەرئەوەی خودی خۆم گوێم لە زەنگی ترسناکی نەخۆشیی بووبێت. بەپێی ئاماژەکانی خۆت لەوە دەچێت نەخۆشیەکەت بە سووکی گرتبێت. تەنانەت بەپێی ئەزموونی سێ ساڵەی خۆم دەتوانم بڵێم بەڕاستیی نەخۆشی سیل (کەم تا زۆر نیوەی دانیشتوانی ئەوروپای خۆراوا سیپەڵاکیان نەخۆشە) ئەم نەخۆشیە بۆ من چاکەی لە خراپەی زیاتر بووە، نەخۆشیەکەی من سێ ساڵ لەمەوبەر لە نیوە شەوێکدا بە لووت پژان دەستی پێ کرد. من وەک بڵێی هەستم بە جووڵەی شتێکی ناوەخت کردبێت یان گوێم لە زەنگێکی مەترسیدار بووبێت لەناو جێگاکەم هەستام (لەباتی ئەوەی وەک پاشتر پزیشک پێی وتم ڕابکشامایە) بەرەو لای پەنجەرەکە چووم، سەرم لە پەنجەرەکە بردە دەرەوە، بەرەو لای دەست شۆرەکە چووم، سەروخواری ژوورەکەم کرد، لەسەر تەختی نوستنەکە دانیشتم و بە درێژایی ئەو ماوەیە هەر خوێن لە لووتم دەهات، بەڵام هەرگیز لەوە بێ واز نەبووم، چونکە زۆر باش دەمزانی کاتێک خوێنەکە دەوەستێت دوای سێ چوار ساڵ بێ خەویی بۆ یەکەمین جار دەنووم، لووت پژانەکەم وەستا (لەوساوە تا ئێستا ئیدی جارێکی تر نەهاتۆتەوە بەلامدا) و من باقی شەوەکە نووستم. بەیانی کارەکەرەکە هاتە ژوورەکەم، من ئەوسا لە (ژون برن پالیس) ئاپارتمانێکم هەبوو، کارەکەرەکە کچێکی باش و تاڕادەیەک فیداکار بەڵام لە

ڕادەبەدەر ڕواڵەت بین بوو. کە خوێنەکەی دی وتی: «دوکتۆر تۆ زۆرت نەماوە» بەڵام حاڵی من لە هەموو کات چاکتر بوو. چووم بۆ نووسینگە و تا دوای نیوەڕۆ بۆ لای پزیشک نەچووم، پاشماوەی ڕووداوەکە هێند بایەخی نیە. دەمویست تەنیا ئەوەت پێ بڵێم کە بەڕای من نەخۆشیەکەت زەنگی ترسناک نیە، بەتایبەتی لەو لایەنەوە کە هەمیشە من واز لە بیرکردنەوە دەهێنم تا یادەوەریم بخەمە کار و، تا ئەو تازەیی و تەڕو بڕیە گوندیانەیەی لەژێر چڕی نەزاکەت و ژێریدا شاراوەتەوە ئازادی بکەم. ئەوسا بێ سێ و دوو بڵێم: نا تۆ نەخۆش نیت، ئەمە ئاگادارکردنەوەیە نەک نەخۆشیی، بەڵکو بیرۆکەیەکە دوو دڵی لەوێوە سەرچاوە دەگرێت، من لەم چرکەساتەدا دەمەوێت خۆم لە ئاماژەدان بە هەر شتێک دوور بگرم، شتگەلێکی لە بابەتی: ئاە لەیەک پێ — چا، سێو ڕۆژانە لە ٢ تا ٨ دانە و.. من ناتوانم لەمانە تێبگەم، ئەم جۆرە شتانە دەتوانرێت تەنیا بە گفتوگۆی ڕووبەڕوو تەواو ڕوون بکرێنەوە. بۆیە دەمەوێت چاوپۆشی لەم شتانە بکەم و (هەرچەند، ئەم چاو پۆشیە تەنیا لە نامەدا بێت ئەگینا مرۆڤ ناتوانێت لە بیر خۆیانی بەرێتەوە) بیرۆکەکانیشم تەنیا بەو ئاراستەیە بێت، ڕوونکردنەوەی ئەو شتانە بێت کە لەو کاتەدا و لەبارەی نەخۆشی خۆمەوە ئەزموونم کردون ڕوونکردنەوەیەک دەشێت بۆ گەلێک مەبەست ڕاست بێت. ئەوەی ڕوویدا ئەوە بوو کە ئیدی لە توانای مێشکا نەما بەرگەی ئەو پەشێوی و ئازارە بگرێت کە قورسایی لەسەر دانابوو.

مێشک وتی: «من خۆم بە دەستەوە دەدەم، بەڵام ئەگەر کەسێک پەیوەندیی بە مانەوەی تەواوی منەوە هەیە، دەبێت هەندێک لەو بارە لە کۆڵی من بکاتەوە، بۆ ئەوەی ماوەیەکی تر کارو بارەکە وەک جاران بەرەو پێش بچێت» ئەوسا سی پەلاک هەرچەندە ڕەنگە شتێکی وای لە دەست نەچێت هاتە قسە. ئەم گفتوگۆیە کە بەبێ ئاگاداری من بە نێوان مێشک و سی پەڵکدا دەڕۆشت، دەبێت چەندە ترسناک بووبێت.

ئەی ئێستا تۆ دەتەوێت چی بکەیت؟ ئەگەر کەمێک ئاگاداری بکرێیت، نەخۆشیەکەت شتێکی بچووک و بێ بایەخ دەردەچێت، وەلێ ئەوانەی پەیوەندیان بە تۆوە هەیە دەبێت لەوە بەئاگابن کە نیازی تۆ لەو کەمە چاودێری کردنەی خۆت لەبەرچیە. هەرشتێکی دی کە پەیوەندی بەم بابەتەوە هەبێت دەبێت گرنگیەکەی بخرێتە قۆناغی دوەمەوە. ئایا ناشێت لەم ڕێگایەوە تۆ کەمێک دڵنیا بیت؟

وەک پێم وتیت، من نە مەبەستم گاڵتەیەو نە بە ئەندازەی گەردیلەیەک هەست بە شادمانی دەکەم، هەروایش دەمێنمەوە تا ئەو کاتەی نامەم بۆ دەنووسیت و باس لەوە دەکەیت کە دەتەوێت چۆن چۆنی بۆ لەمەودوا ژیانت تازە و تەندروست تر بەڕێ بکەیت. پاش دوا نامەت ئیتر من لەو بابەتەوە پرسیاری ئەوەت لێ ناکەم بۆچی ماوەیەک لە ڤیەنا دوور ناکەویتەوە، من هەنووکە درکی ئەم مەبەستە دەکەم. بەڵام دەوروبەری ڤیەنایش شوێنی وا جوانی تێدایە و دەرفەتی ئەوەی هەیە چاودێریی تۆی تیا بکرێت، نامەوێت ئەمڕۆ دەربارەی شتی تر بنووسم، لەم مەسەلەیە گرنگتر شتێک نیە من بتوانم قسەی تیا بکەم. هەر باسێکی تر هەبێت بۆ بەیانی. لەوانە ئەو دەستنووسەی کە کارم تێ دەکات و خەجاڵەت دەبم و مایەی خەم و خۆشیمە. لەو بابەتە من سوپاسگوزارم، نا،

مەسەلەیەکی تریش بۆ ئەمڕۆ لە ئارادایە، ئەگەر بەهۆی وەرگێڕانەوە تەنانەت تۆ تاقە چرکەیەک واز لە خەوی خۆت بهێنیت، لە دواییدا باری نەفرەتی سەرشانی من قورستر دەبێت. لەبەرئەوەی لە ڕۆژی داوەری کردندا لێکۆڵینەوەکە زۆر ناخایانێت، بە سادەیی دەتوانین بڵێین پرسیاری ئەو ڕۆژە پرسیارە لەوەی کە ڕوویداوە: ئەو (کافکا) ئەوی (میلنا)ی لە خەو کردووە. لە داوەریی داهاتووی ئەم مەسەلەیەدا من دەبمە تاوانبار و هەمیشە وادەبێت، بۆیە هەرکاتێک داوات لێ دەکەم کە ئیدی کاری وەرگێڕان نەکەیت، دەزانم هەوڵی بێ هوودە دەدەم.

**فرانتس کافکاتان**

**مران، کۆتایی ئەپریل 1920**

**خاتوو میلنای ئازیز**

حەزدەکەم ئەمڕۆ لەبارەی شتگەلێکی ترەوە بنووسم بەڵام چ سوودی هەیە، نەک لەبەرئەوەی ئەم جۆرە مەسەلانە بۆ من جێ باسێکی جیدی بن، چونکە ئەگەر وابوایە شێوازی نووسینەکەم جیاواز دەبوو، بەڵام دەبێت لە شوێنێکدا، لە باخێکدا، کورسیەکی سەفەری کە نیوەی لە سێبەردا بێت، بۆت فەراهەم بهێنرێت و دە دانە پەرداخ شیر لەبەردەستاندا بێت. ئەم شتە بەتایبەتی ئێستا لە هاوینی ڤیەنایشدا دەشێت بەدەست بهێنرێت. بێ برسیەتی و ناڕەحەتی، ئایا ئەمە دەلوێت؟ ئایا کەسێک نیە ئەمە بڕەخسێنێت. ئەی دوکتۆر دەڵێ چی؟

کاتێک دەستنووسەکەم لە زەرفە پۆست کراوە گەورەکە دەرهێنا، تا ڕادەیەک نائومێد بووم، ئەوەی من خوازیاری بیستنی بووم هەواڵی تۆ بوو، نەک ئەو دەنگە لە ڕادەبەدەر ناسراوەی لە قووڵایی ئەو گۆڕە کۆنەوە[٦] دەهات. بۆ ئەم دەستنووسە کەوتۆتە بەینمانەوە؟ پاشان وام بەخەیاڵدا هات کە خودی ئەم دەستنووسەیش ڕۆڵی نێوان گیری لە نێوان من و تۆدا بینیوە. بێجگە لەمە من بڕوام نەدەکرد تۆ زەحمەتێکی وا گەورە بدەیتە بەرخۆت، من لە هەموو ئەو وەفاداری و دەستپاکیەی تۆ نیشانتداوە بە قووڵی شەمزاوم. ڕستە بە ڕستە، ئەو دەست پاکیەی من بەو ڕادەیە لە زمانی چیکدا بە مەحاڵی دەزانم و، گونجانی خەسڵەتی جوانیە سروشتیەکەی تۆ لەگەڵ کارێکی وا سەختدا. ئایا زمانی چیک و ئەڵمان تا ئەم ڕادەیە لە یەکەوە نزیکن؟ با بڵێین وایە، هەرچۆنێک بێت ئەو دەستنووسە چیرۆکێکی زۆر لاوازە، خاتوو میلنای ئازیز، من دەتوانم دێر بە دێڕ و زۆر بە ئاسانی ئەم ڕاستیەت بۆ بسەلمێنم، ئەگەرچی لەبارەی ئەم کارەوە من ئەوەندەی پێم ناخۆشە بەڵگەی بۆ بهێنمەوە لەوە زیاتر ڕقیشم لێیەتی. هەڵبەتە ئەو ڕاستیەی کە تۆ چیرۆکەکەی منت خۆش دەوێت بەهایەکی پێ دەبەخشێت، بەڵام ئەمە وێنای دنیا لەبەر چاومدا تارومار دەکات، ئیتر لەم بارەیەوە ئەمە بەسە. تۆ چیرۆکی «پزیشکی گوند» لە وڵف وەردەگریت، من نامەم بۆ نووسیوە، دڵنیابە من زمانی چیک دەزانم، زۆر جار ویستوومە لێت بپرسم بۆچی هیچ کاتێک بە زمانی چیکی نامەم بۆ

نانووسیت، مەبەستم ئەوە نیە نکوولی لەوە بکەم کە تۆ بەسەر زمانی ئەڵمانیدا زاڵ نیت، تۆ زۆر کات باڵا دەستیت لە زمانی ئەڵمانیدا سەرسورهێنە و بە چاکی دەیزانیت و هەندێک جاریش وا نیە. زمانی ئەڵمانی لە بەرانبەر تۆدا بە ویستی خۆی سەری کڕنووشت بۆ دادەنەوێنێت. ئەمە بەتایبەتی مایەی دڵنیاییە، چونکە شتێکە تەنانەت ئەڵمانیەکیش پرکێشی ناکات و چاوەڕێی بەدەستەوە هاتنێکی وا لە زمانەکەی خۆی ناکات. ئەڵمانیزمان ناوێرێ تا ئەو ڕادە شەخسیە بنووسێت، بەڵام من دەمویست تۆ بە زمانی چیکی بپەیڤیت، چونکە زمانی چیکی بەشێکە لە بوونی تۆ، لەبەر ئەوەی لەوێ، تۆ، میلنای بە هەموو بوونتەوە (وەرگێڕانەکەت پشتیوانی لەم قسانەم دەکات) لە کاتێکدا کە لێرە، تۆ میلنای خەڵکی ڤیەنایت، یان میلنایەکیت کە خۆت بۆ ڤیەنا ئامادەدەکەیت، بۆیە تکات لێ دەکەم بە زمانی چیکی بنووسیت. ئەو نووسینە پەراوێزانەی کە نووسیوتن و ئاماژەت پێ داون بۆم بنێرە. هەرچەندە بێ نرخ و لەبیر کراویش بن. تۆیش ڕێگای خۆتت لە ڕێی چیرۆکە بێ نرخەکانی منەوە کردۆتەوە، تاکەی؟ نازانم. ڕەنگە منیش لای خۆمەوە بتوانم ئەم کارە ئەنجام بدەم، ئەگەر وا نەبێت ناچارم بە هەمان دەمارگیریی هەمیشەییەوە باوەش بە شتە کۆنەکانمدا بکەم.

لەبارەی دەزگیرانداریەوە پرسیارت لێ کردبووم، من تا ئێستا دووجار (دەشێ بڵێین سێ جار، دوو جاریان لەگەڵ یەک کچدا بوو) بووم بە دەزگیران، بۆیە من تا ئێستا سێ جار کە چەند ڕۆژێکی ماوە بۆ زەماوەندەکەم خۆم لە (داو)ی هاوسەرگیری ڕزگار کردووە[٧]. دەربارەی یەکەم ئێستا کۆتایی پێ هاتووە (بیستوومە دەزگیرانی یەکەمم شووی کردووەو کوڕێکی چکۆڵەیشی هەیە) دووەمیان هێشتا ماوەو بە تواناى خۆی ماوەتەوە بەڵام بێ هیچ ڕوانینێکی ئایندە، بەو مانایەی لە کاردا نەماوەو تا ڕادەیەک بە پاڵ ئینسانەکاندا بەردەوامیی بە ژیانی سەربەخۆی خۆی دەدات. لەم لایەنەو لایەنی دیکەوە من لەوە گەیشتووم بە گشتی پیاو بەرگەی ڕەنج و ئازاری زیاتر دەگرن، یان ئەگەر بمانەوێت لە ڕوانگەیەکی ترەوە تەماشای مەسەلەکە بکەین، ئەوا پیاو کەمتر بەرەنگاری بۆ دەکرێت، بەڵام ژن هەمیشە پاکیزانە ئازار دەکێشن. ئەمە مانای وا نیە کە ئەوانیش سووچیان نیە. بەڵکو بە واقیعیترین مانای ئەمە. کە ئەمیش جارێکی تر سەرئەنجام بە (بێ سووچی) ئەوان دەشکێتەوە. وەلێ بیرکردنەوە لەم مەسەلانە بێ سوودە. لەوە دەچێت کەسێک بیەوێت لە نێو ئەو هەموو مەنجەڵە بە کوڵانەی دۆزەخدا تەنیا یەکێکیان بشکێنێت: یەکەم هەوڵی ئەو کەسە هیچ کاریگەریەکی نیە، دووەم ئەگەر کاریگەرییشی هەبێت بەو شتانەی لەناو مەنجەڵە داخەکانەوە دێنە دەرێ دەسووتێت و دەمرێت. ئەمە لە کاتێکدایە کە دۆزەخ بە هەموو هەژموون و هەیبەتیەوە بەردەوامیی بە بوونی خۆی دەدات، پێویستە مرۆڤ کاری تر بکات.

بەهەرحاڵ وەک دەستپێک لە باخێکدا بحەسێرەوە، لە ناو دڵی نەخۆشیەوە، بە تایبەتی کە نەخۆشیەکی ڕاستەقینە نەبێت، تا دەتوانیت خۆشی و شادی زیاتری لێ وەربگرە. نەخۆشیی شادمانیی زۆری تیایە.

**فرانتس کافکاکەت**

## پەراوێزەکان

1-لەو کاتەدا میلنا سەرقاڵی وەرگێڕانی کورتە چیرۆکی (توونچی (der heizer) بوو ئەم چیرۆکە لە دواییدا بوو بە ڕۆمانی «ئەمریکا» کە یەکێکە لە ڕۆمانە ناودارەکانی کافکا) کافکا لەبەرئەوەیە کە بەرانبەر بە میلنا هەست بە شەرمەزاری دەکات

2- kurt wolff بڵاوکەرەوەی بەرهەمەکانی کافکا، پێ دەچێت ئەمە ئاماژە بێت بە نامەیەک کە لەوێدا کورت وڵف باس لە وەرگێڕانی بەرهەمەکانی کافکا دەکات بۆ زمانی چیکی.

-3پێدەچێت میلنا چیرۆکی (کوشتن (dermord)ی کافکا کە لە ڕۆژژمێری شیعری نوێدا (almanch die neue dichtung) لە ساڵی ١٩١٨ لە شاری لایپزیک لەلایەن ولفەوە بڵاوکرایەوە، لەگەڵ چیرۆکی (بکوژ)ی هموادا بە هەڵە لێک درابنەوە.

4- مەبەستی Ernst pollak (١٨٨٦ – ١٩٤٧)ە کە ساڵی ١٩١٨ لەگەڵ میلنادا بوونە هاوسەر بەڵام ژیانی ژن و مێردایەتیان خراپ بوو.

5- ئەرنست پولاک پزیشک نەبوە، وەرگێڕ نازانێت مەبەستی کافکا چیە.

6- میلنا وەرگیرانی چیرۆکی «تونچی» بە زمانی چیکی بۆ کافکا دەنێرێت بۆ ئەوەی لە باری سەرنجی ئاگادار بێت، مەبەستی لەدەستنووس و ئەو دەنگە لەڕادەبەدەر ئاشنا لە قووڵایی ئەو گۆڕە کۆنەوە» ئەو مەسەلەیەیە.

7- لێرەدا کافکا باس لە دووجار دەزگیرانداریی خۆی دەکات لەگەڵ کچێکی بەرلینیدا بە ناوی فلیس باوەر felice bauer یەکەمجار لە کۆتایی مەی ١٩١٤ دووەم جار لە سەرەتای ژونی ١٩١٧. هەردوو جارەکە پەیمانی دەزگیرانیە یەک لایەنە لەلایەن کافکاوە هەڵوەشێنراوەتەوە. بەڵام دەزگیرانی سێیەمی کافکا لە پاییزی ١٩١٩ لەگەڵ کچێکی پراگیدا بوو بە ناوی ژولی وریزک Julie wohryzek، کافکا ئەوەیشی هەڵوەشاندەوە.

## سەرچاوە:

کتێبی نامەها بە میلنا

# کافکا و هاوڕێکانی

ڕەبیع جابر
لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

«کافکا» ژیانێکی کورت ژیا. لەسەر ئەم هەسارەیە تەنها چل و یەک ساڵێکی پێ ڕەوا بینرا. ئەگەر نەخۆشی سیل زەفەری پێنەبردایە، تۆ بڵێی زیاتری بنوسیایە؟ «فرانز کافکا» جەنگی جیهانی یەکەمی بەزیندویی تێپەڕاند. ساڵی ١٩٢٤ لە نەخۆشخانەیەکی دەرەوەی شاری ڤیەننا کۆچی دوایکرد. ژنی نەهێناو وەچەو بنەماڵەشی لە پاش خۆی بەجێ نەهێشت. ئایا وەچەو میراتگری لە دوای خۆی بەجێهێشت؟

«کافکا» بە دووەم جەنگی جیهانی ڕانەگەشت، ئەگەر بگەشتایە ئاخۆ بە زیندویەتی تێی دەپەڕاند؟ خوشکەکانی لە ئۆردوگاکاندا جینۆسایدکران، هاوکات زۆربەی زۆری هاوڕێکانیشی بەو دەردەچوون. «ماکس برۆد» کە میراتی ئەوی پاراست، لە مەرگ قوتاری بوو. «برۆد» خۆشبەخت بوو، خەڵکانێکی تر ئەو چانسەی ئەویان نەبوو. «کافکا» نەخۆشی سیل خنکاندنی نەگ گاز. ئەگەر بەسەلامەتی بگەشتایەتە کۆتایی دووەم جەنگی جیهانی، ئایا شتی زیاتری دەنوسی؟

دووەم جەنگی جیهانی بە مەرگەساتێکی ئەتۆمی کۆتایی هات. هەورێکی ڕەش ئاسمانی تەنی و مایە پوچی و وێرانەیی دنیا بەدەرکەوت. ڕۆژهات و چوو، خۆر دەرکەوت و با هەڵیکرد و بەهاری سەوز گەڕایەوە. ژیانی ئێمە ئاوایە. ماڵوێرانی تا سەر نییە. «کافکا» لە کاتێکدا داوای چۆڕێ ئاوی دەکرد و توانای خواردنەوەی نەبوو، بیری لەم شتانە دەکردەوە. ئەو مرد لە کاتێکدا نەگەشتبووە قۆناغی پیرێتی. مرد و هیچ بنەماڵە و میراتگرێکی لە دوای خۆیەوە جێنەهێشت. ئایا کەسی لە دوای خۆی

بەجێهێشت؟ «کافکا» چی بەم دنیایە بەخشی؟

خوێنەرانی «کافکا» چی لە «کافکا» وەردەگرن؟ ئایا ئەو شتێکی هەیە بیاندات؟ ئەگەر دەتەوێت «کافکا» بناسێت، مەچۆ بۆ «دادگا» و مەچۆ بۆ (کۆشک) و دەست مەدەرە (ئەمریکا). ڕاستە هەر جارێک ناوی «کافکا»ت بەرگوێ بکەوێ، گوێ بیستی ئەو ڕۆمانانەش دەبیت، بەڵام ئەو ڕۆمانانە «کافکا» نین. گەر بتەوێت «کافکا» بخوێنیتەوە، پێویستە لە شوێنێکی دیکەوە دەست پێ بکەیت، برۆ بۆ ڕۆژانەکانی ژیانی، بچۆ بۆ لای چیرۆک و تێکستە کورتەکانی. ئەمە سەرەتایەکی پیرۆزە. سەروەختێک «کافکا» دەخوێنیتەوە، هەست دەکەیت پێشتر ناسیوتە. ئەیناسیت و نایناسیت. ئایا ئەیناسین؟ «کافکا» بنەماڵەیەکی لە دوای خۆی جێهێشت درێژ دەبێتەوەو درێژ دەبێتەوە، بەجۆرێک باز بەسەر ساتەوەختی ئێستاماندا دەدات. (کتێبخانەی بابل) (چیرۆکێکی خۆرخە لویس بۆرخیس)ە، گەر «کافکا» نەینوسایە، ئایا ئەم چیرۆکە دەبوو؟

گەر «کافکا» نەینوسیایە، (پیدرۆ پارامۆ) (ڕۆمانەکەی خوان ڕۆڵفۆ) بونی دەبوو؟ گەر «کافکا» نەینوسیایە، (کۆتر) (ڕۆمانەکەی پاتریک سوسکەند) دەبوو؟ گەر «کافکا» نەینوسیایە، (جرج) (ڕۆمانەکەی ئەندرێ زانیۆسکی) بونی دەبوو؟ بەبێ «کافکا»، (ژیانی مایکل ک و سەردەمەکەی) (ڕۆمانەکەی ج.م. کۆیتزی) دەبوو؟ «مارکیز» دەڵێت: (سەروەختێک کافکام خوێندەوە، دەستم بە نوسین کرد). «کافکا»ی خوێندەوە، ئەو کات بۆی ئاشکرا دەبێت نوسین چۆنە. لێرەوە ئیتر دەنوسێت. «مارکیز» باوەڕ دەکات و باوەڕ ناکات. جارێکی دی لە خوێندنەوەی «خوان ڕۆڵفۆ»وە دەست پێدەکات. ئاساییشە گەر لە (ڕۆژانەی ساڵی تاعون)ی «دانیال دیفۆ»وە دەست پێ بکات. ئەو سیانە هاوڕێین. ئایا دەبێتە کوڕی ئەوان؟ ئایا «کویتزی» لە کەلەکەی «ڕۆبنسۆن کرۆزۆ»وە لەدایک دەبێت؟

«بۆرخیس» چۆن چۆنی دەبێتە وەچەی «کافکا»؟ ئەو ئەرژەنتینیە نابینایە، لە تەمەنی هەشتاو حەوت ساڵیدا مرد. بەپیری مرد. کەلە ژیاندا بوو، ڕۆمانی ئەمریکای لاتین نێوبانگ و شۆرەتی پەیدا کرد. دوای ئەوەی بە خوێندنەوە چاوەکانی کوێر بونەوە، بەردەوام گوێ بیستی ئەوە دەبوو کە ڕۆمانی ئەمریکای لاتین لە ژێر پاڵتۆکەی ئەوەوە سەری دەرهێناوە. لە ئەمریکای لاتینیدا نوسەرێک نییە، خۆی بە قەرزاربارى «بۆرخیس» نەزانێت. «بۆرخیس» ساڵی ۱۹۸٦ مرد. چەند ساڵێکی کەم بەر لە مردنی، (یادەوەری شکسپیر)ی نوسی. ئاسان نییە (یادەوەری شکسپیر) بنوسیت و لە هەشتا ساڵیت تێپەڕاندبێت. ساڵ لە دوای ساڵ مرۆڤ دیقەت و وردبینی بەرەو لاوازی دەڕوات. خەیاڵ دانیشی کاڵ دەبێتەوە، وەلێ (یادەوەری شکسپیر) مل بە یاساکانی پیربون نادات.

خوێندنەوەی «بۆرخیس»، پەیوەندی نێوان تێکستەکانی خۆرهەڵات و خۆرئاوامان بۆ ئاشکرا دەکات. پەیوەندیگەلێکی قوڵمان بۆ ئاشکرا دەکات، لە نێوان ئەوەی نوسراوەو ئەوەی دەنوسرێت. دنیای ئەدەب سنورودیوار قبوڵ ناکات. تۆ بڵێی قسەی باوکان و کوڕەکانیان قبوڵ بکات؟ «خوان ڕۆڵفۆ» کوڕی «کافکا» نیە. «کافکا» کوڕی «تۆلستۆی» نیە. «مارکیز» کوڕی «بۆرخیس» نیە. چاکتر وایە باس لە هاوڕێیەتی و دۆستایەتی بکەین. لەبری ئەوەی بڵێین (ئەوانە نەوەی

کافکان)، چاکتر وایە بڵێین (ئەوانە دۆست و هاوڕێی ئەون). هاوڕێی ئەو پیاوە بوون کە نەخۆشی سیل دەردەداری کردبوو. «کافکا» تا هەنوکەش لە ناوماندایە، دەیخوێنینەوەو دەیبینین.

«ئیسحاق سنجەر» لە شوێنێکدا بە «فیلیپ ڕۆس» دەڵێت: (خوا کە کافکای پێبەخشین، ڕەنگە لە بەرایییەکانی سەدەی بیستەمدا ١٦ کافکای پێ عەتا کردبین، بەڵام ئێمە تەنها یەک دانەیمان ناسی). (ئایا بەبێ ماکس برود، ئەدەبی کافکا تیا دەچوو؟).

«کافکا» چۆن چۆنی لە ئەدەبی هاوچەرخدا ئامادە دەبێتەوە؟ ڕۆمانی (کافکا لە کەنار) ی «هارۆکی مۆراکامی» کە بەم دواییانە وەرگێڕدرایە سەر زمانی فەرەنسی و پێشتریش کرابووە ئینگلیزی، ئاوڕ لە «کافکا» دەداتەوەو ئاوڕی لێناداتەوە. بە پێچەوانەی ئەوەی میدیای خۆرئاوا لەم ڕۆژانەدا باسی دەکات، «مۆراکامی» لەم ڕۆمانەیدا وەک خەسڵەتی هەمیشەیی سەرکەوتوو نەبوو. «مۆراکامی» بۆتە ناوێکی باو و گەورە، ئەمەش هەندێ جار بەرەو هەڵەمان دەبات.

«مۆراکامی» لە هەشتاکاندا هەندێ لە چاکترین ڕۆمانەکانی خۆی نوسی کە کاریگەریان لەسەر خوێنەر زیاتر بوو. (کۆتایی جیهان و وڵاتی سەیر و سەمەرەکان) چاپی (١٩٨٥)، خوێنەر ئەوق دەکات. ئایا ئەم ڕۆمانە لە «کافکا»وە دەست پێدەکات و دەگەڕێتەوە بۆ «کافکا»؟ ئەی پەیوەندی «کافکا» بەم ڕۆمانەوە چییە؟ چۆن چۆنی پەیوەندی (کتێبخانەی بابل) یان (کۆتر) یاخود (جرج) یان (لە چاوەڕوانی بەربەریەکاندا)، بە ئەدەبی «کافکا» وە دیاری بکەین؟ چی ئەم بەرهەمانە پێکەوە کۆ دەکاتەوە؟

ستایلێکی نۆرماڵ و توند وتۆڵ؟ ڕەنگە هەر ئەمە تاکە هۆکار نەبێت. توانای گۆڕینی شتە خەیاڵی و فانتازیەکان، بۆشتی ماتریاڵ و واقعی؟ ئەمەش ڕەنگە هەر کورت بهێنێت و بەس نەبێت. ئەی کەواتە ئەو نهێنیە چیە کە تەواوی ئەم بەرهەمانە پێکەوە کۆ دەکاتەوە؟ چ شتێ هەموو ئەوانە دەکاتە هاوڕێ: «کافکا و بۆرخیس و خوان ڕۆڵفۆ و ئیتالۆ کالڤینۆ و گابرێل گارسیا مارکیز و پاتریک سیوزکەند و کویتزی و...هتد»؟ چی ئەمانە کۆ دەکاتەوە؟

خوێنەر ئەتوانێت چەند ناوێکی تر بۆ ئەو لیستە زیاد بکات. بۆ نمونە: «هۆمیرۆس و شکسپیر». زیادکردنی ئەمەی دواییان، هیچ نهێنیەکمان بۆ ئاشکرا دەکات؟ «هاملێت» بەر لە چەند سەدەیەک سەرنجی دا کە جیهان لە کەرەستەی خەون و خەیاڵ دروستکراوە. پەی بەوە برد کە تاڵە مویەک واقیع و خەیاڵ لێک جیا دەکاتەوە. ئایا «تۆلستۆی» کاتێک «ئاناکارینا»ی نوسی، هەستکردن بەو شتە داگیری نەکردبوو؟ ڕۆمان نوس چۆن دەتوانێت بنوسێت، گەر ناخی پڕ نەبوبێت لەو هەستە؟

«هۆمیرۆس» وەک شەڕێکی واقیعی، (ئەلیادە) ئەنوسێتەوە. ئەو سرودەی وا نوسیوە تەوە، وەکی ئەوەی مێژو بگێڕێتەوە. ئەو یۆنانیە نابینا بلیمەتە، فانتازیا دەنوسێتەوەو دەڵێت ئەوە مێژووە. ئایا گەمارۆی تەروادە مێژویی نییە؟ لە (ئەلیادە)دا باسی ئەسپەکەی تەروادە نەهاتووە. (ئەلیادە) پڕیەتی لە ئەسپ، بەڵام ئەسپەکەی تەروادەی تێدا نییە. لە (ئۆدیسە)دا باسی هاتووە، بەڵام لە (ئەلیادە)دا باسی نییە. ئایا (ئەلیادە) مێژویەکی واقیعە بۆ جەنگێکی واقعی کە لە نزیک خاکی تورکیادا ڕوی دابێت؟ ئایا «ئەخیل» پیاوێکە لە گۆشت و خوێن و ئێسقان؟ ساڵان ڕۆیشتن

و سەدەکان تێپەڕین، ئێسک و پروسکەکان بونە خۆڵ و شارەکانیش دارمان. کامە واقعیە و کامە خەیاڵیە؟ ئایا «هۆمیرۆس» واقعیە و کارەکتەرێکی هەقیقیە؟

«کافکا» لە بەراییەکانی سەدەی بیستەمدا، دەرگایەکی ئاوەڵا کرد. ئایا دەتوانین دیاری بکەین، کتومت لە چ چرکەساتێکدا ئەو دەرگایەی خستە سەر پشت؟ ئایا ئەو دەرگایەی ئەو کاتە کردەوە کە یەکەمین دێڕی لە کورتە ڕۆمانی (بەد گۆڕان) نوسی؟ «مارکیز» دەڵێت: (ئەم تێکستە تەواوی ژیانی گۆڕیم). «مارکیز» هەندێ جار وەک کارەکتەری ناو ڕۆمانەکان قسە دەکات. ئایا «کافکا» سەروەختێک (بەد گۆڕان)ی نوسی، دەرگایەکی کردەوە؟ بەر لە (بەد گۆڕان) دەبینین دەرگاگەلێک دەکاتەوە و دایان دەخات، دەیانکاتەوەو دایاندەخات. ئەمە بوو بە پیشەی «کافکا»، کردنەوەی دەرگاکان. تەنانەت ئەو بە نوستویش دەیبینی، دەرگایەک دەکرێتەوەو دەمانچەیەک لەو دەرگا کراوەیەوە دێتە ژورێ. ئەم خەو بینینە چییە؟

لە خەویدا سوراحیە ئاوێکی نەبینی، پڕ لە دانی شکاو نەبێت. سوراحیەکە نیوەی ئاوی تێدایە و ڕەنگەکەی لێڵ و بۆرە. لە ئاوەکەدا دانی مرۆڤی تێدایە. ژمارەیەکی زۆری دان. دانی تەنها مرۆڤێک نا، دانێک و دوان و سیانو.. هتد، ئەم دانانە چین؟ کێ لەم سوراحیەدا کۆی کردونەتەوە؟ پێش تۆزێک پیرەمێردێک ئاوی لەم سوراحیە دەخواردەوە. چۆنی خواردەوە؟ «کافکا» ئەم خەونەی نەبینی، ئامرازی سزادان و لێدانی بینی. برینی لە هەناوی پیاوێکدا بینی کە وەک گوڵ دەمی کردبووەوە. پزیشکێکی بینی بەسەر پشتی ئەسپێکەوە، دێ بەدێ ئەگەڕا. دیوارێکی بینی لە وڵاتی چین دروستدەکرا. دز و جەردە و دڕندەی بینی کە چۆن دەست دەگرن بەسەر شارۆچکەیەکدا. ئەوانە (بەربەریەکان)ی «کویتزیین»؟ لە کورتە چیرۆکێکی «کافکا»وە بەناوی (دەست نوسێکی کۆن)، (لە چاوەڕوانی بەربەریەکانی) «کۆیتزی» دەست پێدەکات. لە چامەکەی «کەڤافی»یەوە دەست پێناکات، بەڵکو لە «کافکا» وە سەرچاوە دەگرێت. ئایا «کویتزی» ئەمە دەزانێت؟ ڕەنگە بزانێت و لەوانەشە نەزانێت.

«کافکا»بەر لە جەنگی یەکەمی جیهانی دەرگایەکی کردەوە. دەرگایەکی کردەوە و پێدەشتێکی بینی کە بەرەو نا کۆتا درێژ دەبێتەوەو هێڵی ئاسنینی بینی و وێستگەی (کلدا)ی بینی. ئایا بە ڕاست ئەم وێستگەیە لە پێدەشتەکانی ڕوسیادا هەیە؟ ببێ یان نەبێ چی لە مەسەلەکە دەگۆڕێت! لە دنیاکەی «کافکا»دا هەیە. «کافکا» ئەو دەقەی تەواو ناکات. لە ڕۆژانەکانی «کافکا»دا جارێکی تر بەسەر وێستگەی (کلدا)دا دەکەوین. ویستگەی (کلدا) زۆر لە پێدەشتەکانی ڕوسیا هەقیقی ترە کە ناو ئەتڵەسەکانیان داپۆشیوە. ئەتڵەسێک دەکەوێتەوەو سەیری نەخشەکان دەکەیت و (کلدا) نا دۆزیتەوە، چاو دادەخەیت و (کلدا) دەبینیت.

«کافکا» دەرگایەکی کردەوەو کەوتە ڕوانین. چاوەکانی «کافکا» گەورەن. سیمایەکی منداڵانە و دووچاوی گەورە. سەیری دنیای کرد و بەشێوەیەک بینی وەک ئەوەی تەنها کەسانێکی کەم بەو جۆرە بینیبێتیان، وەک خەو و خەیاڵ بینی. لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا، «ستیڤنسۆن»یش هەمان شتی کرد.

«کافکا» له بەراییەکانی سەدەی بیستەمدا هات و حەکایەتێکی سەیری نوسی. بە ستایلێکی تۆکمە و پتەو، جیهان گەلێکی خەیاڵی و فانتازی نوسی. جیهان گەلێکی خەیاڵی کە هاوتای ئەم جیهانە واقعیەیە. وەک چۆن خۆی ئەیبینی، وەها ئەم دنیایەی نوسیەوە. وەها کەوتە نوسینەوەی شتە خەیاڵیەکانی، وەک ئەوەی هەواڵێک لە ڕۆژنامەیەکدا بنوسێتەوە. بە دەستەواژەیەکی کۆنکرێتیانە پرۆسەی لە سێدارەدانێکی سەیر باس دەکات. وەک ئەوەی پێت بڵێت، ئەم بەیانیە چی خواردووە. دەم و چاوەکە نەدەگری و نە پێدەکەنێ. چاوەکان بۆ دوور دەڕوانن. پێدەچێت «پیدرۆ پارامۆ» لە چیرۆکی (گراتشۆسی ڕاوچیەوە) دەستی پێکردبێت.

«کافکا» بە شێوازی خۆی جیهانی بینی. ئەمەش شتێکە بۆ زۆر کەس دەست نادات. لە ڕۆژانەکانیدا نوسیویەتی جگە لە مەرگ لەسەر شتێکی تر نانوسێت. «بۆرخیس» دەڵێت: (ئەو تەنها دەربارەی کات دەنوسێت). چاکتر وایە ئەدیبان لە بارەی ئەدەبی خۆیانەوە قسە نەکەن. گەر قسەیانکرد ئەوا خراپەکاری دەرهەق بە ئەدەب دەکەن. قسەکانیان گرنگ نییە، گرنگ ئەدەبە. هەرچی ئەوەی لەلات باشە بینوسە، بینوسە و بە قسە مەیلێ. ڕۆژانەکانیش بۆخی قسەیە، لە پەراوێزی ئەدەبدایە و ئەدەب نییە. ئایا ئەو ڕۆژانانە کات دەیکات بە ئەدەب؟ کیمیای ئەدەب شتێکی سەیرە. شتەکان سەروەختێک تۆ دەیاننوسیتەوە دەگۆڕێن و گۆڕانیان بەسەردا دێت.

«تۆلستۆی» دەڵێت: (ئیلهام ئەو کاتانە دێت کە دەنوسم). ئەمە بە (سفر ایوب) دەچێت و شیعر لە تایەکی گەرمەوە سەرچاوە دەگرێت. ئاگر ئێسک دەسوتێنێ و ڤایرۆس و میکرۆبیش گۆشتی سیەکان ئەکرۆژن و کابراش هەر دەنوسێت میرولەیەک دەبینێت لە گۆشتی قوڵ و مەچەکیەوە دێتە دەرێ سەیرێکی دەکات و دەست دەکات بە ژماردنی مێرولەکان. ئەم هەموو مێرولەیە لە کوێوە سەر دەردێنن؟

**سەرچاوە:**

الحیاة – ٢٠٠٦/٣/٧.

# وێستگەکانی سەردەم..


**هەنوکە لە سەفەردام**

خوێندنەوەی: شوان ئەحمەد

**عەسەبیەت و تیۆری دەوڵەت لە بیری ئیبن خەلدوندا**

خوێندنەوەی: سەردەم

**فەیلەسوفەکانی مۆدێرنە لە دیکارتەوە تا هایدگەر**

خوێندنەوەی: لاس

**سادقی هیدایەت**

خوێندنەوەی: سەردەم

**رامبرانت... ئەو هونەرمەندەی شەیدای ڕوخساری خۆی بووە**

لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

**ئایا ئەگەری ڕودانی ٦٨ ێکی تر هەیە؟**

عەبدولسەلام بنعەبد لعالی

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

**خوێنەران خوێنەخۆرەی منن**

ئیتالۆ کالڤینۆ

لە عەرەبییەوە: عیسا چیایی

# هەنوکە لە سەفەردام

جادە یەعنی غوربەت
ژیان یەعنی ڕیشۆڵەیەک فڕی
دە پێم بڵێ، چی دڵتەنگی کردووی؟
دڵخۆشیەکان کەم نین،
بۆ نمونە:
هێشتا نانی گەنم خۆشە و
هێشتا ئاو بە خوڕ دێتە خوار و
ئەسپەکانیش دەیخۆنەوە.

هەندێ شاعیر هەن مرۆڤ لەگەڵیاندا فێری فڕین دەبێت و نەشئەی ژیان دەیگرێت. شاعیرانێک هەن وامان لێدەکەن هەمیشە ژیان بەسەوزی و بە تەڕو پاراوی ببینین، وامان لێدەکەن مانایەک بە بوون بدەین و تا ئەو پەڕی تامی ژیان بکەین.. «هۆڵدەرلین» و «ڕیلکە» و «تراکل» و «تاگور» و «ئۆشۆ» و «سوهرابی سوپهەری» لەو سولالەیەن، لەو بنەماڵە ژیان دۆستەن کە ڕۆح ئاوەدان دەکەنەوە و پڕمان دەکەن لە نەشئەو سەرمەستی.

کتێبی (هەنوکە لە سەفەردام)، کتێبێکە نامەو بیرەوەریەکانی شاعیری هاوچەرخی ئێرانی «سوهرابی سوپەهری» یمان بەردەست دەخات. ئەو پیاوەی شیعری دەنووسی و نیگاری دەکێشا، لەم کتێبەدا نامەکانی و بیرەوەریەکانی دەخوێنینەوە، وەک ئەوەی قەسیدەیەکی شیعری بخوێنینەوەو لە تابلۆیەکی پڕ شەوقی ئەو، کە لێوان لێوە لە خرۆشی ژیان ڕابمێنین.

ئەم نامە و بیرەوەریانە وەکی شیعرەکانی، وەکی کاروانی ژیانی پڕن لە ڕاستگۆیی، لە نوسینەوەی خورپە و حەز و ترس و شەرمنیەکانی منداڵی، لە گازندە و گلەیی لە دەست کۆت و بەندەکانی کۆمەڵگە و لە بێ دەربەستیەکانی زەمانە. ئەو دەربارەی منداڵی خۆی دەڵێت: (منداڵێکی هار و عەجول بووم، لەگەڵ خوشک و براکانما هەر زوو فێری دزینی میووە بووین، بە دیواری باغی خەڵکیدا سەردەکەوتین و هەنار و هەنجیریمان دەدزی.. ئەگەر ڕۆژێک خۆرهەڵاتن و خۆرئاوا بوونم نەبینیایە، خۆم بە گوناهبار دەزانی. حەزم لە قوتابخانە نەدەکرد، بە درۆ خۆم نەخۆش دەخست تا نەچمە قوتابخانە. کۆلارەم لە کتێبەکانی قوتابخانە خۆشتر دەویست، دەنگی سیسرکم لە پەندەکانی مامۆستا لەلا خۆشتر بوو).



سوهرابی سوپهەری

ئەم بیرەوەریانەی «سوپەهری» ڕێک و ڕاست، بە چیرۆک و حیکایەتەکانی خانم «گوڵی تەرەقی» دەچێت کە پڕیەتی لە ڕاستگۆیی و لە ساتە شیرین و تاڵەکانی منداڵی. ئەو سەبارەت بە عەشقی بۆ سروشت و بۆ جوانیەکانی ژیان لە تافی منداڵیدا، خۆی بەم شیعرەی «سیفۆگۆ» دەچوێنێ کە دەڵێت: (منداڵ هەر ئەوەندەی گوڵێکی نیشان بدەیت، دەمی دەکاتەوە). «سوهراب» وا بوو هەر بۆیە کە گەورەش دەبێت، ئەو سەر سامی عەشقە سەیرەی ژیان بەری نادات. لە بەشێکی زۆری دیکەی نامەکانیشیدا، باسی حاڵی خۆی دەکات لەو ساڵانەی کە لە وڵاتی ژاپۆندا گوزەراندویەتی و نامەکان پڕینی لە حەسرەتی دووری و غەریبی و تاسەی زێدی منداڵی.

لە نامەیەکیدا لەتۆکیۆوە دەڵێت: (نەمدەتوانی خۆم لە نیگای خەڵک بشارمەوە، غەریبی من هەر لە دوورەوە دیار بوو)..

لەم کتێبەی «سوهرابەوە» زۆر شت فێردەبین، زۆر شت دەدۆزینەوە کە ڕەنگە لە چەندین کتێبی ڕەق هەڵاتوی تردا نەبن، ئەو شتانەش دەیدۆزینەوە، عەشق و نەشئەی ژیان و خۆشەویستیە، چونکە ئەو پیاوێکە (چاوەکان بە داهاتووەوە گرێ دەدات و دڵەکان بە عەشقەوە و سێبەرەکانیش بە ئاوەوە).

**خوێندنەوەی: شوان ئەحمەد**

# عەسەبیەت و تیۆری دەوڵەت لە بیری ئیبن خەلدوندا



ئیبن خەلدون

هەر کاتێک باس لە کۆمەڵناسی یان سۆسیۆلۆژیا دەکرێت، دەستبەجێ ناوی «ئۆگست کۆنت» و «ئیبن خەلدون»مان بیر دێتەوە. لە ڕاستیشدا ئەم دوو سۆسیۆلۆژیستە سەرەتاکانی کۆمەڵناسی فۆرمەلە دەکەن، «کۆنت» لە فۆرمە نوێیەکەیدا و «ئیبن خەلدون»یش لە بەرگە کۆنەکەیدا. ئەم کتێبەی «د. ئەلبێرت عیسا» سەفەرێکە بە بیری «ئیبن خەلدون»داو، تەقەللایەکە بۆ ڕونکردنەوەو تاوتوێکردنی هەردوو چەمکی (عەسەبیەت) و (تیۆری دەوڵەت)، لە چوار چێوەی بیرکردنەوەی ئەودا.

لەناو ڕۆشنبیری کوردیدا ناوی «ئیبن خەلدون» وەک ناوی زۆر بیریار و کۆمەڵناس و لێکۆڵیاری تر ئامادەیە، بەڵام ئەوەی غائیبە و نەناسراوە فیکر و دنیابینی و تێزە و تیورەکانیەتی. گرنگترین کتێبی «ئیبن خەلدون» کە تا ئێستاش نرخ و بەهای خۆی هەیە و دەخوێندرێتەوە، کتێبی (المقدمة)یە. بەداخەوە ئەم کتێبە تا ئەمڕۆکەش نەکراوەتە کوردی و کتێبخانەی کوردی لەو سەرچاوە زانستیە گرنگە بێبەشە. ئێمە لێرەدا و لە ڕێی ئەم کتێبەی «د. ئەلبێرت عیسا»وە دەتوانین، وەک سەرەتایەک ئاشنایەتیەک لەگەڵ بیرو تێزەو تیورەکانی «ئیبن خەلدون»دا پەیدا بکەین و گرنگیەکی زۆر لە لێکدانەوە مێژوویی و سۆسیۆلۆژیەکانی وەربگرین، بۆ تێگەیشتن لە مێژووی خۆمان و بۆ خوێندنەوەی واقیعی کۆمەڵایەتی و سیاسی کوردی، لە ئێستاو لە ڕابردو لە داهاتوشدا.

ڕۆشنبیری دوورە وڵات «مەریوان وریا قانع» لە نوسینێکیدا دەڵێت: (خەلدونیزم نادیارێکی ترسناکە لە ڕۆشنبیری کوردیدا). ئەم قسەیە تەئکیدکردنەوەیە لە بایەخ و گرنگی فیکری «خەلدونیزم»، بۆ خوێندنەوەی پێچ و پەناکانی ژینگەیەکی ئاڵۆزی وەک ژینگەی کوردەواری. «ئیبن خەلدون» لە یەک کاتدا هەم مێژوونووس بووە و هەم سیاسی و هەم سۆسیۆلۆگ.

لەم کتێبەشدا ئێمە بەسەر لایەنە گرنگەکانی فیکری ئەو لە بواری مێژوو و سیاسەت و سۆسیۆلۆگیادا دەکەوین، ئەوەی سەرچاوەی بنەڕەتیشە بۆ بەسەرکردنەوەی ئەو سێ کایەیە کتێبی (المقدمة)یە. کتێبی (عەسەبیەت و تیۆری دەوڵەت لە بیری ئیبن خەلدون)دا، مەسەلەگەلێکی گرنگ دەخاتە بەرباس و قسەیان لەسەر دەکات، وەک:

-مێژووی ئەفریکای باشوور، لەگەڵ کورتەیەکی مێژوویی دەربارەی «ئیبن خەلدون» و سەردەمەکەی.

-هەروەها وەڵامدانەوەی پرسیاری «ئیبن خەلدون» کێ بوو؟

-هاوکات موقەدیمەی «ئیبن خەلدون» و دیدی ئەو بۆ مێژوو، تەوەرێکی دیکەیە.

-لەگەڵ بەسەرکردنەوەی چەمکی عەسەبیەت و دەسەلات و ئایین و فۆرمی ئایینی.

-هەروەها چەمکی دەوڵەت و دەوڵەتی خەلدونی و چەمکی عومران، لەگەڵ پاشکۆیەکدا دەربارەی «ئیبن خەلدون» و «مۆنتسکیۆ» و تیۆری کەش و هەوا.

**خوێندنەوەی**

**سەردەم**

فەیلەسوفەکانی مۆدێرنە کێن و بە کام ناوانە دەوترێت فەیلەسوفانی مۆدێرن؟ ئەوانە بۆچی بە مۆدێرن ناو دەبرێن و جیاوازیان لەگەڵ خەڵکان و یاخود بیریاران و بیرکەرەوانی سەردەمی پێش خۆیاندا چییە؟

ئەم کتێبە (فەیلەسوفەکانی مۆدێرنیتە لە دیکارتەوە تا هایدگەر)، کەم تا زۆر هەوڵێکە بۆ دەستەبەرکردنی وەڵامی ئەو پرسیارانە و ڕۆشنایخستنە سەر ئەو قۆناغە مێژوویەی بە «ڕینێیە دیکارت»ی فەیلەسوفی فەرەنسی دەست پێدەکات و تا سەردەمانی «مارتن هایدگەر»ی فەیلەسوفی گەورەی ئەڵەمان درێژەی دەبێت.

"بێرتران ڤیرژۆلی» کە نوسەری کتێبەکەیە، لە دەسپێکی باسەکەیدا و بەر لەوەی باس لە فەیلەسوفەکانی مۆدێرنە بکات، فەلسەفەی مۆدێرنەمان پێدەناسێنێت: (فەلسەفەی مۆدێرن بریتیە لەو بزوتنەوە فیکریە مەزنەی کە لە دیکارتەوە دەست پێدەکات تا مارتن هایدگەر و مەبەستی دوپاتکردنەوە و دوبارەکردنەوە بیریارانی پێشوو نەبوو، بەڵکو هەڵسەنگاندنی شتەکانی جیهان بوو بە شێوەیەکی ئازاد و تایبەتیانە، بۆ ئەوەی مرۆڤ جیهان بناسێت و ژیانی خۆی سەربەخۆیانە بەڕێوەبەرێت).

ڕەنگە پێناسەکردنی مۆدێرنە بە وردی کارێکی دژوار و گران بێت، لەبەرئەوەی چەمکێکە بەردەوام لە گۆڕاندایە، بەڵام دەتوانین بڵێین مۆدێرنە بۆ خۆی خاوەنی سێ خاڵی تایبەتە، کە بریتییە لەمانە:

–هەستێکی ئازایانە لە بیرکردنەوە.

–جوانناسێک بۆ خوڵقاندن.

–ئاواڵەی بزوتنەوە بوون.

لەگەڵ ئەم سێ خاڵە تایبەتەی مۆدێرنەدا، سێ ڕووداو یاخود سێ بابەتی تایبەتی بیری مۆدێرنەشمان هەیە کە وردە وردە و دوای هەندێک گۆڕانکاری مەزن لە مێژوی مرۆڤایەتیدا، سەریانهەڵداوەو بریتین لە: (مرۆڤ، ئەقڵ، ئازادی).

دوای ئەم سەرەتایە نوسەر دێتە سەر باسکردنی بیریار و فەیلەسوفە مۆدێرنەکان، ئەوانەی بەدوای شتی تازەدا دەگەڕان و دژی ئەو شتانەش دەوەستانەوە کە نەگۆڕ و چەقبەستون. سەرەتاش بە «دیکارت» و هەروەها «سپینۆزا» و «لایبنتس» و «پاسکال» و «کانت» و «هیگل» و «شۆپنهاوەر» دەست پێدەکات، تا دەگاتە «کیرکەگارد» و «نیچە» و «هایدگەر» و..هتد. بەخستنە ڕوی ژیان نامە و دنیابینی و شێوازی بیرکردنەوەو نوسین و بەرهەمەکانیان، نوسەر دەتوانێت لەم کتێبەدا هەندێ زانیاری سەرەتایمان دەربارەی ئەو بیرمەندانە و ئەو قۆناغە گرنگەی مێژووی خۆرئاوا پێ بڵێت کە بە قۆناغی بیری تازە و مۆدێرن ناوبانگی دەرکردووە.

**خوێندنەوەی: لاس**

# سادقی هیدایەت



«سادقی هیدایەت» ناوێکی دیار و درەوشاوەی ئەدەبیاتی فارسیە. ئەم پیاوە ئەگەرچی وەکو «کافکا» و «کامۆ» کەم ژیا، بەڵام لەو ماوە کەمەی تەمەنیدا گەلێک بەرهەمی قوڵ و بەپێزی نوسی، کارێک کەوایکرد نەک هەر لە سەر ئاستی ئێران و خۆرهەڵات، بەڵکو تا ڕادەیەکی زۆر لەسەر ئاستی جیهانیش بناسرێت.

«هیدایەت» بە دووشت ناوبانگی زۆری پەیدا کرد، جارێک بە بەرهەمە وجودیە قوڵ و پڕ مانا و تەلیسمەکانی، جارێکی دیکەش بە خۆکوشتنەکەی کە لە ساڵی ١٩٥١ دا بوو لە پاریس. هەمیشە ئەوانەی کە مەرگی ئاسایی نامرن و بەشێوەیەکی تراژیدی کۆتایی بە ژیانی خۆیان دێنن، پرسیارگەلێکی زۆر لە دەوری خۆیان دروست دەکەن. سەروەختێکیش «هیدایەت» لەو تەمەنە کەمە و لە پرێکدا خۆی دەکوژێت، ئیدی خەڵکانێکی زۆر دەکەونە بایەخ پێدان و کۆکردنەوەی بەرهەمەکانی و هەڵسەنگاندنیان. ئەم کتێبە (سادقی هیدایەت، نمونەی مەرگی نوسەر)، هەوڵێکی زۆر تایبەتی ناو ڕۆشنبیریی کوردیە، بۆ ئاشنابوون بەسەر بوردەی ژیان و مردنی یەکێک لە دیارترین قەڵەمەکانی رۆشنبیریی فارسی.

«هیدایەت» کە هەموومان لە ڕێی (زندە بە گۆڕ) و (بومی کوێرە)وە دەیناسین، لە ١٩٠٣/٢/١٧ لە تارانی پایتەختی ئێران و لە بنەماڵەیەکی ئۆرستۆکرات دێتە دنیاوە. ئەوەی لێی دەگێڕنەوە ئەوەیە کە ئەو هەر لە منداڵییەوە، لە ژیانی ئۆرستۆکراتی بێزار بووە و هیوا خواز بووە زوو لەو ژینگەیە دوور کەوێتەوەو هەرگیز نەیویستووە لە ڕێی ئەو بنەماڵەیەوە، ببێتە خاوەن پلە و پایەو سەروەت و سامان.

ساڵی ١٩٢٥ لە تاران لە قوتابخانەیەکی فەرەنسیدا خوێندنی ئامادەیی تەواو دەکات، دوای ئەوە خێزانەکەی دەینێرنە بەلجیکا تا ببێتە ئەندازیار، پاش ساڵێک لەگەڵ چەند هاوڕێیەکیدا دەچنە پاریس بۆ خوێندنی ئەندازیاری تەلارسازی، بەڵام «هیدایەت» هەر زوو زانی ئەندازیاری و حەزو خولیاکانی ئەو دوو دنیای جیاوازن، بۆیە خوێندنی باڵای تەواو نەکردو وازی هێنا. دوای ئەوە خودەداتە خوێندنەوەی ئەدەبیات و زانستی زمان و مێژووی هونەرەکان.

ئەم پیاوە دوای نوسینی چەند تێکستێکی ئەدەبی قوڵ و دانسقە، بە خۆکوشتن کۆتایی بە ژیانی خۆی دێنێت، ئەو هەستی خۆکوژیە بە درێژای تەمەنی لەگەڵیدا بووە. ئەوەتا ساڵی ١٩٢٨ نامەیەک بۆ براکەی دەنوسێت و دەڵێت: (کارێکی شێتانەم کرد، بەڵام باش بوو بە سەلامەتی تێپەڕی)، بەڵام دواتر ئەو هەوڵەی پاریسی ژیانی کۆتایی پێ دێنێ و ئەمجارەیان سەلامەت تێناپەڕێ. «هیدایەت» یەکێک بووە لەوانەی فۆبیای پیربونی هەبووە و لە پیر بوون وەڕس بووە، ئەو هەمیشە پێی وابوو: (مرۆڤ نابێت لە پەنجا ساڵ زیاتر بژی، چونکە ژیان لە سەروی ئەم تەمەنەوە شتێکی قۆڕە).

ئەم کتێبە زانیاریەکی زۆرمان دەربارەی ژیان و مردنی ئەو بەردەست دەخات، لێ چیرۆک و بەرهەمە ئەدەبیەکانی پێمان دەڵێن کە ئەو چۆن بیریکردۆتەوەو خاوەن چ جیهانبینیەکی ڕەش و قەترانی بووە.

خوێندنەوەی

سەردەم

# رامبرانت...

## ئەو هونەرمەندەی شەیدای ڕوخساری خۆی بووە

**لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع**



ئەزمونی هونەرمەندی هۆڵەندی ناسراو "ڕامبرانت ڤان ڕیجین"*، لەڕێگەی کۆمەڵێ تایبەتمەندیو بنەماوە، ئەزمونێکی جیاوازە. ڕەنگە گرنگترینو دیارترین تایبەتمەندی ئەوەبێت کە نزیکەی حەفتا تابلۆو وێنەی ڕوخساری خۆی کێشاوە. لەمیانەی ئەو تابلۆو وێنانەدا، قۆناغە جیاواز جیاوازەکانی ژیانی تۆمارکردووە، هەر لە سەردەمی گەنجییەتییەوە تاکو سەردەمی پیری.

"ڕامبرانت" لەمیانەی گۆڕینی سیمای ڕوخساری، دەستنیشانی جووڵەی لەسەرخۆی ئەو ڕۆژگارەی تێدا ژیاوەو ڕەنگدانەوەی ئەو جووڵەیە لەسەر گەنجیەتی، کردووە. دروست ئەم تایبەتمەندییەیە، وایکردووە "ڕامبرانت" یەکێک بێت لە هونەرمەندە ناوازەکانو لە دەرەوەی پۆلی هونەرمەندان بخوێنێت. "ڕامبرانت" کە کوڕی ئاشەوانێک بووەو لە ١٥ی تەموزی ساڵی ١٦٠٩ لەدایکبووەو لە



٤ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٦٦٩ کۆچی دوایی کردووە، هەر لە منداڵییەوە توانای وێنەکێشانی تێدا دەرکەوتووە، پاشان زۆر بەخێرایی ئەو توانایەی گەشەی کردووەو لەپەرەسەندندابووە، تاکو دواجار بووتە یەکێک لە هونەرمەندە مەزنەکانی جیهانو لەمڕۆدا بە یەکێک لە لوتکە هەرە بەرزەکانی هونەر دادەنرێت. "ڕامبرانت" گەرچی ژمارەی ئەو تابلۆو وێنانەی بە درێژایی ژیانی دروستیکردوون، ناگاتە ٣٠٠ تابلۆو وێنە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، بەهۆی ئاستبەرزیانو بەها هونەریە جوانەکەیانەوە، بەسە بۆ ئەوەی "ڕامبرانت" بەیەکێک لە هونەرمەندە داهێنەرو نوێخوازەکان ناوببرێت.

"ڕامبرانت" حەزی لەوە بووە لە هونەرمەندانی ڕۆژگارەکەی نەچێتو وەک ئەوان نەبێت، بۆیە لە کارەکانیدا بایەخێکی زۆری بە ڕوناکیو سێبەر داوە، بەمەش ئاراستەیەکی تازەی هونەریی هێنایەئاراوە کە پەیوەستە بەخۆیو هەر ئەمەش بوو ناوی بە نەمری هێشتوەتەوە. ئاراستە تازەکەی "ڕامبرانت" لەوەدا بەرجەستە دەبێت کە زۆر لێزانانە ڕوناکی لە تابلۆکانیدا بەکارهێناوەو بە شێوەیەکی زۆر نایاب ئەو ڕوناکییەی لەسەر سیمای ڕوخسارەکان (دەموچاوەکان) داناوە، بەجۆرێک بەشێکی زۆری



وردەکارییەکانی لە سێبەردا هێشتووەتەوەو تەنها ڕەگەزێکی دیاریکراوی دەرخستووە. ئەم ئاراستەیە وای کرد "ڕامبرانت" ببێتە گرنگترین وێنەکێشی ڕوخسار (دەموچاو)لە جیهاندا، بەتایبەتی ڕوخساری خۆی کە زیاد لە حەفتا تابلۆو وێنەی بۆ کێشاوە. ساڵی ١٩٩٩ گەلەری نیشتیمانی لە لەندەن، توانی شەست لەو تابلۆو وێنانە کۆبکاتەوەو لە پێشەنگایەکدا بەناونیشانی (ڕامبرانت بە فڵچەی خۆی) نمایشیان بکات. لە پێشەنگاکەدا کۆمەڵێ چالاکی ڕۆشنبیری هەمەجۆر پێشکەش کرانو هەر لە پەراوێزی پێشەنگاکەدا، کتێبێک

بەناونیشانی پێشەنگاکەوە چاپکرا.

هەندێ لە توێژەرەوەکان پێیانوایە (پۆترێت) بریتییە لەو وێنەیەی سیمای کەسێتیی ئەو کەسە دەردەخات کە خاوەنی پۆترێتەکەیە، لێرەوە پۆترێت لەو وێنە سادەو عادیانەی دەموچاو ناچێت کە بەشێوەیەکی بەربڵاو دەگیرێت. هونەری پۆترێت ڕەگەکەی دەگەڕێتەوە بۆ شارستانیەتی ڕۆمانیو یۆنانی کۆن. لەو سەردەمەدا، شارەزایان مۆمی تواوەیان کردووە بەسەر دەموچاوی ئەو کەسانەی تازە مردبوون، ئەمەش دەرفەتی ئەوەی بۆ شارەزایان ڕەخساندووە بچوکترین وردەکاری ئەو دەموچاوانەیان دەستکەوێت کە تاڕادەیەکی زۆر وەک دەموچاوە ڕاستەقینەکان بووە. ئەم تەقەنییە تاکو ڕۆژی ئەمڕۆمان هەر بەردەوامە.

لە ڕاستیدا لەو مێژووە زۆر کۆنەوە تاکو ئێستا، وێنەگرەکان لە وێنەگرتنی ئەوی دیکەو لە وێنەگرتنی خودی خۆشیان ڕانەوەستاون. لەوانە هونەرمەندی وێنەگر (ساندرۆ بۆتیشللی) کە وەسفی خۆی وەک یەکێک لە بەشداربوانی دروستکردنی تابلۆی (المیلاد وسجود المجوس) دەکات. هونەرمەند "ڤان دیک" یەکەم کەس بووە خودی خۆی لەناو تابلۆکانیدا دەرخستووەو بۆ ئەو مەبەستەش ئاوێنەی بەکارهێناوە. وێنەگرو هەڵکۆڵەری ئەڵمانی "ئەلبرێشت دۆر" کە وێنەی خۆی لەسەر شێوەی مەسیح دروستکردووە. هونەرمەند "فیلاسکیز" کە لە وێنە شەخسییەکانیدا، مەزنیو شانوشەوکەتێکی گەورەی بەخۆی بەخشیوە. دواجار "ڕامبرانت" کە ژمارەیەک لە توێژەرەکان پێیانوایە ئەو تابلۆیانەی تێیدا وێنەی خۆی کێشاوە یاخود ئەو تابلۆیانەی قوتابییەکانی تێیدا وێنەی دەموچاوی "ڕامبرانت"یان کێشاوە، وەک (گێڕانەوەی ژیانی) ئەم هونەرمەندە وایە لە ماوەی چل ساڵی تەمەنیدا.

هەر تابلۆیەک لەو تابلۆیانە، مێژویەک دەردەخات کە پەیوەستە بە کەسێتیو ئەو گۆڕانکارییو بارودۆخانەی "ڕامبرانت"ی پێداتێپەڕیوە، هەر لە سەرەتای گەنجێتییەوە کە پڕ بووە لە حەماس، تاکو دەگاتە ئەو ناوبانگە پانو فراوانەی پەیدایکردووەو دواتر ئەو کۆتاییە تراژیدیەی تێیکەوتووە. ئاشکرایە "ڕامبرانت" لە دوا ساڵەکانی ژیانیدا، لە بێ پارەییەکی کوشندەدا ژیاوەو توانای نەبووە قەرزەکانی بداتەوە. "ڕامبرانت" هەموو ئەو خواروخێچیو هەڵپەو حەزانەی لە بیرکردنەوەیدا هەبوون، گواستووەتەوە بۆسەر پارچە قوماشەکەی بەردەستی، هەموو ئەوەشی لەو بڕوایەوە ئەنجامداوە کە مرۆڤ، بەشێوەیەکی کاریگەر، بەشدارە لە دروستکردنی مێژوو زەمەن. لەسەر ئەم بنەمایەو بە شایەدی زۆربەی ڕەخنەگرانو توێژەرانی زانسی هونەر، "ڕامبرانت" مەزنترین وەرگێڕ بووە بۆ وەرگێڕانی کەسێتی مرۆڤ لە مێژوی هونەری فۆتۆگرافدا. ئەو توانیویەتی لە میانەی وێنەکردنی ڕوخساری خۆی بەشێوەیەکی تایبەتیو ڕوخساری مرۆڤایەتی بە شێوەیەکی گشتی، بە قووڵی لێکۆڵینەوە لەسەر سیمای کەسێتییەکە بکاتو لێیەوە ڕۆبچێتە ناو دەرونو هەڵسوکەوتو هەستونەستی. ئەوەی لەمەدا یارمەتیداوە، توانا گەورەکەی بووە لەسەر وێنەکێشانو پشتبەستنی بووە بە شارەزایی لە بەکارهێنانی ڕەنگی زەیتی، "ڕامبرانت" توانی مادەی زەیت، لەم بوارەدا، بەشێوەیەکی پێشکەوتوترو باشتر بەکاربێنێت، توانی لە ڕێگەی ئەو مادەیەوە بە شێوەیەکی قووڵ گوزارشت لە کەسێتییەکە

بکات، واتە ئەم شارەزاییەی لە بەکارهێنانی زەیتدا، تا ئاستێکی زۆر یارمەتیدا لەوەی لە دروستکردنی ڕوخسارەکاندا، بگاتە ئامانجی خۆی‌و بگات بەوەی داڕشتنێکی هونەری تازە بێنێتەئاراوەو وەک دەستکەوتێکی گەورە تەماشای بکرێت، بە بەراوردکردنی لەگەڵ ئەو شێوازانەی دیکە کە لەو سەردەمەدا باوبوون.

## سێبەرو ڕوناکی

"ڕامبرانت" لە بەشی زۆری کارەکانیداو بە لێزانینێکی گەورەوە، سێبەرو ڕوناکی بەکارهێناوە. سێبەرو ڕوناکی لە کارەکانیدا، ئامرازی سەرەکی گوزارشتکردن بوون. لە میانەی گەمەی زیرەکانەی بە پرۆسەی دابەشکردنی سێبەرو ڕوناکی بەسەر ڕەگەزەکان‌و شتەکاندا، توانی حاڵەتێکی دەروونی تایبەت لە کارەکانیدا خەلقبکات‌و فیکرێکی قووڵ پێشکەش بکات‌و هەستوسۆزێک دوور لە ڕووکەش، بخاتەڕوو. "ڕامبرانت" لەمیانەی عابا تاریک‌و ڕەشەکان‌و لە میانەی ئەو گورزە ڕوناکییە چڕەی کە زیرەکانە لێکۆڵینەوەی بۆ کردووەو بە شێوەیەکی تایبەت لەسەر ڕوخسارەکان‌و چاڵوچۆڵییەکانی بەجێهێشتووە، وایکرد بینەر بگەیەنێتە ناو ڕاڕەوە تاریکەکانی ئەو ڕوخسارانەو بیانگەیەنێت بە جیهانی ڕۆح‌و قوڵایی ناخ‌و هەستوسۆزی خاوەنی ئەو ڕوخسارانە.

## وێنەکانی ڕوخساری خۆی

هەرچەندە ئەزمونی "ڕامبرانت" ئەزمونێکی بایەخدارەو کۆمەڵێ کاری زۆر گرنگی لێکەوتووەتەوە، لەوانە تابلۆی (پاسەوانی شەوان)، (خێزانە پیرۆزەکە)، (هاتنەخوارەوە لەسەر خاچ)، (وانەیەک لە توێکاری)، (سەندیکای دروستکردنی کراس)، (خوانی بلشازار)، (ئەرمیا خاپوربونی قودس دەلاوێنێتەوە)و چەندانی دیکە، بەڵام ئەو وێنانەی بۆ ڕوخساری خۆی‌و بۆ ڕوخساری ژمارەیەک لە کەسایەتییەکانی سەردەمەکەی یان بۆ ئەو ڕوخسارانەی لە کتێبی پیرۆزەوە دەریهێناون، کێشاوە، بە گرنگترین‌و بایەخدارترین کاری ئەزمونەکەی دادەنرێن، ئەمەش بەهۆی ئەو وردەکاریانەوەیە کە لە سیمای دەموچاوەکاندا بەکاریهێناوەو کۆمەڵێ گوزارشتی قووڵ‌و کاریگەرو ڕەنگاو ڕەنگی بەو دەموچاوانە بەخشیوە. لەسەر ئەم ئاستە، وێنەکانی خۆی لە پێشەوەی هەموو وێنەکانی دیکەوە دێن، ئەمە وامانلێدەکات دڵنیابین لەوەی وێنەکانی خۆی کە ژمارەیان لەسەرو حەفتا تابلۆو وێنەیەو تێدا سەرجەم قۆناغەکانی ژیانی خۆی دەرخستووە، مێژویەکی باوەڕپێکراومان سەبارەت بە کاروانی ژیانی، بە هەموو خۆشی‌و ناخۆشییەکانی، ئازارو بەختەوەرییەکانی‌و پێش هەموو ئەمانەش گۆڕانی سیماکانی ڕوخساری‌و بارودۆخی مادیی، پێدەبەخشێت.

ئێمە دەتوانین لە میانەی جووڵەی دەموچاوی‌و شێوەی ڕوخساری باشە یان خراپە، ئەو جلوبەرگانەی لەبەری کردووەو ئەو وەزعییەتەی هەڵیبژاردووە بۆ وێنەگرتن‌و جۆری ئەو تەماشاکردنەی بینەر کە تەماشای دەکات، خوێندنەوەیەک بۆ بارودۆخی خۆی‌و ئەو مێژووە بکەین کە وێنەکەی تێدا



دروستکراوە، بە دیاریکراوی ئەم خەسڵەتە، دیارترین خەسڵەتە کە وادەکات ئەزمونی "ڕامبرانت" ئەزمونێکی هونەری تایبەتو بایەخداربێت.

"ڕامبرانت" لەژێر کاریگەری قوتابخانەی (ئۆترشت)و هونەرمەندی ئیتالی "کارفاجۆ"دا بووە، ئەو هونەرمەندە ئیتالییە شێوازێکی زۆر تایبەتمەندی لە وێنەکێشاندا داهێناوە، تێدا واقیعیەتی ڕوونو ئاشکرای گوندی لەگەڵ سێبەو ڕوناکیدا کۆکردوەتەوە، وەک ئەوەی درامایەکی قووڵ بگوێزێتەوە.

ئەو تابلۆیانەی "ڕامبرانت" تێدا وێنەی خۆی کێشاوە، قۆناغە جیاواز جیاوازەکانی ژیانی ئەو هونەرمەندە دەردەخەن، هەر لە مێردمنداڵییەوە بۆ گەنجیەتیو لەوێشەوە بۆ پیربوونی. هەروەها "ڕامبرانت" لەو تابلۆیانەدا گوزارشتی لەو ژیانە کردووە کە تێیدا ژیاوە، گوزارشتی لە ساتە خۆشو ئارامەکانو لە ساتە ناخۆشو دژوارەکانی ژیانی کردووە. لەو ساتانەی پارەی هەبووەو لەو ساتانەش کە لە هەژارییەکی کوشندەدا ژیاوە، بە تایبەتی لە دواساڵەکانی ژیانیدا کە تەنانەت نەیدەتوانی پارەی قەرزەکانی بداتەوە.

## ڕامبرانت لە چەند دێڕێکدا

*"ڕامبرانت" ١٥ تەموزی ساڵی ١٦٦٠ لە هۆڵەندە لەدایکبووە، کوڕی "هارمن ڤان ڕیجن"ی ئاشەوان بووەو لە نۆ منداڵ منداڵی هەشتەم بووە، لە تەمەنی چواردە ساڵییەوە پەیوەندی کردووە بە زانکۆی لیدن، لە ساڵی ١٦٤٣ "ساسیکا ڤان ئەلبنورش" کە کچی خاوەن ماڵەکە بووە، هێناوەو لە زۆربەی تابلۆکانیدا وێنەی ئەو کچەی کێشاوە. "ڕامبرانت" لە ١٦٦٩/١٠/٤ کۆچی دوایی کردووە.

## سەرچاوە:

ڕۆژنامەی البیان، مسارات البیان، ٢٠١٠/٨/٢.

# ئایا ئەگەری ڕودانی ٦٨یکی تر هەیە؟

عەبدولسەلام بنعەبد لعالی
لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

لەدوای ئایاری ١٩٦٨، فەرەنسا ناوبەناو دوو جۆر بزواتی یاخیبوون و ناڕەزایی نیشاندان بەخۆیەوە دەبینێت.

جۆری یەکەمیان بەهیچ شێوەیەک بۆی گرنگ نەبووە کە بەئاڕاستەی مێژوودا هەنگاو بنێت یاخود مانایەک بە مێژوو بدات، بەڵکو لە هەوڵی ئەوەدابووە مانایەک بە ژیانی تایبەتی تاکە کەس ببەخشێت. لەناو ئەم جۆرە بزوتنەوانەدا تاکە کەس وەکی کرێکار و کەسێکی بەرهەمهێن داکۆکی لە خۆی نەدەکرد، بەڵکو وەک مرۆڤێک کە مافی ئەوەی هەیە لە خزمەتگوزاری تەندروستی و شوێنی نیشتەجێبوون و ڕۆشنبیری و چێژو خۆشیەکانی ژیانی دنیای مۆدێرن بەهرەمەند بێت. ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە ناکۆکی نێوان کرێکار و خاوەنکار چارەسەری یەکجاری بۆ کراوە، بەڵکو چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە هەنووکە لەڕێی دانوستان و گفتوگۆوە دەکرێت، زیاد لەوەی بە خۆپیشاندان و ناڕەزایەتی دەربڕین بێت.

ئەمەشە وادەکات پشێوی و نائارامی بگوازێتەوە بۆ ناو کایە کۆمەڵایەتیە تازەکان.

دووەم جۆری بزوتنەوە ناڕازی و یاخیەکان، ئەوەیە کە زۆربەی گەڕەک و ناوچەکان لە ماوەی جیاجیادا بەخۆیانەوە بینیوە. ئەوەی تایبەتمەندی ئەم جۆرە بزوتنەوانەیە ئەوەیە کە تەنها گوزارشت لە ناکۆکی کۆمەڵایەتی و کێشە و ململانێی سیاسی ناکات، بەڵکو ئەوەش تێدەپەڕێنێت تا دەبێتە (پرسی شوناس)، پرسێک ئەو گەنجانە دەیهێنێتە ئارا کە لەسەر کلتوری خۆرئاوا دەژین، بەڵام نە لە کەلەپوری فەرەنسیەوە سەرچاوە دەگرن و نە لە کەلەپوری وڵاتانی سەرەکی خۆشیان. ئەمانە لە کلتوری گیتۆکانی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاوە نزیکترن. هەرئەمەشە دەتوانێت بەرچاو رونیمان بداتی کە بۆچی ئەم بزوتنەوانە لەکاتی دەستپێکردنی یاخیبونیاندا، نەگەیشتنە ئاستی بەرزکردنەوەی دروشم و بەزۆری وەک ئاژاوەیەکی کەڕولاڵانە مانەوە کە لە هەموو کەرەستەیەکی شۆڕشگێڕانە بێبەشبوون.

ئەو بەدواداچوونانەی دواتر لەسەر ئەم جۆرە بزوتنەوانە کران، دەریانخست بەشداربوانی لەو کەسانە بوون کە پەراوێزخراوو ئافەرۆزکراون، کەسانێک کە هیچ نیشتمان و پارت و کلتور و

ئایدۆلۆژیایەک ئامێزیان بۆ ناکەنەوە. ئەوانە هیچ دەزگایەک نیە کۆیان بکاتەوەو بەناوی ئەوانەوە قسەبکات (تەنانەت دەزگای خێزانیش)، هەروەها زمانێکیش شک نابەن کە گوزارشت لە ئێش و ئازارەکانیان بکات، جگە لە زمانی ئاگر و سوتان نەبێت ئەو ئاگرەی زیان بە سەنتەری شارەکان و شوێنی خوا پێداوەکان ناگەیەنێت، بەڵکو گڕ لەو خوێندنگا و ئۆتۆبیسانە بەردەدات کە خۆیان تێدا دەخوێنن و هاتوچۆی پێدەکەن.

کەواتە لە هەردوو جۆرەکەدا دەبینین چەند دوورین لە رۆحی ئایاری ٦٨. رووداوەکانی ٦٨ بۆ خۆی شتێکی تربوو. بومەلەرزەیەکی بەهێزی کۆمەڵایەتی و فکری و سیاسی و کلتوری بوو. هەربەتەنها داواکاری باشترکردنی هەلومەرجی گوزەران و ژیان نەبوو، تەنها گوزارشت نەبوو لە دردۆنگی و ترسی مرۆڤ لە پاشە رۆژ، ترس نەبوو لە تەندروستی و چۆنیەتی ژیانکردنی، بەڵام هاوکات هەربەتەنها ئاژاوەنانەوەو شت سوتاندن و شت شکاندنێکی بێدەنگیش نەبوو. ئایاری ٦٨ شۆڕشێک بوو بیریار و سیمبولی دیاری خۆی هەبووکە لەپشتیەوە راوەستابوون و لەمەشەوە فیکرێکی نۆرماڵ و هەمەلایەن هاتە ئارا کە دواتر بەفیکری ٦٨ ناودێرکرا.

ئەم فیکرە هەوڵیدا چاو بەزۆرێک لەبەڵگە نەویستەکاندا بخشێنێتەوە ئەو بەڵگە نەویستانەی نەوەکانی پێشوتر لەسەری ژیابوون. فیکری ٦٨ چاوی بەزۆرشتدا گێڕایەوە وەک: (چەمکی شۆڕش، چەمکی رۆشنبیر، چەمکی زانکۆ و چەمکی لۆژیکی مێژوو، چەمکی پارادۆکس و رۆڵی ئەدەب و زیندان و سێکس و جەستەو.. هتد)، بەڵام ئێستا پێدەچێت هیچ لەپشت ئەم شتانەوە نەبێت کە روودەدات. نەناوی بیرمەندان دەبینین و نەهیچ سومبولێکی رۆشنبیری دیارە. ئێمە لێرەدا نە لەبەردەم پراکسیسێکداین کەتیۆریایەک بەرجەستە بکات، نەلەبەردەم تیۆریایەکداین دنیا لێبکداتەوەو ویستی گۆڕینی هەبێت.

تەنانەت چەمک گەلێکی وەک: (لۆژیکی مێژوو، میکانیزمەکانی کۆمەڵگە)، لێرەدا جێگەیان نابێتەوە. ئەم یاخیبووە نوێیانەی ئێستا، نایانەوێت ئاوێزانی بزاوتی مێژووبن و جیهان بگۆڕن، بەڵکو دەخوازن تیایدا رۆبچن و بەشی خۆیان لە خۆشیەکانی ژیان بچڕن. بۆیە سەیرنیە کە هەندێ سیمبول وەک خۆی نامێنێتەوە، گەر بشمێنێتەوە، ئەوا ماناکەی گۆڕانی بەسەرردادێت. بۆنمونە «چێ گیڤارا»، لای ئەوانە سیمبولێک نیە بۆ شۆڕش، بەڵکو تەنها بۆتە گۆرانی و سرودێکی جوان و دەیڵێنەوە، یان بۆتە وێنەیەک کە کراس و تیشێرتەکانیان دەڕازێنێتەوە.

مەسەلەکە پەیوەندی بەتوانەوەی تاکەکەسەوە نییەوە لە مۆدێلێک یان مەسەلەیەکدا، بەڵکو تاکە کەس خۆی بۆتە مۆدێلی خۆی و مێژوو بۆتە چرکەساتی ئێستا. یاخیبوانی ئایاری ٦٨ دروشمیان بریتی بوو لە (من مەسەلەکەم)، بەڵام ئێستا ئێمە لەبەردەم کەسانێکی یاخیبوی ترداین کەدەڵێن: (مەسەلەکە منم، خۆمم بەرلەهەرشتێکی دی).

**سەرچاوە:**

الحیاة، ٢٠٠٨/٥/٨ .

# خوێنەران خوێنەخۆرەی منن

ئیتالۆ کالڤینۆ
لە عەرەبییەوە: عیسا چیایی

...هەموو ڕۆمانێک پێش ئەوەی دەست پێبکات دەستی پێ کردووە، چونکە یەکەم وشە لە یەکەمین دێڕی لاپەڕەی یەکەمی هەر چیرۆکێ سەر بە شتێکە کە پێش نووسین و لەدەرەوەیدا ڕووی داوە، جگە لەو زمانەی کە لە ناوەوەماندا هەڵمان گرتوون دەشێ هەموو شتێ گۆڕانی بەسەردابێ، ئەو دنیا تایبەتیەمان کە زۆرتر لە منداڵدانی ئەو دایکە دەچێ کە لێوەی لەدایک بووین. بێگومان ئەو شتانەی چیرۆک نایدرکێنێ زۆرترن لەو بابەتانەی کە دەیاندرکێنێ، وەلێ ئەوە تەنها کتێبە مەزنەکانە ڕەنگە لە خوێندنەوەیاندا ئەو وەهمەمان پێ ببەخشن کە ئێمە شتێکی نەنووسراو دەخوێنینەوە.

تەم و مژ مرۆڤ دروست دەکات.

چارەنووسی شەنگترین خەون ئەوەیە لەپڕ ببێتە مۆتەکە.

پێویستە نووسینی پەخشان جیاواز نەبێت لە نووسینی شیعر: چونکە لە هەردووکیاندا پێویستە بۆ گوزارشتێکی نمونەیی و دەگمەن و چڕ و کورت بگەڕێین، ئەو گوزارشتەی کە لەبیر ناچێتەوە.

بێگومان کورت و درێژی دەقیش تەنها پێوانەگەلێکی دەرەکین، بەڵام من بەدیاریکراوی و بەتایبەتی باس لە چڕییەک، لە شیرزەیییەک دەکەم، کە ئەستەمە لەو دەقانەدا بەرجەستە بێت کە زۆر درێژن، بەڵکو ئەوە یەکێکە لە تایبەتیەکانی نووسینی یەک لاپەڕەیی.

بخوێنینەوە، مانای ئەوەیە دەڕۆین بۆ ژووانی شتێک کە لە ئایندەدا ئەنجام دەدرێت.

خوێنەران خوێنە خۆرەی منن.

لەئەمڕۆدا هیچ کەسێ هێندەی ڕژێمە پۆلیسیەکان گرنگی نادەن بە نووسین. باشتر وایە نووسەران نەناسین، چونکە کەسایەتیان هەرگیز لەگەڵ ئەو وێنانەدا نایەنەوە کە لە خوێندنەوەیاندا بۆیانی دەکێشین، ژیان کۆمەڵە ڕووداوێکە، ڕەنگە دوا ڕووداو مانای هەموو ئەو ڕووداوانەی پێش خۆی بگۆڕێت. جێگای نمونەیی بۆ ژیان ئەو جێگایەیە کە سروشتی بێت تیایدا نامۆ بین. شارانیش وەکو خەون وان، لە ترس و ئارەزوو دروست کراون. ئەو شتەی کە لە شارێکدا سەرنجت ڕادەکێشێ، ئەو حەوت یان حەفتاو حەوت شتە قەشەنگەی نییە، بەڵکو ئەوەیە کە لە وەڵامی یەکێک لە پرسیارەکانتدا ئاراستەی دەکات. ڕەنگە کرداری جووتبوون تەنها پەیوەندیی ئیجابی بێت لەنێوان دوو کەسدا. دۆزەخی زیندوان جێگایەک نییە کە لە ئایندەدا بۆی دەڕۆین: ئەگەر دۆزەخێکیش هەبێ، ئەوا ئەو دۆزەخەیە لێرەدا هەیە. ئەو دۆزەخەیە کە هەموو ڕۆژێک تیا دەژین، ئەو دۆزەخەیە کەپێکەوە دروستی دەکەین، بەڵام باشترین فاکتەر بۆ ئەوەی لەپایدا ئازار نەکێشین ئەوەیە، گەر شتێکیشمان بینی لەدۆزەخی ئێمەدا دۆزەخ نەبوو، بواری بۆبکەینەوە و بهێڵین بەردەوام بێت.

**سەرچاوە:**

www.joumanahaddad.org/writer1.html

# بڵاوكراوەكانی
## دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

ئامادەكردنی: باوكی ڕەهەند

دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، لە ماوەی دوو مانگی ڕابردودا، كۆمەڵێ كتێبی هەمەجۆری خستە بەردەستی خوێنەران. كتێبەكان چەند بوارێكی جیاواز جیاوازیان لەخۆگرتووە، لەوانە مێژوو، ئەدەب (ڕۆمانو شیعر)، مۆسیقا، بیرەوەری، سینەما، فیكرو فەلسەفە، ئینسایكلۆپیدیایەكی گشتی. ئاشكرایە یەكێك لەكارە باشو ناوازەكانی دەزگای سەردەم ئەوەیە، گرنگیو بایەخ بە تێكڕای بوارەكانی ڕۆشنبیریو كەلتوریی دەدات، هەوڵدەدات كتێب لە هەموو بوارەكانی ئەدەبیو زانستیو كۆمەڵایەتیو مێژوییو فەلسەفی..هتد چاپ بكاتو خۆی بە تەنها بوارێك یان دوو بوارەوە نەگرتووە، بەڵكو تەواوی كایە ڕۆشنبیریو مەعریفییەكانی بەسەر كردۆتەوە. ئەمەش خاڵێكی پۆزەتیڤەو شایەنی دەستخۆشی لێكردنە.

ئێمە لەم ژمارەیەی گۆڤاری سەردەمدا، هەوڵدەدەین تاڕادەیەك چەند كتێبێك بە خوێنەری گۆڤارەكەو سەرجەم خوێنەرانی دیكە ئاشنا بكەین.

### ***سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم... یادەوەرییە سیاسییەكانم***

ئەمە یەكێكە لەو كتێبە گرنگانەی لەلایەن دەزگای سەردەمەوە بە دیزاینو چاپێكی جوان بڵاوكراوەتەوە. كتێبەكە بیرەوەرییە سیاسییەكانی سوڵتان عەبدولحەمیدە كە بە زمانی خۆی دەیانگێڕێتەوە. خوێندنەوەی ئەم كتێبە ئاشنامان دەكات بە چۆنیەتی بیركردنەوەی ئەم سوڵتانەی موسڵمانان كە حوكمی ئیمپراتۆریەتێكی گەورەی كردووە. ئاشنامان دەكات بەوەی تێبگەین ئەم سوڵتانە لەو ڕۆژگارەدا، چۆنو بە چ شێوەیەك بیری كردۆتەوەو چۆن هەوڵی داوە كێشەو قەیرانە زۆرو فراوانەكانی ئەو سەردەمەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی چارەسەربكات.

لە ڕاستیدا بڵاوكردنەوەی ئەم كتێبە، لەم ساتەوەختەدا بایەخێكی تایبەتیو بەرچاوی هەیە، چونكە لە ئێستادا مەسەلەی قەتڵوعامكردنی ئەرمەنییەكان، لەسەر دەستی سوپای عوسمانیو لە ڕۆژگاری




سوڵتان عەبدولحەمیدا، هەنوکە بووەتە بابەتێکی سەرەکیو گەرمی میدیاکان، بەتایبەتی لە میدیاکانی ڕۆژئاوا، بووەتە مەسەلەیەک کە دەوڵەتی تورکیای تاڕادەیەکی زۆر ئیحراج کردووە، تەنانەت کار گەشتووەتە ئەوەی دەوڵەتی تورکیا هەڕەشەی ئەوە دەکات، ئەگەر ئەم مەسەلەیە ڕانەوەستێنو سنورێکی بۆ دانەنێن، ئەوا نزیکە سەد هەزار ئەرمەنی کە لە وڵاتەکەیدا دەژین، دەردەکات. جگە لەوە لەلایەن چەند وڵاتێکی ئەوروپییەوە هەوڵێکی زۆر خراوەتەگەڕ بۆ ئەوەی مەسەلەی کوشتوبڕی ئەرمەنییەکان بە جینۆساید بناسرێتو ئەم هەوڵەش تورکیای زۆر نیگەران کردووە. لێرەوە بایەخی ئەم کتێبە زیاتر دەردەکەوێت.

بێگومان خودی سوڵتان عەبدولحەمید شوێنی مشتومڕو قسەکردنێکی زۆرە، هەندێ کەس پێیانوایە ئەو کەسایەتییەکی مێژویی مەزنەو ڕیفۆرمخوازێکی دادپەروەر بووە، تەنانەت نازناوی (پاشای مەزن)یان لێناوە. پێیانوایە بە شێوەیەکی زیرەکانەو بە لێهاتوییەوە، حوکمی دەوڵەتێکی پانو فراوانی کردووە کە لە چەندین نەتەوەو ئاینی جیاواز جیاواز پێکهاتبوو. حەزێکی زۆری لە بڵاوبونەوەی زانستو خوێندەواری بووە، بۆ ئەو مەبەستە، وەک لە کتێبەکەدا ئاماژەی پێکراوە، چەندین قوتابخانەی لەسەر شێوازی خوێندنی خۆرئاوایی دامەزراندووەو پیاوە خوێندەوارەکانی لەخۆی نزیککردووەتەوە. بەپێی شەریعەتی ئیسلامی دادگاکانی ڕێکخستووە، هەوڵیداوە گەندەڵیو فەسادی ئیداری بنبڕ بکات. دژ بە دەستدرێژیو چاوچنۆکی ڕۆژئاوا ڕاوەستاوەو بەرەنگارییان بووەتەوە، چونکە ڕۆژئاوا چاویان بڕیبووە میراتی (پیاوە نەخۆشەکە) کە لەو سەردەمەدا بە دەوڵەتی عوسمانیان وتووە. ئەمە جگە لەوەی بەهیچ جۆرێک ڕازی نەبووە دەوڵەتێکی جوولەکە لە فەلەستیندا دابمەزرێتو کتێبەکە لەمبارەیەوە بەڕوونی هەڵوێستی ئەومان بۆ دەردەخات. وەلێ لەلایەکی دیکەوە هەندێ کەسی دیکە پێیانوایە ئەم سوڵتانە زاڵمێکی زۆردارو دیکتاتۆر بووە، بۆ ماوەی ٣٣ ساڵ تاکڕەوانە لە کۆشکی (یلزر)ەوە



دیمەنێک لە کۆکوژی ئەرمەنەکان

حوکمی ئەو ئیمپراتۆرە پانو فراوانەی کردووەو تەنها قسەی ئەو سەروەر بووە، هەموو دەزگاکانی ئیمپراتۆریەتەکەی بە خۆیەوە بەستبوو، بە تەنها هەر خۆی وڵاتی بەڕێوەبردووە. خەڵکانی ئازادیخوازی چەوساندووەتەوەو هەندێکیانی کوشتووەو هەندێکی دیکەیانی شاربەدەر کردووە، تەنها ئەوانەی ملکەچو گوێڕایەڵی بوون ڕزگاریان بووە. تەنانەت لە ڕۆژئاوا نازناوی (سوڵتانی سور) یاخود (بکوژە گەورەکە)یان لێناوە، ئەمەش بەهۆی ئەوەی گوایە لەسەردەمی حوکمڕانی ئەمدا کوشتوبڕی ئەرمەنەکان، لەسەر دەستی سوپای عوسمانی ڕویداوە.

بەڵام ئاخۆ سوڵتان عەبدولحەمید کێیە؟

جگە لەو زانیاریانەی لە پێشەکی کتێبەکەدا، لەسەر ژیانی ئەم پیاوە خراونەتەڕوو، ئێمە کۆمەڵێ زانیاری گرنگی دیکە کە لە هەندێ سەرچاوەی ئینتەرنێتییەوە وەرمانگرتووە، دەخەینەبەردەست، ئەمەش بۆ ئەوەی خوێنەر زیاتر ئاشنای ژیانی ئەم سوڵتانە ببێتو زیاتر لێتێبگاتو باشتر بیناسێت.

سوڵتان عەبدولحەمید کوڕی سوڵتان عەبدولمەجیدی یەکەمە، لە ساڵی ١٨٤٢ لەدایکبووە، باوکی یەکەمین سوڵتانی عوسمانی بووە، سیفەتێکی فەرمی بەخشیوە بەو جوڵانەوە بەڕۆژئاوایکردنەی (حرکە التغریب) لەناو دەوڵەتی عوسمانیدا هەبووە. سەردەمی سوڵتان عەبدولمەجیدی یەکەم بەسەردەمی (تەنزیمات) ناسراوە، واتە تەنزیمکردنی کاروبارەکانی دەوڵەت بەپێی میتۆدی ڕۆژئاوایی. دایکی سوڵتان عەبدولحەمید یەکێک بووە لە ژنە زۆرەکانی باوکیو ناوی «تیرمشکان»بووە، بە ڕەچەڵەک شەرکەسی بووە. سوڵتان عەبدولحەمید هێشتا منداڵ بووەو تەمەنی حەوت ساڵان بووە، (لە هەندێ سەرچاوەدا نوسراوە دە ساڵان بووە)، دایکی کە تەمەنی تەنها ٣٣ ساڵ بووە، کۆچی دوایی دەکات. ناچار دەچێتە لای باوەژنەکەی کە ناوی «بیرستۆ قادین» بووە، ئەم باوەژنە پەروەردەکردنی منداڵەکەی گرتووەتە ئەستۆی خۆیو زۆرباشو میهرەبان بووە لەگەڵیداو خۆشیویستووە، بۆیە کاتێ عەبدولحەمید دەچێتە سەر عەرشی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، نازناوی (سوڵتانەی دایک) دەدات بە باوەژنەکەی.

عەبدولحەمید تەمەنی هەژدە ساڵ دەبێت باوکی دەمرێت، دەچێتە لای عەبدولعەزیزی مامی کە لەسەر هەمان ڕێچکەی براکەی بەردەوام دەبێتو بایەخ بە تازەکردنەوەو تەغریبکردن دەدات. عەبدولحەمید لەگەڵ مامیدا گەلێک وڵاتی بینیوە، لەوانە نەمسا، فەرەنسا، ئینگلتەرە، میسر. هەروەها عەبدولحەمید لەسەردەمی خەلافەتی حوکمڕانی مامیدا، کۆمەڵێ لەو پاشایانەی جیهانی بینیوە کە سەردانی ئەستەنبوڵیان کردووە. عەبدولحەمید دارتاشێکی دەستڕەنگین بووە، لەناو باخچەی کۆشکەکەی لە ئەستەنبوڵ، وەرشەیەکی بچوکی دارتاشی هەبووەو بەشێکی زۆری کاتی لەوێدا بردووەتەسەرو تاکو ئێستاش پاشماوەی هەندێ لەکاری دارتاشییەکەی ماوەتەوە. جگە لەوە کۆمەڵێ ئارەزوی دیکەی هەبووە، لەوانە حەزی لە وێنەگرتن بووە، بۆ ئەو مەبەستە وێنەی هەموو ناوچەکانی ئەستەنبوڵی

گرتووەو لە ئەلبومێکی دوازدە بەرگیدا کۆیکردونەتەوە. ئەم ئەلبومە لە ئێستادا لە بەشی تورکی کتێبخانەی کۆنگرێس لە واشنتۆن پارێزراوە. کتێبخانەیەکی بۆ وەرگێڕان هەبووەو شەش وەرگێڕ کاری وەرگێڕانیان تێداکردووە، پارەی زیاتری دەدا بە وەرگێڕانی ڕۆمانە پۆلیسییەکان. عەبدولحەمید هەردوو زمانی فارسیو عەرەبی زانیوە، ژمارەیەکی زۆر کتێبی مێژوییو مۆسیقیو زانستی سەربازیو سیاسیو ئەدەبیو دیوانی شیعری خوێندووەتەوە.

سوڵتان عەبدولعەزیزی مامی بەهۆی پیلانێکەوە کە هەندێ لە پیاوانی کۆشک دایانڕشتبوو، دەکوژرێت. دوای کوشتنی مامی، براکەی عەبدولحەمید کە ناوی موورادی پێنجەمە، دەچێتە سەر عەرشی سەڵتەنەتی عوسمانی، بەڵام بەهۆی تێکچونی باری دەرونییەوە، تەنها ٩٣ ڕۆژ حوکم دەکات، دواتر ناچار وازدەهێنێت. لێرەوە سوڵتان عەبدولحەمید لە ٣١ ئابی ساڵی ١٨٧٦و لە تەمەنی ٣٤ ساڵیدا حوکمی وڵات دەگرێتە دەست. کاتێ ئەم سوڵتانە گەنجە حوکمی وڵات دەگرێتە دەست، جەنگی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەگەڵ ڕوسیا لە سەروبەندی هەڵگیرساندنیدا بووە، بارودۆخی ناوخۆیی هەندێ بەشی دەوڵەتی عوسمانی پڕ بووە لە پەشێویو ناسەقامگیری، بەتایبەتی لە ناوچەی بەڵقان. لە ٢٣ کانونی یەکەمی ١٨٧٦، واتە تەنها دوای چوار مانگ لە گرتنەدەستی دەسەڵات لەلایەن سوڵتان عەبدولحەمیدەوە، وڵاتە گەورەکان لە ئەستەنبوڵو لە کۆنگرەی (ترسخانە) کۆبونەوە، تاکو قسەوباس لەسەر ئەو جەنگە بکەن کە ڕەنگە لە داهاتودا لەلایەن ڕوسیاوە دژ بە دەوڵەتی عوسمانی بەرپابکرێت. بەڵام لەگەڵ نزیکبونەوەی وادەی جەنگەکەو لێدانی یەکەم تەپڵی جەنگ، وڵاتە گەورەکان سەفیرەکانیان لە ئەستەنبۆڵ دەکێشنەوەو عوسمانییەکان بەتەنها لەبەردەم سوپای ڕوسیادا بەجێدەهێڵن. جەنگەکە لە ناوەڕاستی ساڵی ١٨٧٧ ڕوویداو بە جەنگی (٩٣) ناسراوەو یەکێکە لە جەنگە هەرە گەورەکانی ئەو سەردەمەو تێیدا عوسمانییەکان بەشێوەیەکی زۆر خراپ تێکدەشکێن، ئەگەر گردبونەوەی وڵاتانی ئەورووپا دژ بە ڕوسیاو هاتنی کەشتیگەلی دەریایی ئینگلیزی بۆ بەندەری ئەستەنبوڵ نەبوایە، ئەوا سوپای ڕوسیا هیچی ئەوتۆی نەمابوو بگاتە ئەستەنبوڵ. جەنگەکە بە بەستنی دوو پەیماننامەی ئاشتی کۆتاییپێهات کە هەردوو پەیماننامەکە بۆ دەوڵەتی عوسمانی نالەبارو خراپ بوو، چونکە بەپێی ئەو دوو پەیماننامەیە چەند بەشێک لە خاکی دەوڵەتی عوسمانی جیاکرانەوەو غەرامەیەکی زۆریشی بەسەردا سەپێنرا.

ئەگەرچی سوڵتان عەبدولحەمید لەم یادەوەریانەیدا، بەتایبەتی لە لاپەڕەکانی (١٩، ٣١، ٣٦) کتێبەکەدا، تارادەیەکی کەم باسی کێشەی ئەرمەنەکان دەکات، بەڵام هەرگیز دان بەوەدا نانێت کە ئەرمەنەکان لەسەر دەستی سوپای عوسمانی توشی کوشتوبڕبوون، ئەو سورە لەسەر ئەوەی ئەرمەنەکان لەڕێگەی دەستی دەرەکییەوە یاخیبونیان لە وڵاتەکەیدا بەرپاکردووەو بە فیتی ئینگلتەرەو ڕوسیا

دەستیان داوەتە ئاشوبگێڕیو ئاژاوەنانەوە. کەمو زۆر باسی ژمارەی کوژراو و دوورخاوەکان ناکات، لێرەوە ئێمە بە باشی دەزانین کەمەکێک بە درێژی باسی ئەو کوشتوبڕەی ئەرمەنەکان بکەینو هەندێ زانیاری گرنگ بخەینە بەردەستی خوێنەر.

سەرەتای قەیرانەکە

مەسەلەی لەناوبردنی ئەرمەن لە سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمدا سەریهەڵدا، دەوڵەتی عوسمانی دەڵێت ڕوسیا هەستا بە دنەدانی ئەو ئەرمەنە ڕوسیانەی لە نزیک سنوری ڕوسیاو دەوڵەتی عوسمانییەوە نیشتەجێببوون، تاکو لەو سنورەدا پەشێویو ناسەقامگیری بنێنەوە. بۆ ئەو مەبەستە هەم بە پارەو هەم بە چەک کۆمەکی کردنو لەناو خاکی خۆشیدا مەشقو ڕاهێنانی پێدەکردنو چەندین گروپی چەکداری لێدروستکردن، لە نمونەی خنجاقو تشناق. پاشان بەریتانیا کۆمەکو پشتگیرییەکی بەهێزی لەو گروپە چەکدارانە کرد، چونکە بەریتانیا دەیویستو هەوڵیدەدا دەوڵەتی عوسمانی لەناوبچێت.

بۆ دەوڵەتی عوسمانی زۆر قورسو زەحمەت بوو، بگرە مەحاڵ بوو ڕازیبێت بەوەی لەسەر خاکەکەی، دەوڵەتێکی ئەرمەنی قوتبکرێتەوە، بەتایبەتی لەو شەش شارەی کە دەکەونە ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵەوە، سوڵتان عەبدولحەمید دروستبونی ئەم دەوڵەتەی وەک کردەوەیەکی خۆکوژی بۆ دەوڵەتی عوسمانی لەقەڵەمدەدا. لێرەوە کاتێ ئەرمەنەکان دەستیانکرد بە جموجوڵو یاخیبونی چەکداری، سوڵتان عەبدولحەمید بە هیچ جۆرێک سڵی لە دامرکانەوەو شکستپێهێنانی ئەو یاخبوونە نەکردەوە، هەرگیز گوێی بەو فشارە دەرەکیانەو بەو هەڕەشانەی ئینگلتەرە نەدا کە کەشتیگەلێکی خۆی ناردبووە ناوچەکە.

## ڕاگواستنو لەناوبردنی بەکۆمەڵ

بەشێک لە تورکەکان پێیانوایە حکومەتی عوسمانی لەو سەردەمەدا، نەیدەتوانی ئەم کێشەیە چارەسەربکات، تەنها لە ڕێگەی ڕاگواستنی ئەرمەنەکان نەبێت لە ناوچە سنورییەکان، ئەمەش بۆ ئەوەی بە تەواوی پەیوەندی نێوان ئەرمەنو سوپای ڕوسیا بنبڕبکات. بۆیە حکومەتی عوسمانی هەستا بە پرۆسەیەکی گەورەو بەرفراوانی ڕاگواستنی ئەرمەنەکان بۆ سوریاو لوبنانو موسڵ، ژمارەی ڕاگوێزراوەکان هێجگار زۆربوو کە زیاد لە ٦٠٠ هەزار کەس بووە. ئەم ژمارە زۆرەو ئەو توانا کەمەی دەوڵەتی عوسمانی لەبەردەستیدابوو بۆ ئەنجامدانی پرۆسەی ڕاگواستنەوەکە، بووە هۆی مردنی ژمارەیەکی زۆری خەڵک، بەشێکی زۆری خەڵک لە برساو لە سەرمادا گیانیان لەدەستدا، بەشێکی دیکەیان بەهۆی نەخۆشییەوە مردن. هەندێ سەرچاوە ژمارەی ئەو کەسانەی لەناوچوون بە ٣٠٠ هەزار کەس دادەنێن.

هەندێ نوسەر باس لەوە دەکەن پرۆسەی ڕاگواستنەکە تەنها ئەرمەنەکانی نەگرتەوە، بەڵکو ئەو موسڵمانانەشی گرتەوە کە لەنزیک سنوری ڕوسیا نیشتەجێبوون. «سەعید نەورەسی» بەم شێوەیە

وەسفی پرۆسەی ڕاگوێزانی موسڵمانەکان دەکات: (بەفر بە بەرزی سێ بۆ چوار مەتر کۆببووەوە، خەڵکی بە فەرمانی حکومەت، خۆیان بۆ جێهێشتنی شارەکەو ڕاگوێزان ئامادە دەکرد. ئەو خێزانانەی شەش یان حەوت منداڵیان هەبوو، تەنها دەیانتوانی منداڵێک یان دوو منداڵیان لەگەڵ خۆیاندا بەرن، ناچاربوون منداڵەکانی دیکەیان لەسەر ڕێگا سەرەکییەکانو لەژێر پردەکاندا، لەگەڵ برێک خۆراکی کەم جێبێڵن.. لەنێوان فرمێسکو قیژەقیژی منداڵەکانو گریانی دایکەکاندا، دیمەنی لێکجیابونەوەیەک دەبینرا کە دڵڕەقترین دڵی دەهێنانە گریان). هەندێ لە مێژونوسە تورکەکان دەڵێن ژمارەی قوربانییە موسڵمانەکان لە کوشتوبڕی ئەرمەنیەکاندا، دەگاتە نزیکەی ملیۆنێک کەس. گەرچی هەندێ مێژونوسی دیکەی تورک ئاماژە بەوەدەکەن کە ژمارەی ئەرمەنییە کوژراوەکان دە هەزار کەسێکە، بەڵام هەندێ سەرچاوەی دیکە ئاماژە بەوە دەکات قوربانیانی ئەو کارەساتە زیاد لە ملیۆنێک ئەرمەنییە، لەناویاندا خەڵکانی سریانیو کلدۆئاشوریش هەیە کە ئەوانیش بوونەتە قوربانیو گیانیان لەدەستداوە. سەرچاوە ئەرمەنییەکان باس لەوە دەکەن هەڵمەتی لەناوبردنەکە هەڵمەتێکی بەئەنقەستو مەبەستداربووە، بۆ ئەوە بووە ڕەگەزی مەسیحی، بەتایبەتی ئەرمەن ریشەکێش بکەن، چونکە ئەوان تەنها ڕەگەزێکی نەژادی بوون لەنێوان تورکیاو میللەتە تۆرانییەکانی ئاسیای ناوەڕاست.

دواجار بەهۆی ئەم کوشتوبڕەوە ئەرمەنەکان بۆ زۆرێک لە وڵاتانی جیهان کۆچیان کرد، نەتەوەی ئەرمەن ساڵانە لە ٢٤ نیساندا یادی ئەو کارەساتە دەکەنەوە، بەڵام تائێستا دەوڵەتی تورکیا بە شێوەیەکی فەرمی دانی بەم کوشتوبڕەدا نەناوە.

ئەم کتێبە لەلایەن بەڕێز «ئاوات ئەحمەد»ی وەرگێڕەوە بە زمانێکی کوردی پوختو جوان کراوەتە کوردی. تیراژی کتێبەکە هەزار دانەیەو نرخی دوو هەزارو پێنج سەد دینارە.

....................

## سێ لێکۆڵینەوەی مێژوویی

ئەم کتێبە لە نوسینی مێژونوسی گەورەو مەزن خوالێخۆشبوو «ساڵح قەفتانە»، کتێبەکە لە بنچینەدا ناوی (مێژوی گەلی کورد لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ)یە، بەڵام لە چاپی سێیەمی ساڵی ٢٠٠٥دا کە لەلایەن بەڕێز «فازیل هیمەت»وە چاپکراوەتەوە، ئەم وتارەی دیکەی نوسەری بۆ زیادکردووە (نەتەوەی کورد تورکمان نییە)، بەمەش کتێبەکە دەوڵەمەندتربووە، پاشان دەزگای سەردەم جارێکی دیکە لە چاپێکی جوانو نایابداو لەژێرناونیشانی (سێ لێکۆڵینەوەی مێژوویی) کتێبەکەی سەرلەنوێ چاپکردۆتەوە، بەڵام ئەمجارە وتارێکی وەرگێڕدراوی گرنگو بایەخداری مێژونوسی بەهرەمەند «ساڵح قەفتان» بۆ ئەم چاپە تازەیەی زیادکراوە، وتارەکەش باس لە سەرهەڵدانی شۆڕشی فەرەنسی ساڵی

١٧٨٩ دەكات. بە دانانی ئەم وتارە لەم چاپە تازەیەی كتێبەكەدا، بەهاو سەنگی كتێبەكە زیاترو بایەخدارتردەبێت. نوسەر لە ساڵی ١٩٣٩ ئەو وتارەی دەربارەی شۆڕشی فەرەنسی لە عەرەبییەوە بەشێوەیەكی جوانو ئاسان وەرگێڕاوەتە سەر زمانی كوردی. بایەخی وتارەكە لەوەدایە وەرگێڕ بابەتێكی وەرگێڕاوە كە زۆر بە كەمی، لەو سەردەمەدا، ئاوڕی لێدراوەتەوە.

لەڕاسیتدا سەرجەمی كتێبەكە پڕە لە بابەتو زانیاری زۆر گرنگ دەربارەی خودی مرۆڤو چۆنیەتی ژیانی لە بەرەبەیانی مێژووەوە تا رۆژگاری پێشكەوتن، لێوانلێوە لە زانیاری دەربارەی كوردو كوردستانو خاكو ئاووهەواكەی و چۆنیەتی پەیدابونی كورد لە كوردستانو تەواوی ئەو ناوچانەی كوردیان تێدا دەژی. ئەم كتێبە وەك بابەتێكی مێژوویی، یەكێك لە شاكارە گەورەكانی كتێبخانەی كوردی، یەكێكە لەو كتێبانەی دەكرێ لە قۆناغە جیاواز جیاوازەكانی خوێندندا، سودی لێوەربگیرێتو هەندێ بەشو بابەتی بكرێت بە پرۆگرامی خوێندن. ئەم كتێبە تەنها باس لە پەیدابونی كورد ناكات، بەڵكو لەپاڵ ئەوەشدا باس لە نەتەوە هەرە كۆنەكانی رۆژئاوای ئێرانو رۆژهەڵاتی عێراق دەكات، سۆمەریەكانو ئەكەدییەكانو عیلامەكانو... هتد. پاشان تاڕادەیەك بە درێژی باسی سەرهەڵدانو دروستبونی دەوڵەتی مادو لەناوچونی دەكات.




دواجار ئەم كتێبە یەكێكە لەو كتێبە دەگمەنانەی بواری مێژوو كە پێویستە هەموو ئەو لێكۆڵەرو مامۆستاو رۆشنبیرانەی لە بواری مێژودا كاردەكەنو حەزوئارەزوی مێژوویان هەیە، بیخوێننەوەو ئاگاداریبن، چونكە لەزەتێكی گەورە لە خوێندنەوەی دەبینو زانیارییەكی زۆر فراوانیان لەسەر سەردەمی كۆنو نەتەوەكانی ئەم ناوچەیە دەستدەكەوێت، دەكرێ ئەم كتێبە وەك سەرچاوەیەك بۆ نوسینی مێژوویی بەكاربهێنرێت.

كتێبەكە ٣٦٤ لاپەڕەی گەورەیە، تیراژی هەزار دانەیەو نرخی پێنج هەزار دینارە.

### خەونی نوسین

کتێبی خەونی نوسین یەکێکی دیکە لەو کتێبانەی شایەنی خوێندنەوەیە، بەتایبەتی بۆ ئەو بەڕێزانەی خولیای نوسینو هاتنەناو جیهانی کتێبیان هەیە، بۆ ئەو کەسانەی دەیانەوێ لە دەریای پانو بێ بنی نوسیندا، قەڵەمی خۆیان تاقیبکەنەوەو خۆیان بکەن بە مەلەوانێکی ئەو بوارە گرنگو مەزنەی مرۆڤایەتی، مەبەستمان بواری نوسینو خوێندنەوەیە . ئەم کتێبە بیروڕاو تێڕوانینی هەشت نوسەری مەزنو گەورەی هاوچەرخ، سەبارەت بە پرۆسەی نوسین دەخاتەڕوو. لەگەڵ خوێندنەوەی ئەم کتێبەدا ئاشنا دەبین بەوەی ئەو هەشت نوسەرە چۆنو بۆچی دەنوسنو سەرەتا چۆن دەستیان پێکردووەو دواتر چۆن گەشتونەتە ئەم ناووناوبانگەی ئێستایان. ئەو گرفتو حاڵەتە دەرونیانە چین لەکاتی نوسینی وتارو تێکستەکانیانداو لەکاتی چاوپێکەوتنو گفتوگۆکاندا، هاتونەتەبەردەمیانو چۆن مامەڵەیان لەگەڵداکردوون.

خوێندنەوەی ئەم کتێبە چێژێکی زۆر تایبەتی هەیەو هەموو خوێنەرێک دەتوانێ بیخوێنێتەوە کەم تا زۆر ئاشنای جیهانی پڕ جەنجاڵی نوسینو نوسەرەکان ببێت. خوێنەر لە سیاقی خوێندنەوەی ئەم کتێبەدا، بۆی دەردەکەوێت جیهانی نوسین ئەوەندە جیهانێکی ئاسانو سادە نییە، بەڵکو جیهانێکە پێویستی بە شەونخونیو ماندووبوونو سەبر هەیە، مرۆڤ هەر لەخۆیەوەو بە ئاسانی نابێتە ئاشنای جیهانی نوسینو نابێتە نوسەر، بەڵکو ئەوە پێویستی بە هەوڵو تێکۆشان هەیەو ماندوبونی زۆری دەوێت.

ئەم کتێبە لەلایەن بەڕێز «دڵشاد خۆشناو» لە فارسییەوە کراوە بە کوردیو بەڕێز «ڕەووف بێگەرد» پێداچونەوەی بۆ ئەنجامداوە. ژمارەی لاپەڕەکانی ٢٨١ لاپەڕەی قەبارە مامناوەندیە، تیراژەکەی هەزار دانەیەو نرخی سێ هەزارو پێنج سەد دینارە .



